کوردستان لە سەفەرنامەی بیانیدا - زنجیرەی ژمارە ٦

# سەفەرنامەی عەشیرەتی بەختیاری

ئەسغەر کەریمی

وەرگێڕانی

سەلاح نیساری





٢٠١٢





**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە** **کۆمەڵەی ئینسکلۆپیدیای کوردستان**

- **کوردستان لە سەفەرنامەی بیانیدا ـ (٦)**
- **سەفەرنامەی عەشیرەتی بەختیاری**
- ئەسغەر کەریمی
- وەرگێڕانی: سەلاح نیساری
- نەخشەسازی ناوەوە: **ڕێدار جەعفەر**
- بەرگ: هۆگر سدیق
- نرخ: (٤٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم: ٢٠١٣
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٧٨٨) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٤٨)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

## پێشەکی

ساڵی ١٣٤٩ی هەتاوی بوو، لەسەر پێشنیازی ناوەندی کۆمەڵناسیی ئێران، ڕایان سپاردم لە بەشی هاوکارییە گشتییە نێودەوڵەتییەکاندا، هاوڕێ لەگەڵ کۆمەڵناسی فەرەنسایی «ژان پییەر دیگار» بچینە ناوچەی بەختیارییەکان و لەسەر ئەم ئێل و عەشیرەتە خەریکی لێکۆڵینەوە بین. لەو سەفەرەدا سەرەڕای بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵناسی و نووسینەوەی ژیانی خەڵکی ئەم دەڤەرە، لەسەر هاندانی بەڕێز دیگار، کارمان بوو بە هەڵگرتنەوەی وێنە، تۆمارکردنی دەنگی خەڵك، کۆکردنەوەی نووسراوە و بەڵگەنامەی تایبەت، ئەوانە لە پاڵ ئەو کارانەدا بەڕێوە دەچون کە لە ڕۆژدا لە ئەستۆی ئێمە بوو. هەموو ڕۆژێ ڕووداوەکانمان یاداشت دەکرد و دەماننووسییەوە. ئەم ئەرکە لە دوایین سەفەرمدا، واتە لە ساڵی ١٣٥١ و ١٣٥٢دا، لەگەڵ دیگار هەر لەو ناوچەیە دووبارە بووەوە. دوای گەڕانەوەم لە دەڤەری بەختیاری، لەبەرئەوەی زۆرتر لەگەڵ کاروباری لێکۆڵینەوە سەروکارم هەبوو، لەپاڵ ئەویشدا بۆ تەواوکردنی خوێندن و تەواوکردنی بەشەکانی ئاکادیمی، ڕۆیشتم بۆ وڵاتی فەرەنسا. هەربۆیە ئەو شتانەی لە سەفەرەکەمدا نووسیبووم زۆر بە لامەوە گرینگ نەبوون! تاکو وای لێهات، لە دوای تێپەڕبوونی ١٢ ساڵ لە مانگی پووشپەڕی ١٣٦٤دا لەلایەن ناوەندی سەرژمێریی ئێرانەوە ئەرکی سەفەری ئەم ناوچەیەم کەوتەوە ئەستۆ. بۆ کۆکردنەوەی تۆمارێکی سەرژمێری لە عەشیرەتەکانی ئێران، هەر بەم هۆیەوە بڕیار درا، لەگەڵ گرووپێکی دەستەی سەرژمێری بچین بۆ دەڤەری بەختیارییەکان. گرووپەکە دوو ڕۆژ بەر لە من

وەڕێ کەوتبوون، منیش ڕێکەوتی ٦٤/٤/٥ گەیشتمە ئەسفەهان و لەوێوە چووم بۆ شاریکورد.

نێزیکەی ١٢ ساڵ لەوە پێش سەردانێکی ئەم ناوچەیەم کردبوو. لەچاو ئەو کاتی ئاڵوگۆڕێکی زۆر بەسەر وڵاتدا هاتبوو، ئەمەش بۆ من جێی سەرنج و تێڕامان بوو. لە ئەسفەهانەوە تا شاریکورد ٩٥ کیلۆمەتر بوو، لەچاو ساڵی ١٣٥٢ زۆر گۆڕابوو، هەتا کارخانەی بەرهەمهێنانی ئاسن ڕێگە ئوتووبان بوو (جووتساید) لەمەولا، هەمووی قیرتاوکراو. ڕێگەوبانێکی خۆش و ئاسوودە، هاوکارەکانی من گەیبوونە شوێنی مەبەست، منیش دەبوو دوانەکەوم بمێنم هەتاکو ترۆمبێلم بۆ پەیدا دەکەن. هەر ئەمەش بۆ من جێی سەرسووڕمان بوو، چونکە لەو ساڵانەدا، لە چلگرد» (کوهرەنگ) بەملاوە ڕێگەی وای نەبوو ماشێن هاتوچۆی پێدا بکات، ئەم دەرفەتەم قۆستەوە و خۆم گەیاندە شار، بۆ ئەوەی بزانم ئەو شاریکوردەی ١٢ ساڵ لەوە پێش من بینیبوم لەگەڵ ئەم شاریکوردەی ئێستە چەندە فەرقی کردووە.

شار تا بڵێی لەبەریەك ڕەوی بووەوە، بەشی ئیدارەکانی لە شانی باکوری شار هەڵکەوتبوو، باڵەخانەی چەند نهۆم، هەمووی بەخشت و کەرپووچی سپی داندرابوو. تەواوی بە شەقام و بڵواری جوان ڕازابووەوە، ڕووت دەکردە هەر لایەك هەمووی بڵوار و شەقامی پان و بەرین بوو. سەرەنجام دەگەینە شەقامە کۆنەکەی شار، ئێستەش هەر بەو سەر و بیچمەوە لە چەشنی حەزیای ڕەش خۆی ڕاکێشاوە، ئەدگاری شار ئەوە نییە چەند ساڵ پێشتر من دیتبووم، لە ساڵی ١٣٥٢دا وەختێ من لەوێ بووم، ئەو شارە بۆ بەختیارییەکان پڕ جموجووڵ بوو، شار لەبەر خەڵکی بەختیاری هەر جمەی دەهات، بە تایبەت ئەو سەردەمە، کاتێك چوومە نێوشار، کۆت و شەرواڵم لەبەردا بوو، لەنێو ئەو خەڵکەدا تەواو خۆم بە نامۆ دەزانی، یەك و دووم لێ نەکرد و چووم دەستێك جلوبەرگی بەختیاریم کڕی و لەبەرم کردن، ئەوانەش برێتی بوون لە، پاتۆڵێکی هەراو و کڵاوێکی لبادی و باڵاپۆشێك بە ناوی چۆخە. منیش بە بەرگ و لیباس تەواو بووم بە بەختیاری.

لەو ساڵانەدا، لە هەر دووکانێکدا سەکۆ و هەرزاڵێك هەبوو، هەردەم چەند کەس لەسەر ئەو سەکۆیانە دادەنیشتن و لەگەڵ کابرای دووکاندار، سەرقاڵی حیساب و بێنە و بستێنەی خۆیان دەبوون. بە هەر کوچە و کۆڵانێکدا تێدەپەڕی، هەر بەختیاری بوو

دەهات و دەچوو. لە ڕاستیدا ئەو شارە ناوەندی کڕین و فرۆشتنی پێداویستیی بەختیارییەکان بوو، تەواوی دووکانەکان ئەو کەلوپەلانەیان هەبوو کە ئەو خەڵکە پێویستیان پێی هەبوو، بەڵام ئەمڕۆکە، ئەو ڕەنگ و دەنگ و دیمەنە گۆڕاوە و، نەخشی ئەو تەونە کاڵ بووەتەوە. سەیری هەر دووکانێك دەکەی پڕە لە کەلوپەلی ئەلمۆدە و ئەشیای سەردەم بە بریقەوباقەوە، واتە ڕەنگ و ڕوخساری ژیار و شارنشینیی بە خۆوە گرتووە. هەر وەك ئەمڕۆ من لەو شارەدا خۆم بە نامۆ و غەوارە دەزانم، بەختیارییەکانیش ئێستە لە شاری خۆیاندا هەست بە غەریبی دەکەن! تاك و تەرا بەختیارییەك لە شاریکورددا دەبینی بە پاتۆڵی هەراوەوە، بە چۆخە و کڵاوی دەستکردی بەختیارییەوە، لەگەڵ جانتایەك بیرەوەری ڕۆژانی ڕابردوو.

لەسەر سەکۆ و بەر دەرگەی مزگەوتی ئەتابەکان و شەقامەکانی ئەو دەوروبەرە، هەتا ڕۆژێك بوو شوێنی پشوودانی بەختیاریگەل بوو. ئێستە بێزوو بە بەختیارییەك دەکات. پیاوێکی بەختیاریم پەیداکرد و کەگوتمە شوێنی، ب ۆئەوەی بزانم چی دەکات! خۆی کرد بە دووکانێکی دارتاشیدا، سەودای کۆمۆدێکی دووتایی کرد و کەوتە هزرەوە، ئەم کومۆدە لە ڕاستیدا بۆ ژیانی خێڵەکی بەکار نایات. ئەگەر وابێ یان کچی بە مێرد داوە، یان ژن بۆ کوڕی دێنێ، یان ئەوەی بۆ خۆی وازی لەهۆبە و هەوار هێناوە و بووەتە شارنشین. ئێستە وەختی ئەوەیە بەختیارییەکان بە ماڵەوە لە هەواربن و ئەم ڕۆژانەش کاتێکی باشە بۆ کڕینی پێداویستی و بژیوی خاووخێزان. ئەو چلگەردەی من دەمناسی، نەیدەتوانی وەڵامی ئەم گشتە ویستە بداتەوە. لە شاریکوردیش ئەوەی نایبینی خەڵکی ڕەسەنی بەختیارییە، کەوابوو بەختیارییەکان بۆ کوێ چوون و چیان بەسەر هاتووە؟ شەقامی کۆن و سەرەکیی شار، ـــ واتە شادەماری ئابووریی شارەکە ـــم لێکدا و سەروبنی گەڕام: ئەوەی دیتم تەنیا، کڵاشچنێك، تەپلەچییەك، هەلاجێك، کورتاندرووییەك، سێ دووکان، ئەوانە کەلوپەلی ئاژەڵدارییان دەفرۆشت و کەسێکیش خەریك بوو تەندوور و دەرخۆنەی ساز دەکرد، تەواو بڕایەوە! ئیتر تەواوی دووکانەکان، ببوونە دەرمانفرۆش و کەلوپەلی بیناسازی و فەرش و قاڵی و شتومەکی تازەباو. ئەمانەشیان لە شارەکانی دیکەوە هێنابوو، جێی کر و دەستکردی خۆماڵی گرتبووەوە. شاریکورد چی هەیە خەڵکەکەی بیفرۆشن و پێی بەڕێ بچن؟ لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا،

بەختیارییەکان باری ئابووریی ئەو شارەیان دابین دەکرد، ئێستە چییان هەیە؟ دەبێ بڵێم سەروبنی شارم لێکدا، تاوێك پیاسەم دەکرد و بەینێکیش بە تەکسی دەگەڕام، لەهەر کەسە و پرسیارێکم دەکرد، شتێکی ئەوتۆم وەدەست نەکەوت، جگە لەوەی بەشێك لەخەڵکەکە مووچەخۆری دەوڵەت و مابەقی بازاڕین، دەستەیەکیش ڕوویان کردووەتە وڵاتی « کۆیت » و لەوێ کار دەکەن و پارە دەنێرنەوە.

شار بە هەموو بارێکدا خۆی لەبەریەك کێشاوەتەوە. وەك مامری باش جووجەڵەیەکی زۆری لە بن باڵی خۆیدا کۆ کردووەتەوە، وردەوردە خەریکە دەبێتە شارێکی کارمەندنشین و مووچەخۆر. ئاخۆم ئەم شارە هەتا وەختێك بوو، مەنشوور بوو بە « دێکورد » بۆ خۆی خاوەنی داهات و بەروبووی خۆی بوو، ئێستە دەبێ چاو لە دەستی مووچەی دەوڵەت و مانگانەی کارمەندی بێ؟ بۆ دەبێ لەم شارەدا ناوەندێکی بەرهەمهێنەر نەبێ؟ مەگەر ناڵێن ناوچەی بەختیاری و کەهگیلۆیە و بویرئەحمەد وەك ناوەندێکی ئاژەڵداری هەڵبژێردراوە، بە کوێ گەیشت؟ ناکرێ لە شاریکورد کارخانەگەلێك دامەزرێنن، بەرهەمهێنەری کەلوپەلی ئاژەڵداری بێت؟ هەر وەك هەلاڵخانەی چەرم و پێستە و ڕستن و چنین، سەربڕخانەی ئاژەڵ و پەلەوەران و ناوەندێکی هەناردەیی گۆشتی لێ بێت، لەو ڕێگەیەوە ببێتە شوێنی داهات بۆ سەدان کرێکار و بەڕێوەبەر. بەرهەمهێنەر بێت و، ببێتە بەشێکی پڕداهات و دەوڵەمەند و ئاوەدانیی وڵاتەکەمان؟

ئەوانە و سەدان پرسیاری لەم چەشنە وەك هەنگ لەسەر شانەی مێشکم پوورەیان دابوو، خۆم گەیاندە ڕێکخراوەی پڕۆژە و گەڵاڵەکان، پێیان گوتم گرووپێك خەریکی کارکردنن لەسەر پڕۆژەیەکی گشتیی لە ناوچەکەدا. پرسیم: بەچ ئامانجێك؟ گوتیان: جارێ خەریکی لێکۆڵینەوە و بەدەستهێنانی زانیارین لە هەموو بەشەکاندا. لێکۆڵینەوە لەسەر، شار و گوند و ئێل و عەشیرەتان. گوتم: بیر و ڕاتان لەمەڕ عیلاتی و هەوارنشینان چییە؟ گوتیان: گرووپێکی گەڵاڵەداڕێژ، داهاتووی ئاژەڵدارانی هەوارنشین زۆر بە باشی نابینێ، خێڵەکیان خەریکن واز دەهێنن لە پیشەی باب و باپیرانیان. چارەیەکیش نییە، کۆسپ و لەمپەری زۆر لە گۆڕێدایە، ئێلاتیش حەز دەکەن، وەکو شارنشینان و شارەدێکان، خاوەنی هەموو مافێکی خۆیان بن لە لایەن حکوومەتەوە.

ئەوانیش دەیانەوێ بێبەش نەبن لە پرۆژەی بەشە خۆراکی گرووپی داهات و ئابووریی دەوڵەت، هەر وەکو تەواوی خەڵکی ئێران، ئەم ئەرکەش خەریکە سەر دەگرێت. ئەگەر زۆریش لەسەر کارەکانمان سوور بین، تەنیا دەتوانین کارێك بکەین خێڵەسات لەبەریەك هەڵنەوەشێن و تووشی گرفتی گەورە نەبین.

ئەی چۆن دەتوانین بۆ ئەم دەڤەرە پان و بەرینە ئاو و کارەبا ڕاکێشن و ڕێگەوبان و خوێندنگە و نەخۆشخانەیان بۆ دابین بکەین؟ خودا دەزانێ، بەشێك لەو هۆزە یەك دوو ساڵێکە، لە یەکجێ کۆ بوونەتەوە، زۆرتر لە جێی ڕەشماڵەکانی خۆیان خانووبەرەیان سازکردووە و خەریکی کشتوکاڵن، گەنم و جۆ دادەچێن و مەڕ و ماڵاتی خۆیان بەخێو دەکەن، ناوەندی ژینگەپارێز پێی ڕاگەیاندوون بۆ هەریەك هێکتار (١٠٠٠٠) جۆ، ٥٠٠ تمەن باج بدەن. هەر ئێستە لە باشووری ئێران نرخی یەك کیلۆجۆ ٦ تمەنە. کابرای بەختیاری کە خەریکی مەڕدارییە و لە شوێنێك نیشتەجێیە، وای لێکداوەتەوە، ئەگەر جۆیەکە بکرێ هەرزانتر تەواو دەبێ نەك ئەوەی جەریمە بکرێ. تەواوی ئەم گرفتانەم بینی و بیستم و لەبارەیانەوە بیرم کردەوە. هەتا ئەو ڕۆژەی بە سواری ماشێنێك خۆم گەیاندە چلگرد. ڕێگەکە قیرەتاو کرابوو وەك ئاوێنە بریقەی دەهات! مابەینی شاریکورد تا چلگرد لە ڕێگەی « فارسان»ـەوە ٨٥ کیلۆمەتر بوو، جاران کە دەچووین بۆ چلگرد، لە ڕێگەی مۆرغمەلەکەوە دەڕۆیشتین. خۆلاسە، دەگەینە یەکەم ئاوایی، سوورشجان، خانووبەرەی تازەمۆد، ئاسن و کۆنکرێت، بلۆك، دامەزراوەی ئیداری، زەوی و زاری پڕ پیت و بەرەکەت، هەتا چاو دەبینێ باخ و باخات. بەختیاری لە یەك شوێن نیشتەجێن. دەگەینە فارسان ٥٥ کیلۆمەتری ماوە بۆ چلگرد، شۆفێرەکە دەڵێ: ئێرە بۆ بەختیارییەکان بووەتە شارێکی پڕ داهات، تەواوی هەوارچییان ڕوو دەکەنە ئێرە و پێداویستیی خۆیان لێرە دەکڕن، هەتا ئەم شارە هەبێ کەس ڕوو ناکاتە شاریکورد. لێی دەپرسم: ئەو گشتە بیناسازی و سمیت و کۆنکرێتە، ئەو هەموو لۆری و ترێلی و ئۆتۆمبێلی بارهەڵگەرە، تایبەت بە بەشی ڕاگواستن، هەر وەك ماشێنی بارهەڵگر، ترێلی و زۆر شتی دیکەش هی کێیە و پووڵ و پارەی ئەمانەیان لە کوێ هێناوە؟ شۆفێری ماشێنەکە و هەر کەسێکی دیکە قسەمان لەگەڵ دەکرد، گەورە و چکۆلە، باس باسی «کویت» بوو! هەر کەسێك دەبینی چووەتە کویت، یان شێخنشینەکانی ئەوبەری

ئاو، پارەیەکی زۆری لەگەڵ خۆی هێناوەتەوە و سیمای شاری گۆڕیوە و ناوچەکە بەم پووڵ و پارەیە ئاوەدان بووەتەوە. بەتایبەت لە بارەی فەرهەنگییشەوە زۆریان تەرەقی پێداوە، بگرە ئەوان گوێ بەکارخانە و بەشە بەرهەمهێنەکان نادەن، زیاتر سەرقاڵی سازکردنی بیناسازی و ئاوەدانکردنەوەی شارەکانن، خەریکی کڕین و فرۆشتنی تۆرومبێلن.

لێرە بەملاوە، بە باوەڕی خۆم باری ئابووری تازە و سەردەم سەرنجم ڕادەکێشێ، کە جاران هەر نەبوو. «هەنگداری بە شێوازی سەردەم، لە کەندووی تایبەت و ڕێکوپێکدا، شوێنی مەبەستی ئێمە ناوچەی بازفت»بوو لە پشت کێوەزەردەوە» پێم وا نەبوو بتوانین بە سواری ماشێن بچین بۆ بازفت. پێنج کیلۆمەترمان مابوو بۆ چلگرد بە دەستە چەپدا لە ڕێگەی سەرەکیی لامان دا. هەرچەندە ڕێگە زیخڕێژ کرابوو، بەڵام تەواو ئەندازیار بوو. ڕێگەی ناوچەی«بیرگون»مان گرتەبەر، چەند ساڵ لەوەپێش بە سواری چارەوێ بەو شوێنەدا ڕۆیشتبووم. لەو ساڵانەی ڕابردوودا وەختێ بەم ناوچەیەدا تێدەپەڕی، بە غەیری خێوەت و ڕەشماڵی ڕەوەندان هیچی دیکەت نەدەبینی. نە خانوویەك هەبوو نە باڵەخانەیەك، هەڵبەت جگە لەگوندەکاتنی «شەهریاری»، «یاوەرئاوا» و «شاعەبدولعەزیم» ئەوانەش سەرلەبەر لە قوڕوخشتی کاڵ ساز کرابوون، لاڕووخاو و خێچوخوار، بەڵام ئەمساڵ، کە دەگەینە یەکەم ئاوایی ناوچەی بیرگون، هەموو شتێك سەرنجمان ڕادەکێشێ، خانووبەرەی بەرز و نزم و جوان، تەواوی بە خشتی سوور، بەردی مەڕمەڕ، ئاسن و سمیت، دەرگە و پەنجەرەی ئاسن، جام و ئاوێنەبەندی خۆشدیمەن، بەڵام ئێستەش سووتەمەنی ئەو دەڤەرە کەمرە و تەپاڵەیە، لەگەڵ گوێنی.

تەواوی ئەو ناوچەیە شارەزام، زۆرجار بە سواری ئەسپ بەم نێوەدا تێپەڕیوم، تەواوی ئەم هەوراز و نشێوانە، کەلی «چڕی» لە کێوەزەرد، گوێنی داپۆشیوە. ئەوکاتی وەك بەرهەمێکی پڕداهات کەڵکیان لێوەردەگرت، واتە کەتیرەگرتن، کۆمەڵێك خێوەت لەو لاترەوە سەرنجم ڕادەکێشن، لە دوورەوە هەر لە گوندێکی چەند ماڵی دەچن، ئەوانیش وردە وردە خەریکن تاق دەبنەوە و هەرچەند ماڵ لە شوێنێك چادر هەڵدەدەن. ئەم هۆزانەش خەریکن لەنەریتی خۆیان لادەدەن. هەرکەسە و لە شوێنێك خەریکی خانووسازکردنە بۆخۆی. ئێستەکە ڕێگەوبانیان بۆ کێشراوە ئیتر دەستیان بە هەموو شت

ڕادەگا، دایرەکانی بەشی ئاوەدانکردنەوەی دەوڵەتی زۆر باش پێیان ڕادەگەن، خزمەتی عەشایرەکان دەکەن. هەموو پێداویستییەك بە ئاسانی دەگاتە بەردەستیان، بارودۆخی گوزەرانیان تەواو گۆڕاوە و تازە نایانەوێ لە ژیانی دژوار و پڕ لە زەحمەتدا بژین.

نێزیکتر بووینەوە، وا دیارە ئەو ناوچەیەم پێشتر بینیوە. شارەزای زۆر شوێنم، وەبیرم هاتەوە ئێرە ناوچەی «بامدی»ـــەکانە و هەوارگەی فەرامەرز مەحموودی دەبێ لەو نێزیکانە بێ. لەوێ دابەزین، کە گوتمە سەروسۆراخی ئەو پیاوە، خێوەتەکەی لە تەنیشت ڕێگەکە بوو! بۆ من جێی سەرسووڕمان بوو. ساڵی ١٣٤٩ نێزیکەی ڕۆژ و دانێك بە وڵاغەبەرزە هاتین جا گەیشتینە ئێرە، هەرچۆنێك بێ، ئەو هەلەم بە باش زانی و چووم بۆ لایان. زۆریش خۆشحاڵ بوون و پێشوازیی باشیان لێکردم. کاوڕێکیان لەبەر پێمدا کوشتەوە و کەوتینەوە یادی جاران، لەسەر هۆزی "بابادی" هەندێ ئاگەداریم دەست کەوت، نانی نیوەڕۆمان خوارد و وەڕێ کەوتین.

بە تەما نیم سەفەرنامەی ئەم جارەم بنووسمەوە، دەمەوێ هۆی چاپی ئەم سەفەرنامەیەم باس بکەم، کەوابێ بە کورتی، ڕێگەکە تا ئاوایی «مەوەرز» زۆرباش بوو. تەواو کاریان لەسەر کردبوو، لە چەند جێیەك پرد و ئاوەڕۆکانی کاریان مابوو. ئیتر بەگشتیی لە سەفەری ئەو مانگەدا بە سواری ترۆمبێل تەواوی ناوچەکانی عەشیرەتی بەختیاریم بەسەر کردەوە، سەردانی تەواوی ماڵ و ڕەشماڵەکانم کرد، جارانیش ئەم کارە نەدەکرا، لەو دەڤەرەدا لە پاش «دێناش» لە ئاوایی «تەلورد» ناوەندێکی تەلەفۆن و ڕاگەیاندنیان دامەزراندبوو، ئەویش کوڕێژگەیەکی ١٥ یا ١٦ساڵانە سەرپەرشتیی دەکرد. منیش هەر لە ڕێگەی ئەم هێڵەوە پێوەندیم بە تاران و گورگانەوە کرد و سەرجەم ٢٨ تمەنم پارە پێدا. ئەم هۆزە بە تەواوی تێکەڵ بە ناوەندە هاوبەشەکانی گشتیی بوون، بەشی عەشیرەتی، خزمەتگوزاری ڕێگە و بان، دایەرەی کشتوکاڵی پارێزگە، کەسێك لەو خێڵەکییانە دەیگوت: زۆرینەی زۆری عەشایر لە دەوروبەری مزگەوتی سێلمان نیشتەجێ بوون. وەختی فۆڕمی سەرژمێریمان پڕ کردەوە تەواو قسەی کابرا ڕاست بوو.

ئێستەش لەوپێش بارەدا ناتوانم تەواوی بویەرەکانی سەفەری ئەم یەك مانگە، بنووسمەوە. حەزدەکەم هەرنەبێ ئاماژە بە چەند خاڵێك بکەم کە لەگەڵ ناوەرۆکی ئەم کتێبە وەختێ پێکی دەگرن دڕدۆنگی پەیدا نەکەن، ١٣٦٤/٤/١٧ لە تیرەی «ئەحەد

ممالی» هۆزی بابادی، «خوێن بەستێك» سەری گرتبوو، نرخی خوێنبایی ٤٠٠ هەزار تمەن پووڵی نەخت، ٧٠ مەن زەوی داچەندراو لەسەر ڕێگەی گەرمەسێر (دێم) ٣٠ مەن زەوی داچەندراوی بەراو، لەگەڵ کچێك. هەڵبەت ئەم خاڵە ڕادەگرم بۆ خوێنەران با خۆیان داکۆکیی لەسەر بکەن. هەردوو تایەفەکە خێڵەکین، ژیانی هەردوولا لەسەر ئاژەڵداری دەگوزەرا، داکوژانی ئەم خوێنە جگە لە پارەی نەغد دەبوو مەڕ و بزن بێ. دەبێ خوێنبایی بەرانبەر بێ لەگەڵ عورف و نەریتی ئێلاتی و داهاتی ئەو کەسانە. لە گوندی «عەلیاوای زەڕین» لە نێوان شاریکورد و چلگرد، هەموویان لە تایەفەی «گلە» و بەرەی خواجەن. لە پووشپەڕی ١٣٦٤، ١٤٤ ماڵ هەبوون، ٣٥یان لەو ٦ ساڵەی ڕابردوودا ساز کراون. ١٣ ساڵ لەوە پێش تەنیا خانوو هەبوو. لە پووشپەڕی ١٣٦٤ هەقەبەراتی شوان و گاوان بەم قەرارەی خوارەوە بوو: بۆ هەر سەرێك مەڕ ٥٠٠ تەمەن بۆ ساڵێك، لەگەڵ کاوڕەنێرێك لە ٥ کاوڕ، خورییەك لە ٥ خوری بڕدراوە بۆ ٢٠٠ سەر مەڕ، ٢٨٠٠ تمەن بەراتی شوان. مەڕدارێکی «چاڵشتەر»ی دەیگوت: بۆ هەر ٣٥٠ تا ٤٠٠ سەر مەڕ شوانێك دەگرێ و ساڵێ ٥ شوان دەگرێت. ئەو مەڕدارە دەیگوت: ٣٢ مەڕداری چالشتەری ئیجازەنامەی لەوەڕگەیان هەیە لە لەوەڕگەی بەختیارییەکاندا، ژمارەی مەڕی ئەم ٣٢ ڕەوەندە، تەواو بە قەت نیوەی ئەو مەڕەیە کە هەموو عەشایری بەختیاری هەیانە. دەیگوت: ئێستە دەبێ ژمارەی مەڕدارەکانی شاریکوردیشت هەبێ. هەڵبەت مەبەستی ئەوە بوو مەڕدارە گەورەکان باشترن لە عەشایر بۆ ئاژەڵداری لە وڵاتەکەدا. واتە لە باتیی ئەوەی ئەم هەموو خەڵکە وەك عەشایر لەگەڵ مەڕ و ماڵات بچنە لەوەڕگەکان، ئەم گشتە زەرەد و زیانەیان هەبێ بۆ لەوەڕگە و لەناوچونی زەوی و زار و سووتاندنی گژوگیا، لەبەرئەوەی لە گەرمەسێرەکان لەوەڕ زوو تەواو دەبێ، ناچارن زووتر لە کاتی خۆی بچنە زۆزانێ، بەر لەوەی گیاوگژ بە تەواوی سەرپێوە بنێ و گوڵ و سەوزە بخەملێ، ڕان دەمی تێدەنێ و سەری هەڵدەپچڕێ و بۆژۆی دەکات. زەوی و زار لەژێر پێ و سمی مەڕوماڵات بکوترێ و بڕووتێتەوە، باشتر ئەوەیە ئاژەڵدارانی گەورە ماڵ، بە شێوەی سەردەمیانە و سیستماتیك، کەڵك لەو زەوی و زار و لەوەڕگەنە وەربگەرن و ئەوانەی مەڕیان کەمترە لە شوێنی خۆیان بێبەش نەبن. ئێستەش قڕە و هەرایەکی زۆر لەنێو مەڕدارە گەورەکانی جودا لە عەشایری مەڕداردا هەیە. هەر

مەڕدارێکی گەورەی چاشتەری لە ساڵدا ٥ شوان دەگرێ بۆ لەوەڕاندنی مەڕەکەی، ئەمەش بۆماوەی ساڵێکە و لە ساڵی تازەدا دەیانگۆڕێ. شوانەش داوای هەرچی بکات دەیدەنێ و لە ساڵدا بەراتەکەی زیاد دەکات. ئاژەڵدارانی بەختیاری بەو شێوەیە ناتوانن بەرات بدەن، هەر بۆیە شوانەکانیش خزمەتی ئەوان ناکەن. مەڕ بەبێ شوان دەمێنێتەوە و ناچار دەبن ڕانەکە بە سەربڕخانە بسپێرن، هەر بۆیە جێگە و ڕێگەی مەڕدارانی مەزن لە دەرەوەی ئێل بەرفرەوانتر دەبێتەوە. مەڕدارێکی بەختیاری سکاڵای هەبوو: ئاژەڵدارانی ئێل، شوانەکانی ئەم ناوچەیە بەدخوو دەکەن! دەیگوت: شوانێك بۆ لەوەڕاندنی ١٥٠ سەرمەڕ بۆ ٦ مانگ داوای ئەوەندەی بەرات کردووە: ١٥ هەزار تمەن پووڵ، بەرگ و پێڵاو، بژیو، جگەرە، قەند و چایی، چراقەوە، باتری و ڕادیۆ. بەختیارییە مەڕدارەکان ئاهونالەیان بوو: ئەوە ١٢ ساڵە هیچ مەڕێك دوانەی نابێ، لە سەد سەر مەڕ بیست سەریان وشك دەکەن. دیسان دەیگوت: لەناوچەکە نەخۆشییەك سەری هەڵداوە گژوگیا هەمووی دەپەڕێ و لەوەڕگە وشك دەبێ! بۆ دەرمانیش برنجەسوورە و کەرەوز و دانەوێڵە ەست ناکەوێ. ئەوەی هەیە و نییە تەنیا گوێنییە و هیچی دیکە. ئەویش تەنکەی تێکەوتووە و چ بەهرەیەکی نییە، زۆر کەس لە هۆزی دێناش دەیانگوت: بۆ١٥٠ سەر مەڕ دەبێ ١١ هەزار تمەن هەقی لەوەڕ بدەن، بابەتی ٤٠ مەن کا، ١٠٠٠ تمەنەپارەیە، کیلۆیەك جۆ، ٦ تمەنە، هەر بۆیە لە ١٥٠ ماڵی دێناشی نێزیك شەهریاری و یاوەراوا، ١٢٧ ماڵ لە شوێنێك کۆ بوونەتەوە، تەنیا ٢٣ ماڵ لە ساڵی ٦٤ی هەتاویدا، گەرمێن و کوێستانیان کردووە.

جا بۆیە، زۆر هۆکار هەیە کەوا ئەو ڕەوەندانەی هەمیشە لە جێیەك نیشتەجێن، بەملاوئەولادا بڕۆن.

لەساڵی ١٣٠٢ی هەتاویدا میرزا ڕەزاخان مهەندیسلملك لە جوگرافیای ئێراندا دەورەی عالی، «چاپی یەکەم تاران، ١٣٤١، لاپەرەی ٧٨ کۆی ڕەوەندەکاتنی ئێران، نێزیکەی ٢٢./. سەرژمێری کراون، «١٤/٣٢٢/٠٠٠، جەماوەری گشتی و ٣/١٣٨/٢٣٠ کەس خێوەتنشینن» ، ئەمرۆکەش سەرژمێریی سەرەتایی ناوەندی ژمێریاریی ئێران لە ساڵی ١٣٦٤دا، کۆی ڕەوەندانی ئێرانی یەك ملیۆن کەس مەزندە دەکەن. لە کۆی ٤٤ ملیۆن نفووسی ئێستەی ئێران. ئەم ڕێژەیە لە بەرانبەر کۆی

جەماوەردا نێزیکەی ٢/٢.٪ـــە، واتە نیشتەجێبوون لە ساڵی ٦٢ی هەتاویدا ٢٠.٪ بووە، هەروەك دەر دەکەوێ، ئەم جووڵانەوەیە لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا سەری گرتووە.

ڕەنگبێ ڕۆژێك هەموو بگەنە ئەم قەناعەتە، هەر پێویست نەبێ ئێلاتی گۆشتی وڵات دابین بکەن! بگرە خێڵەسات باشترین شتە بۆ دابینکردنی پێویستیی وڵات گرینگ نییە زۆریەك لە خەڵکی ئەم وڵاتە بە ئێل و عەشیرەتەوە بە شێوەی خێڵەکی بژین و لە هەموو پێداویستییەکانی ئەو سەردەمە وەك، قوتابخانە، بنکەی تەندروستی و زۆر شتی دیکەش بێبەش بن. هەر بۆ ئەوەی ئەوانە گۆشتی وڵاتەکە دابین دەکەن. ڕەوەندی، بەبێ ئەوەی تەواوی خاو و خێزان کات و ساتیان ببێتە مەڕداری تەنیا بە چەند کەسی شارەزا بەڕێوە دەچێ، مابەقی خێزانەکە دەتوانن بە کاروباری دیکەوە سەرقاڵ بن.

تەواوی ئەو قسەوباسانە بوونە هۆی ئەوە کاتێك گەڕامەوە بۆ تاران، بچمەوە سەر نووسراوەی سەفەرنامەکانی ساڵی ١٣٤٩ تا ١٣٥٢. ئامانجی من ئەوەبوو، بۆ ئاگەداری کۆڵەران و خەڵکەکە و بەرنامەڕێژانی وڵات، بۆ سیایی و پێکگرتنی ئەم چەند ساڵە بیکەم بە کۆپەڕێك و لەچاپی بدەم. هەربۆیە بەبێ ئەوەی دەستی تێوەربدەم هەوڵمدا بۆ لەچاپدانی و ئەوەی لەو کات و وەختانەدا هەبووە و لەگەڵ ئاڵوگۆڕیەکانی ئێستەدا بکەوێتە بەر دیدەی خوێنەران.

**ئەسغەر کەریمی. تاران ١٥ خاکەلێوەی ١٩٨٦ی ز/ ١٣٦٥ی هەتاوی**

**لەگەڵ مرۆڤی ژیر و زانادا بە ئازارەوە بمری، نەك لەگەڵ گەمژە و ئاوەزقەتیسان بەئاسوودەیی بژی. (نیساری)**

## سەفەرنامەی عەشیرەتی بەختیاری

## شەمە ٣ی جۆزەردانی ١٣٤٩ی هەتاوی ١٩٧٠ی ز

لەگەڵ هاوڕێکەم «ژان پییەر دیگار» کۆمەڵناسی فەرەنسی لە شاریکوردەوە بە سواری پیکابێك، کە زۆرتر بارهەڵگربوو نەك مسافیربەر، دەچووین بۆ ئاوایی «چلگرد»، واتە شارەدێی ناوچەی کوهڕەنگ. بە هۆی ئەوەی من تارانی بووم و دیگاریش میوان بوو، ئێمەیان لە پێشەوە سوار کرد. خەڵکەکەش هەرچەندە زووتر لە ئێمە لە گاراژ مەحتەل بوون و بەقەی ئێمەشیان کرێ دابوو، لە پاشکۆی ترۆمبێلەکەوە سوار بوون.

ڕێگە تا بڵێی ناخۆش و پێچەڵاوپلووچ بوو، قوڵکەقوڵکە و شوێنی مەترسیدار، ئەم ڕێگەیە لە ڕابردوودا ڕێگەی بارەبەر و مەڕ و ماڵات بوو، ئێستە نەختێ هەراو کراوەتەوە و ماشێن پێیدا دەڕوا، «جا ئێوە بە هەستی خۆتان بزانن دەبێ چی بێ».

هەر لە شاریکورد، لەگەڵ «ژان پییەر» هەر کەسە و بۆ خۆمان، جلوبەرگی بەختیاریمان کڕیبوو، کڵاوێکی لبادی، چۆخەیەکی خەت پان لەگەڵ جووتێك کڵاشی ئەو ناوچەیە. هاوڕێکەم پێشتر سەردانی ئەم ئێلەی کردبوو، ئەو پانتۆڵی هەراوی لووڕی هەبوو، قەول وابوو منیش لە چلگرد، پاتۆڵێك بکڕم. چۆخەکان دانەی ١٨٠ تمەن پارەمان بۆ ژماردن، کڵاوی باشمان کڕی و دانەی ٣٠ تمەنمان پێدا، کڵاشی بنتەختیش جووتی ٧٥ تمەن، مووچەی کەم و بەختیاریبوونیش بۆ ئێمە ئاوا گران تەواو بوو.

ڕێگەکە لە ڕێگەی «مۆرغمەلەك»ـــەوە دەچووە چلگرد، لە مۆرغمەلەك نان و ماست و چایەکمان خوارد، نەختێ پشوومان دا. هەڵبەت نەك هەر ئێمە، ئەو کەسانەی لە

دواوه سوار ببوون و تەپووتۆزێکی زۆریان بەسەردا چووبوو، لە دوای ئەم هەڵبەزدابەزە. لە بەشی خوارەوە، شیو و دۆڵێکی سەوز و بەرفرەوان بوو. ڕووبارێکی کەم ئاویش بەم شیوەدا سەری نابووەوە. ئەم لەوەڕگە خۆشەش باوەشی کردبووەوە بۆ ئەسپ و هێستر و گوێرێژ و گا و چێڵ، بە کەیفی خۆیان دەمیان لە لەوەڕی تەڕ و تازە نابوو. کاکی شۆفێر گازی کرد، مسافیر سوار ببنەوە، بەختیاریگەلیش بەبێ خۆخافلاندن، ژن و پیاو سوار بوون و هەر کەسە و جێی خۆی گرتەوە. ئێمەش سەیرمان دەکردن، بەڵێ ئێمە پیشەمان کۆمەڵناسییە، سەرنجمان دەدایە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی ئەو خەڵکە، لە یەکەم دەستبەکاربووغاندا، ئێمە تازە هاتووینەتە نێو بەختیارییەکانەوە. تەواویان بە ناو یەکدیان دەناسی، شۆفێرەکەش هەروا، لەگەڵ زۆریان جەفەنگی لێ دەدا، دەستووری بە یەك دوانێکیان دەدا. ڕێزی لە دوو سێیەکیش دەگرت، لەبەرئەوەی مووسافیری شاری و بیانی لەگەڵ بوو، شەرمەندە بوو لەوەی ئەوان لە پێشەوە سوار بکات.

دیسان وەڕێ کەوتینەوە، دووچۆمانێك لەسەر ڕێگەمان بوو بەبێ پردی پەڕینەوە. ترسی ئەوەشمان هەبوو پیکابەکە لە ئاودا بکوژێتەوە، تەراکتۆرێك وەك دێوی ئەفسانان لە تەنیشت ڕێگەکە لە بۆسەدا بوو، هەر ماشێنێك لە ئاودا بمێنێتەوە پەتی بکات و ڕای بکێشێ و پوولی لێ وەربگرێ. وەبالی ئەم قسەیەش بەئەستۆی گوتیار! دەیانگوت: هەر ئەو تەراکتۆرە شەوانە بواری ئاوەکە قوولْ دەکات بۆ ئەوەی بەیانی ماشێنی تێ بکەوێ. لە دوورەوە سەر و پۆتراکی چلگرد و دالانەئاوی کوهرەنگ دەرکەوت، لەسەر ئاماژەی دیگار، کاکی شۆفێر ئێمەی هەتا ئەوسەری مالانی ئاوایی «فانیاوا» گەیاند. ئێرە کۆتایی ڕێگەی ماشێن بوو، دەبوو لەمەولا بە سواری چارەوێ یان بە پێیان بەرەو شوێنی مەبەست وەڕێ بکەوین. فانیاوا لە داوێنی چیا و ئێمەش باسکەوباسك ڕوو بە بەرزی هەڵدەگەڕێین. بار و جانتامان لە ماشێن دابەزاند و ماڵئاوایمان لە مووسافیرەکان خواست، ترۆمبێلەکە گەڕایەوە و ئەو دوو کەسەشمان بەجێ مابن، بە دەستهەڵتەکاندنەوە گازمان کرد، بۆ ئەوەی ئەوانەی لە داوێنێ بوون بمانبینن، ئەوە یەکەم جار بوو من هاتبوومە ئەم ناوچەیە، بۆ خەڵکی ئەم دەڤەرە ناسراو نەبووم، بەڵام دیگار، بە هۆی ئەوەی پێشتر هاتبووە ئێرە شارەزا بوو. ئەو بەقامکی ئاماژە، داوێنی ئەو کێوەی نیشان دام کەوا ڕەشماڵەکان لەو شوێنەدا نیشتەجێ بوون. لە دوورەوە بە ئاستەم هەستت

پێدەکرد. لەنێو ڕەشماڵەکاندا دوو خێوەتی سپی دەبیندران، هەر چۆنێك بوو، دەبوو بگەینە ئەو ڕەشماڵانە، سەیرێکی باروبنەی خۆمان کرد و لە بەرزایی و شوێنی مەبەست ڕامایین. دیگار بە زەردەخەندێکەوە پێی گوتم لەکن کەلوپەلەکان وەمێنم، خۆیشی سەربەرەوخوار داگەڕا. دوای ماوەیەکی کەم لەگەڵ چەند کەسی بەختیاری گەڕایەوە بۆ لام. نەختێك تەماشای منیان کرد و بە نیشانەی سڵاوکردن سەرێکیان بۆ لەقاندم، بەڵام وەك ئەوەی چاوەڕوانیم لێیان هەبوو وەریان نەگرتم. نەمزانی هۆی چی بوو، ڕەنگە دواتر بۆم ڕوون ببێتەوە! لەگەڵ یەکدی نەختێك قسەیان کرد، نەیاندەزانی من بۆ سەرێ بەرن یان بۆ خوارێ. هەر لەو قسانەدا بوون ساك و جانتایان دا بە شاندا و سەرەوخوار داگەڕان، منیش وەدوویان کەگوتم. یەکیان تیرەگەشانی گرتەبەر، بۆ ئەوەی زوو بچێ هەواڵی هاتنی ئێمە بەرێت بۆ «جەعفەرقوولی ڕۆستەمی» بزانێ ئەمر و فەرمانی ئەو چییە، پێشتر دەمزانی ئەو جەعفەرقوولییە کەسێکی دەمڕاست و پیاوماقووڵی ناوچەکەیە لە هۆزی بابادی. گەیشتینە نێودێ و بە دەروازەیەکی گەورەدا خزاینە کۆشی حەسارێك. کەلوپەلمان لەبەر هەیوانێ دانا، دەرگەی وەتاخ زاری داپچڕی و چووینە ژوورێ. خولکیان کردین وەلای سەرێ بکەوین، ڕووبەڕووی دەرگە دانیشتین، دوو بالیفیان بۆ هێنایین پاڵی پێوە بدەین. زۆر بە حورمەتەوە ڕازی بووین و هاوڕێکانیش ڕووبەڕوومان دانیشتن، زۆریان بەخێر هاتن کردین، یەکێك لەو کەسانە دەستووری دا خەڵووز و مەنقەڵی ئامادە بکەن، زۆری پێنەچوو چایی هاتەگۆڕێ، من متەقم دەرنەدەهات و دیگاریش، هەواڵی ئەوکەسانەی دەپرسی کە دەیناسین و لەوێ نەبوون. ئەوانیش بە پێکەنینەوە وەڵامی دیگاریان دەدایەوە و زۆریان پێ سەیر بوو، چۆن ئەم کابرا بیانییە فارسی و لووڕی دەزانێ! بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە، جاری پێشوو، وەختێ دیگار هاتووەتە ئەم ناوچەیە، چەندە بە غارەئەسپ کەیفی ساز بووە، بە هەورازەکاندا وەسەر کەوتووە، زۆر لە مار ترساوە. چایی ئامادە بوو، بۆ ئێمەی میوان تەنیا دوو ئیستیکان هەبوو، ئاوی گەرمیان تێوەردان و چایان لە بەردەم داناین، تەواو ماندوومان حەسایەوە. هەر خێرا دوو چایی دیکەشیان بۆ تێکردینەوە، ئەمجار هەر بەم ئیستیکانانە، نۆرە گەیشتە خۆیان، بازاڕی قسەوباس گەرم بوو، بەڵام هەواڵێك لە جەعفەرقوولی نەبوو. هەموویان زۆریان حەز دەکرد بزانن من کێم، لەبەرئەوەی میوانی جەعفەرقوولی بووم، کەس ئەم

ئیزنەی بەخۆی نەدەدا لێو ببزێوێ. خۆم پێم وتن، کێم و چ کەسم، خەریکی چ کارێکم و لە کوێوە هاتووم و لەبەرچی لێرەم. ئینجا دڵیان حەسایەوە و زۆریان بەخێرهاتن کردم. ڕوویان لەگەڵ خۆش کردم و زۆریش گەرموگوڕ بوون. باسی زستانی سخت و بەفری زۆریان بۆ کردین، کە دەرگەوکۆڵان گیراوە و بەفر گەیوەتە بینەقاقایماڵەکان. مانگێکی تەواو کەس نەیتوانیوە ماڵەوماڵ بکات، لەم ژوورەدا حەوت سەر خێزان لەبەر تینی ئەم سۆبایە ژیواریان کردووە. سەیرێکی سۆباکەم کرد، قۆڵی سۆباکە بە شانی دیوارەکەدا چووبووە دەرێ، سۆبا، زۆر کەڵەگەت بوو، پڕیان دەکرد لە داری قەڵەشکار.

بیرم ڕۆیی بۆ لای لێڕ و دارستان، ئەم دەڤەرە ڕووتەنە، کەمرە و تەپاڵەی ئەم گوندەش ئەوەندە نییە ئەو خەڵکە لە سەرمای تووشی زستان بپارێزێ. هزرم کردەوە ئەو ناوچەیە چی زۆرە گوێنی، نەمدەزانی خەمی گوێنییەکان بخۆم یان ئەو خەڵکە لە سەرمای درێژی زستاندا. ئەم بەختیارییە هەژارانە هیچی دیکەیان شك نەدەبرد. بۆ ئەوەی ڕەق هەڵنەیەن، چارەیەکی دیکەیان نەبوو. نەدەکرا پرسیاربکەم، ئەو خەڵکە لە خۆم بتارێنم، تەنانەت باش هەر ئەوە بوو هاوبەشی خەمەکانیان بم، نەك ئەوەی جێگە بە خۆم لێژ بکەم. دەمزانی من وەك، ژینگەپارێزێك، یان بەرژەوەندخوازێکی گشتی، یان ڕاسپاردەی لەشساخی و تەندروستی ناوچەکە نەهاتوومە ئێرە. بگرە وەك کۆمەڵناسێك ڕێم کەوتووەتە ئەم ناوچەیە تا لێکۆڵینەوە بکەم لەسەر داب و نەریت و هەڵسوکەوتی ئەو خەڵکە بە گشتی، لەمەڕ کۆمەڵایەتی، ئابووری، ژن و ژنخوازی و... تێکەڵبوونی خەڵك لەگەڵ سرووشت و ژینگە، قازانج و پێداویستییەکانی ڕۆژانە، سەر بە هەموو کەلێن و کولێنێکدا بکەم و ژیان و نەریتی ئەو خەڵکە وەخوێنم. بچمە بنج و بناوانی شتەشاراوەکان، ئەگەر کلتوور و نەریتەکان کاڵ بوونەتەوە، چ یاسا و ڕێسایەك شوێنی ئەوانی گرتووەتەوە؟ ڕەوتی دامەزراوی جەماوەر لەسەر چ تەوەرەیەك دەسووڕێ؟ کەوابوو بۆ ئەوەی بەڕێکوپێکی بە ڕەهەندەکانیدا تێپەڕ بم، باشترین کار ئەوە بوو، گوێگرێکی باش بم و بە ڕاڤەکردنێکی باش توێکڵ بشکێنم و لە کاکڵ بگەڕێم. هەر بۆیە دەڵێن: سەرەکیترین کاری کۆمەڵناسی، دۆزین و خوێندنەوەی کلتوور و فەرهەنگی جەماوەرە.

سا هەرچۆنێك بوو، لەسەر ئەرکی خۆم سوور بووم و بە بیر و باوەڕێکی خستەوە گەڕامەوە بۆ نێو بەختیارییەکان. بەختیاری وەختێ زانیان ئێمە لێرەین، خێزەرەیان کرد

و وەك هەنگ لە دەورەمان پوورەیاندا، ژوورەکە تەنیا دەرگەیەکی تێدا بوو، ئەویش بۆ هاتوچۆ و ڕووناکی دیوەکە. ئەوەش بۆ ئەو ناوچەیە زۆر ئاسایی بوو. کێ دەیتوانی لە سەرمای زستاندا، کەلەبەر بە دەرگەبدات، یان زار بە پەنجەرە دابپچڕێت.

وەختێ بەختیارییەك دەهاتە ژووریٚ تەنیا دەنگت دەبیست. بەری ڕووناکی دەگرت و نەتدەزانی ئەوەی هاتە ژووریٚ ڕەشە بۆرە، کێیە و کێ نییە. هەر ئەوەندەی بەر دەرگەی بەر دەدا، دەتزانی بۆرەپیاوە، قەڵافەتدارە، یان لەڕ و لاوازە. ئەوەی ڕاست بێ، دەتگوت هەموویان بەرەی دایکێکن! جلوبەرگیان هەموو وەکو یەك، ئەوەی لە سەریشاندا بوو، کڵاوێکی لبادی ڕەش بوو. هەروەك کێوەکان تەخت، زۆریشیان کڵاوی سەریان، سوورگوێزی بوون، هەروەك بە ڕووی قوچەك. ئەوەی ئەوان لە بەریاندا بوو، کراسێکی ڕەش بوو، قۆڵەکانی درێژ و لەسەر سنگی سێ قۆپچەی هەبوو. بەسەر ئەم کراسەشەوە، کۆتێکی ئاسایی و بەسەر ئەوانیشدا، چۆخەیەکی درێژ هەتا سەر ئەژنۆیان دەهات. ئەویش ڕەش و سپی، بەبێ قۆڵ. پاتۆڵەکانیشیان فش و دەرەلینگ هەراو. لە قوماشی ڕەش. هەر هەمووشیان کڵاشی بن تەختیان دەکردە پێ، کە تایبەت بەو کەژ و کۆسارە بوو. تێشیاندا هەبوو کەوش و پێڵاوی جیری لە پێدا بوو. هەڵبەت ئەو کەسەی کە دەهاتە ژووریٚ لەدەم دەرگەکە پێڵاوەکانی دادەکەند. ئەوانەی کەوشی هەرزان باییان لە پێ دەکرد خۆشیان دەیانزانی، بۆنی لاقیان دێت، دانیشتووانی ژوورەکە پێی هەرەسان دەبن. بەختیارییەکانیش بەم بۆنە وەڕەز بوون. جا بۆ ئەوەی کابرای تاین بە خۆیدا نەشکێتەوە، دەیانگوت: ئەو کەوشە دراوسێیە، بۆ بینایی زەرەدیان هەیە! کەسێك بە زمانی لووڕی جوابی دانەوە و تێکڕا قاقایان کێشا، ئێمەش بەزەردەخەندێکەوە، پرسیمان دەڵێ چی؟ گوتیان: دەڵێ«هەر زەرەدی بۆ گیرفانمان نەبێ، چاومان قەیدی ناکات.»

ئەوەندەی دانیشتین، زانیمان لە باتی گوێز و توو (گوڵەبەڕۆژە)، تەنیا چایی دەدەن بە میوان. هەر کەسێکیش دەهاتە ژووریٚ چایەکیان دەدایە. ئەوەی چاخۆر بوو داوای چایەکی دیکەی دەکرد. کترییەڕەشە هەتا بەتاڵ دەبوو پڕیان دەکردەوە و وەسەر ئاوریان دەنایەوە. لە چادانی چینیدا چایان دەم دەکرد و بۆ هەر کەسێك کە دەهاتە ژووریٚ چایەکیان لە پێش دادەنا. وا دیارە زۆرینەی داهاتی ئەم خەڵکە دەدریٚ بە قەند و چایی.

قەندیان شکاندبوو هەریەکەی بە ئەندازەی کەشکێك، کەسمان نەدی چا بە شەکرەوە بخواتەوە.

ئەگەر کورد و لوورِ بە چاخواردنەوەش بێ ئامۆزای یەکترن، هەر بۆیە ئەوەندە حەزیان لە چایە.

«بەبێ چا قەند، مەزەی تاڵە لە دەم شێخ و مەلادا
کە چاخۆر، چا نەخوا، ڕۆژێ ئەویش زوو دێ بە لادا»

هەر کەسێکی بەختیاریت دەبینی، داردەستێکی پێبوو، وەختێ لە دەر و ژوور دادەنیشت لە تەنیشت خۆی دایدەنا. لە کاتی هەستان و دانیشتندا دەستیان پێدەگرت، وەك نێر لەسەر ئەستۆیان دادەنا و هەر دوو دەستیان بە سەردا شۆڕ دەکردەوە. ئەگەر بەختیارییەك دەهاتە ژوورێ، لەگەڵ ئەو دووانەمان تەوقەی دەکرد و سەرزارەکی ئەحواڵپرسیی ئەوانی دیکەی دەکرد. دادەنیشت، بۆ چەند چرکەیەك بێدەنگی ژوورەکەی دادەگرت، لە پڕ دەنگی قسەکردن بەرز دەبۆوە. لادێنشینان ناتوانن ئارام و لەسەرەخۆ بدوێن! دیوەکە دەتگوت چەقەخانەی مزگەوتە، کەس لە کەس حاڵی نەدەبوو. ئەم دەنگ و هەرایەش بۆ ئەو ژوورە چکۆلەیە گەلێك زۆر بوو. ناوەرۆکی باسەکە ڕوون بوو، بەڵام کەس لە قسەی کەس حاڵی نەدەبوو. تەوەرەی ئەم باسانە تەواوی لەسەر ئاژەڵداری و دزی و ڕادانی مێگەل بوو. هەر کەسە لەبەر خۆیەوە نەخشە و پیلانی دادەنا و دزەیان دەکوشت و دەیانبڕی، بەڵام تەواوی ئەوانە خەیاڵپلاو بوون. زۆریش لە پیاوی دەوڵەت دەترسان.

لەو کەینوبەینەدا، ئاگەدار کراینەوە کە جەعفەرقوولی گوتویەتی: «تەشریف بێنن»! لە پڕ هەر کەسە و لە جێی خۆی ڕاست بۆوە، منیش گیوە و کڵاشم هەڵکێشا، خۆم لە دەسك نا، بۆ هەڵگەڕان بە بەندەن و چیادا، ڕێگەش دوور و لاپێ. دەبوو بگەیەنین بە ڕەشماڵەکان لەم شاخ و کێوە. ئەو کێوەش بە «بیە بێکەس» بە ناوبانگ بوو. هەروەك دەمانبینی داربییەك بە تاقی تەنیا لەسەر دوندی کێوەکە بوو، دەیانگوت: لە بن دارەکە کانیاوێکی لێیە، ئەو دەورووبەرە ناودێرە بە «لاهوشەك». نێوچاومان هێنای و خانەخوێ هاتن بە پێشوازیی میوانەوە. بە ئەسپێك و هێسترێکی زین کراوەوە، بەرە و پیرمان هاتن. لەو کاتەدا زۆر حەزم بە خۆشی و شادی کرد، لە لایەکەوە نەمدەتوانی بە پێیان

برۆم، له لایەکی دیکەشەوە، غارەئەسپێکی خۆشم دەکرد. بە قسەکانی کابرای بەختیاریدا، تێگەیشتم هێسترەکە بزۆز و نەسرەوتووە، وام بە باش زانی هەرچی زووتر خۆ بگەیەنمە ئەسپەکویێت. هێستر بە دیگار برا، بەدەم بزەیەکەوە مۆرەیەکی لێکردم، کامێرەی وێنەگرتنم لە ئەستۆم کرد و پێم لەسەر ئاوزینگ دانا و خۆم هاویشتە سەر ماڵی زین. دیگاریش سوار بوو، وەڕێ کەوتین. پیاوەکانی خانەخوێ شان بە شانمان دەهاتن. سەد خۆزگە بەو کەسەی لەو کاتەدا ئاگای لە من نەبوو، کە چۆن لەخۆم دەرچوو بووم! وام دەزانی خان و بەگلەرم نۆکەر لە دوامەوە دێن. خۆم نەبێ کەسم بە پیاو نەدەزانی.

بەم جۆرەی لێم حاڵی بوو، نیو ساعەت تا سێ چارەك دەبوو بە سواری بڕۆین. ئەوەی لەسەر ڕێگەمان بوو تەنیا بەندەن و باسك و ملە و ڕووەك و گوێنی بوو. چیترمان لە نێوڕێدا نەدی شیاوی سەرنج و پێداهەڵدان بێت. بەسەر ئەم وڵاغەبەرزەیەوە، حەزم نەدەکرد پیاوەکانی دەور و بەرم بدوێنم. من سوار و ئەوان پیادە بوون، سەرە و ژووری برستی لە مرۆڤ دەچنی و ئەوانیش وەهەناسەبڕکێ کەوتبوون. هەر ئەوەندەی توانای هەنگاو هەڵێنانیان هەبوو، بەس بوو، ئیتر قسەکردن لە زیادییە. پێویست نەبوو بەدەم قسەکردنەوە بەم هەورازەدا وەسەر بکەوین، لە ڕێگەدا بیرم لەو نەریتە دەکردەوە، کە بە ڕاستی خەڵکی ئێران چەندە ڕەوشتبەرزن، ئەوەی پێیان باشە لە کاتی ئاوادا بە میوانی دەبەخشن، کە ئەویش کابرایەکی بێگانەیە. کورد گوتەنی: نانت جۆین بێ، خولکت گەنمین بێ. کە دیارە وردەوردە، بە هۆی پێشەیی و سەنعەتیبوونەوە، ئەم حورمەتگرتن و ڕێزلێنانەش لە شاراندا بەرەو کاڵبوونەوە دەچێ. لەو نێوڕییەدا نانەوایەك نابینی و هەر کەسە و بۆ خۆی نان دەکات، یان لەنێو جەماوەرێکدا کە شوێنێك نییە بۆ مسافیر و میوانێك، هەروەها لە کۆمەڵگەیەك، کە شوێنێکی گشتی نییە بۆ حەسانەوە و پشوودانێك. هەر ئەو جەماوەرە پێویستە لە کۆمەڵگەی خۆی دانەبڕێ و بۆ فرۆشتنی داهات و بەرهەمی خۆی، یان بۆ وەدەستهێنانی پێویستییەکانی، کە لەنێو خۆدا جێیەجێ نابێ، دوورەپەرێز نەبێت. هەر بۆیە دەبێ بۆ ئاسوودەیی ئەو خەڵکە ئاسانکاری و خزمەتێکی زۆر بکرێت، فەرق و جیاوازی لە نێواندا نەبێ. یان لە نەریتی خانەخوێدا. لە تەواوی ئێراندا، دەبینین، ڕێگەکان کاروانەڕێن، نانەوای گشتی نییە، هەر کەسە و

نانی خۆی دەکات. شوێنی گشتی، وەك چاییخانە و میوانخانە نییە. لە شوێنی ئاوادا، میوان، یان مووسافیر، ڕوو بکاتە هەر لایەك وەك ماڵی خۆی وایە، ئەمەش نەریتێکی جەماوەرییە. زۆرمان دیتووە، هەر ئەو نەریتە و ئەو دەرگەکراوەییە، ئەو نان بدەییە، بووەتە هۆی گەورەیی و نانبدەیی لەنێو کۆمەڵدا، ناودەرکردنی خاوەنماڵ، خۆشناوی خەڵکەکەش، بە لای ئەو کەسانەوە کە نانیان لە ماڵ خواردووە. هەر ئەو کەسانە، چ لەبارەی دارایی و چ لەبارەی مەعنەوییەوە، هەمیشە دەوڵەمەندن. ئەم ڕەوتەش هەروا بەردەوامە، ئەوانەی دارا و دەستڕۆیشتووترن، میوانی ناو بەدەرەوە و پیاوی دەوڵەت لە دەوری سفرە و خوانی کۆ دەبنەوە. کە زیاتر ناوبانگی میوانگرییان بڵاو ببێتەوە. بۆ نموونە هەر لەنێو عەشیرەتی بەختیاریدا، دەرفەتی گشتی بۆ غەوارە و لاوەکی نییە، خەڵکی ئاسایی ناتوانن، میوانداری لە غەریبە بکەن. لەسەر ئەو ڕەوتە ئێمەیش میوانی گەورەمالان دەبین. تا دەگەیشتینە ڕەشماڵەکان ئەو بیرۆکانە بە مێشکمدا دەهاتن و دەچون، وردەوردە لە هۆبە و هەواری خانەخوێ نێزیك بووینەوە.

ڕەشماڵەکان دوو دەستە بوون، ئەوان پێیان دەگوتن ماڵ، دەستەی یەکەم بە شانیدا تێپەڕ بووین، ئەوەیان هی «ڕۆستەم» برای جەعفەرقوولی بوو. دەستەی دووەم هەر ئەو دەستەیە بوو، کە دەبوو ئێمە بۆ ماوەیەك لێی بمێنینەوە. پیاوێك بەرەوپیلمان هات و هەوساری یەکسمەکانی لە دەست وەرگرتین، دابەزین، جەعفەرقوولی دەم بە پێکەنین، لەبەر دەم خێوەتەکاندا وێستابوو، زۆر بە گەرمی سەلاو و تەوقەی لەگەڵ کردین. خوڵکی کردین و چوینە ژووری، خێوەتەکە لەچاو ئەوانی دێکە گەورەتر و ڕەنگی سپی بوو. دوو پەتووی مەلافەتێگیراو بە چوار قەدی لەسەر مافوورەکان ڕاخرابوون. دوو دەستەنوێن لە لای سەرەوە، دانیشتین و پاڵمان پێوەدان. جەعفەرقوولی بە دابی بەختیاری و کوردەواری، لە خوار ئێمەی میوانەوە دانیشت و دەستووری دا، چایی بێنن.

زۆری پێنەچوو دەرگەی قسەوباس کرایەوە، باسی سەفەری پێشووی دیگار هاتە گۆڕێ. ئەم خێوەتە شوێنی حەلکردنی گرفت و کێشەی هۆزی بابادی، بەتایبەت، تەواوی بەختیارییەکان بوو. بەختیارییەکان هەر تاوەی یەکێك وەژوور دەکەوت، شکایەت و سکاڵای خۆی دەهێنا بۆ لای «جەنابی جەعفەرقوولیخان» خانیش، بە حەوسەلەوە گوێی لێدەگرتن و دڵنیای دەکردنەوە کە بە کاروباریان ڕادەگا، کێشەکانیان بۆ چارەسەر دەکات. نۆرە گەیشتە

پیاوێك، هەر ئەو دەمژمێرەی چاوم پێی کەوت پێشەسەری تاشراوی سەرنجی منی ڕاکێشا، برۆی پڕ و ڕوخسارێکی تاوبردووی ماتی هەبوو، چوارمشقی دانیشتبوو، سەری بەردابووەوە، دەم تەزیو و هێدی و لەسەرەخۆ قسەی دەکرد. لەبەر خۆیەوە، ئەو وردە شتانەی لەسەر فەرشەکە، کەوتبوون هەڵیدەگرتنەوە. سەری بەرز نەدەکردەوە، چاو لە چاوی خان ببڕێ و قسە بکات. ئەوەندەی دەستی دەجووڵاند، هێندەی قسە لە باراندا نەبوو. دەست و مشتێکی قەڵەشیو و خەپەی هەبوو، لە کاتی ئاخاوتندا ئەو دەستانەی نەدەسرەوتن. زۆر بە تامەزرۆیی گوێم بۆ گرتبوو، بەڵام هیچ تێنەگەیشتم، جەعفەرقوولی پیاوێکی وریا بوو، هەستی کرد دەمەوێ لە قسەکانی ئەم پیاوە تێبگەم. پێی گوتم، دزیان لێ کردووە و ڕانەکەیان ڕاداوە، بۆ من جێی سەرنج بوو، لە بەیانییەوە کە سواری ماشێن بووین، باس، باسی دزینی مەڕ و ماڵاتە. دەرگەی ئەو باسەم لەگەڵ جەعفەرقوولی خستە سەر پشت، بۆچی وایە؟ خان گوتی: دز لە خۆمانە و هیچی لەگەڵ ناکرێ. هەر لە کۆنەوە ئەم عەشیرەتە دزی تێدا بووە، ڕەنگە تا ئەو ڕۆژەی ئەم عەشیرەتە و خێڵاتی بمێنی دزی لێتەواو نەبێ. لە ڕابردوودا دزیکردن مەردازایی بوو، بەڵام ئێستە بۆ لە نێوبردنی دزی، لەپێشدا دەبێ دزێویی ئەم ئاکارە ڕوون ببێتەوە، ئەو جاریش دەبێ ئەو دزانە دەستبەسەر بکرێن و بە توندی سزا بدرێن. گوتم: ئەی ئەمنییە و پاسگە، لێرە چ کارەن؟ هەر ئەوەندەی ناوی پاسگەم برد، دەرهەڵبوو: «خوا مردووت ببەخشێ، هەر ئێمە دەستەبەستە دەیانگرین و بە ئەوانیان دەسپێرن، دوو ڕۆژی پێناچێ بەرەڵایان دەکەنەوە، ئەوانیش ئەوەندەی دیکە دڕ دەبن!. قامکی بۆ کابرای ماڵدزراو ڕاداشت و درێژەی دا بە قسەکانی:«هەر ئەو پیاوە بەستەزمانە، شەش مەڕیان لێ دزیوە. زۆریشیان لێداوە، هەر باشە نەیانکوشتووە! دواتر وایانزانیوە مردووە، خەریك بوون لە هەڵدێرێکەوە فڕێی بدەنە خوارێ، خەڵك پێی زانیوە و دزان هەڵاتوون. چەند ڕۆژ ئەم پیرەمێردە لە چەرمی گادا نوستووە، تاکو بەدەنی چاك بووەتەوە. ئێستەش بەتەمایە شکایەت بکات. ئێمەش زۆرمان پێ باشە، بەڵام بێهوودەیە، لە کار و کاسپیش دەبێ. کابرا زۆر لەسەر قسەکانی ڕۆیشت، ئەوەی بەسەری هاتبوو بۆ ئاغای گێڕایەوە. لەو کاتەدا شۆقی چرای ماشێنێك لە دوورەوە دەرکەوت. جەعفەرقوولی گوتی: لەوە دەچێ ژاندارمە بن، لەبەر ئێوە دێنە ئێرە. منیش هەروا بیرم دەکردەوە، سنوور و کەوشەنی ئەم عەشیرتە، وەك بڵێی پاوان کراوە. کەمتر وا هەیە، غەریبەیەك ڕێی بکەوێتە ئەو ناوە. لەوە دەچوو سیخوڕ و

جاسووسان هەواڵی هاتنی ئێمەیان پێ دابێتن، ئەمەش زۆر ئاسایی بوو، کە ئەمنییە خەبەری ئەم ناوچەیان لە دەستدا هەبێت. ترۆمبێلی پاسگە، هەتا ئەو جێیە هات، ئێمە لێی دابەزیبووین. ماینی زینکراویان بۆ ناردنە خوارێ، تاکو ژاندرمەکان بێنن. دەستوور درا خێرا چای ئامادە بکەن. ئەو کەسەی لەبەر دەرگە هەوساری یەك سمەکانی لەدەست وەرگرتین، ناوی «مەشەدی ئەمیر» بوو. هەر کەسێك لە ڕێوە دەهات، ئەو پیاوە بە پیرییەوە دەچوو، لەو کاتەوە ئێمە دابەزیبووین، هیچ ئافرەتێکمان نەدی لەو دەوروبەرە. وردەوردە خۆر ئاوابوو، شەو نێوچاوی تێکنا. ئیتر هەستت بە هەوایەکی فێنك دەکرد. دەرگەی چادرەکەیان دادایەوە، چراتۆڕ ڕووناکیی خۆی بە ژوورەکە بەخشی. ماوەیەك ڕابرد و، ژاندرمەکان تەشریفیان وەژوور کەوتن، بەخێرهاتنیان کردین، عوزرماییان خواست، کە دەبێ بزانن ئێمە بۆچی هاتووین؟ منیش، ئەوەی دەبوو پێیان بێژم عەرزم کردن، ناسنامەی سەفەرم نیشان دان، کە لە «ناوەندی کۆمەڵناسیی ئێران» وەرمگرتبوو. ئەوانیش دڵنیا بوون. لەسەر ئاماژەی چاو و برۆی جەعفەرقوولی ڕاسپاردەی پیرەپیاوەم ڕاگەیاند، بەڵێنیان دا، کارێکی بۆ بکەن. لەسەر فەرموویەکی جەعفەرقوولی، بۆشێوخواردن مانەوە، تێر و پڕ کەبابیان خوارد و بەجێیان هێشتین. هەر لەو خێوەتەدا پێخەفیان بۆ ئامادە کردین، تێخزاین، بە هۆی شەکەتی و ماندووبوونەوە، خرپ خەومان لێکەوت. پیاوێکی بەختیارییش لە لای ئێمە خەوت، تاسەری کردە سەر سەرین چاوی چووەخەو.

### یەك شەممە ٤ی جۆزەردان

بە پێی عادەتی خۆم، بەر لە تاوکەوتن، لە خەو هەستام. کابرای بەختیاری زووتر هەستابوو، ڕۆیشتبوو. دوو مەسینەی پڕ لە ئاو، لەبەر دەرگەی خێوەتەکە ئامادە کرابوون. وەختێ کاری خۆم تەواو کرد و گەڕامەوە، تازە دیگار خۆی دەکێشایەوە و لە خەو هەڵدەستا. لە پڕ گوێمان لە کاڕەی مەڕ بوو. دەنگی هۆهۆی شوان و بێلەبێلی مەڕ و زەنگی نێری و بەران. کەژ و کۆساری پڕ کرد و بەیانی باشیان لێکردین! خێرا جێوبانمان کۆ کردەوە، هەتا نانی بەیانی ئامادە بوو، هاتینە دەرێ و چەند کەسێك لای سەگەلیان بۆ گرتین و خۆمان گەیاندە ڕان و کەرتەمەڕان. لەگەڵ کاکی شوان تەوقەمان کرد، لەگەڵ ئەوەی ئەو سەرقاڵی کاری خۆی بوو، دەستمان کرد بە وتوێژ. مێگەل

خووخدەیان وایە، دانەیەکیان وەپێش بکەوێ و ئەوانی دیکەش بە شوێنیدا دەڕۆن و ڕێچکە دەگرن. شوانیش لەگەڵ ئەم سرووشتە ڕاهاتوون، ئەو نێری و بەلەبۆزانەی لەپێش مێگەلەوە دەڕۆن، زەنگی گەورەیان لە ملدایە. مێگەلیش خوو بەو دەنگە دەگرێ و وەدووی دەکەوێ. کارژیلە و بەرخیش، زەنگوڵەی دەکەنە مل، لووڕەکان پێی دەڵێن «تیریك» ئەمەش بۆ ئەوەیە ئەوانە زۆر بزۆزن، ئەگەر هات و بە هەر لایەکدا چوون، شوانە خێرا بیانبینێتەوە. وەختێکیش بزانن مەڕێك تەمبەڵ و دەمتەزیوە، زنگوڵەیەکی وێکهاتووی لە مل دەکەن، ئەگەر لە ڕانەکە بەجێ ما، شوان زوو پێی بزانێ. ئەو زەنگ و زەنگوڵانە، یارمەتیی شوان دەدەن، کاتێك ڕان لە پەچە خەریکی حەسانەوەیە، یان شەو لەسەر حەوشەمەڕ خەوتووە، ئەگەر هات و ڕایدا، بە دەنگی ئەم زەنگانەدا شوان زوو خەبەری دەبێتەوە. هەروا کە پرسیارمان دەکرد، بۆمان دەرکەوت، سەگ و زەنگ بە ڕۆژ و بەشەودا کۆمەك و یاریدەدەری شوانن لەو شاخ و کێوە. ئەگەر وا نەبێ، ناچارن، لەباتی دوو شوان، ببن بە چوار شوان. ئێستەش بۆ ئەمرۆمان تەواوە و بەشی خۆمان، فێری شوانی و لەوەڕاندنی کەرتەمەڕێك بووین. واباشە لە هزری زگی خۆماندا بین و ماوەیەکیش لەسەر خوانی ئەم و ئەو خۆمان تێر بکەین و زۆریش سوپاسیان بکەین. پیاوێکی بەختیاری، هەتا گەیشتینەوە ڕەشماڵەکان لەگەڵمان هات. دەنا بەر لەوەی ئێمە نانی بەیانی بخۆین سەگەل ئێمەیان دەخوارد! نازانم ئەوسەگانە بۆ هەتا غەریبەیەك دەبینن ددانی سپییان لە چیڕەوە دەبەن و کەڵپەیان نیشان دەدەن. نانی بەیانی، ماست و ڕۆنەکەرە بوو. زۆر بەتام و لەزەت. تەنیا من و دیگار لە خێوەتەکەدا بووین، لە ترسی سەگ زاتمان نەبوو سەر بێنینە دەرێ. «لێرەدا نووسەر باسی دەستبێن و شەوێنی نەکردووە، بۆ ئاگەداری خوێنەران، دەبێ بڵێم: وەختێ شوان، لە شەودا مەڕەکەی مۆڵ دەدات و دەیخەوێنێ، بەنێك لە ئەستۆی بەرانێك دەبەستێ، ئەگەر بە هەر هۆیەك مەڕەکە ڕابدا، ئەوا بەرانەکە شوانە ڕادەکێشێ و وەخەبەری دێنێ. بەو بەنە دەڵێن دەستبێن و دەستبێنگرتنەوە. شەوێنیش ئەوەیە کە شوان لە بەرەبەیاندا ڕانەکە ڕادەدا بۆ لەوەڕاندن و تێرکردنیان.»

جەعفەرقوولی دوای ئەوەی لە کارەکانی خۆی تەواو بوو، هات لەلامان دانیشت، ئەو دەرفەتەمان گرتەوە، بۆ ئەوەی لە سەرەتای کارەوە خەبەری هەموو شتێکمان هەبێ،

لەگەڵی کەوتینە قسەکردن. ئەو «تەش»ە لە بنەچەکەی، هۆزی «بابادی عالی ئەنوەر» لە بابادیباب، بەرەی «حەوت لەنگ» عەشیرەتی بەختیاری. ئەم ڕوونکردنەوەیە، تەواو گێژی کردم، مەحتەل مابووم، زۆر بە وردی بۆی شی کردمەوە: عەشیرەتی بەختیاری لە دووبەش پێکهاتووە، «حەوت لەنگ» و «چوار لەنگ»، بەشی حەوت لەنگ ئەم چەند پەلەی لێدەبێتەوە، «بابادی باب»، «دورکی باب»، «بێهداروەند» و «دینارانی».
بابادی عالی ئەنوەر لە هۆزەکانی «بابادی بابە» کە لەمەڕ ئەم جەماوەرەوە، ڕوونکردنەوەی باشی پێ داین و لە خوارەوە سیاییم گرتووە. هەر وەك دەبینین، ئەم پێکهاتەیە، نیزامێکی لەیەکدابڕاون لە عەشیرەتدا. لەمەڕ حوکم و دەستوورەوە، نیزامێکی زنجیرەیی سەیتەرەی بەسەر هەموویاندا هەیە. واتە لە سەروویی هۆزەوە، سەرۆك هۆز»حاکمە بەسەر «تەش»دا، بە دوای ئەویشدا کوێخا هەیە، بە دوای ئەویشدا، کەسێك وەك ڕدێنسپی دیاری کراوە. جەعفەرقوولی لە قسەکردندا دەموڕاوێژ خۆشە، منیش ئەوە یەکەم ڕۆژە لێرەم، بەم قسەکردن و دەمپاراوییەی سەرۆك عەشیرەت کەیف خۆشم.

بۆی ڕوونکردینەوە، کەوا هۆزی بابادی و هۆزەکانی دیکەش، لەو ئێل و عەشیرەتە تەنانەت ئێلیش هەروا، هەر یەکە و خاوەنی دوو «کۆچە»" کۆچی، پایزە و، کۆچی بەهارە. کۆچی پایزە لە زۆزانەوە بەرە و گەرمێنە و، کۆچی بەهارەش لە گەرمێنەوە بۆ زۆزان دەچێت. لە زۆزانێ، دەچنە ناوچەی کوهرەنگ و کێوەزەرد" لە ئارانیش، دەچنە ناوچەی خوزستان لە بەشی باشوور.

بۆ کۆچی پایزە دەوروبەری پانزەی خەرواتان، یەکەم ڕەوەند، دەکەونە ڕێ. دواین ڕەوەندیش، لە کۆتایی مانگی ڕەزبەردا، جووڵەی خۆی دەست پێدەکات. ئەم جووڵەیەش، بەیانی زوو دەست پێدەکات. هەر لەو ڕۆژەدا شەوێ دەگەنە کێوەزەرد، شەوی دووەم لە ناوەندی کێوەزەرد لەشوێنێك بە ناوی «ئاوچەرموو» دەمێننە. لە سێیەم ڕۆژدا لە چیاکە دادەگەڕێنە خوارێ و خۆ دەگەیەننە دۆڵی «بازفت»" یەکەم مەنزڵیان لەدۆڵی بازفت، جێیەك هەیە بە ناوی «بونوێ».

**مندالٚ ـــــ فەرامەرز، جەهانگیر**
**حاجیوەر ـــــ غەییی، حەمەحوسێن، بەدر، نەجەف، حەمە یوسف**
**ئەحمەد سمالی ـــــ ئەحمەد، سلێمان**
**جەلیل ـــــ فەرهاد، ڕوزبێ، خەسرەو**
**تەقی عەبدوٚلاٚیی و بابادی عالی ئەنوەر ـــــ میر بابادی، مێرپیوور، حەبیبی، ئەمانی، گودەرزی.**
**میرقائد ـــــ سیراجەدین، شێخ، خوشتری، دوٚستعەلی، ڕکان**
**ئارپەنایی ـــــ خودادادوەند، بیر، کیسدی، ڕوکیدی، پیرتازەیی، داوودقەرەج**
**لەك ـــــ عەسکەروەند، بەهار وەند، ساتیار وەند.**

چوارەم ڕۆژ لە «خانباغ»ی بازفتـــین، لە پێنجەم ڕۆژدا، لە «بازارگە»ی لە بازفت. شەشەم ڕۆژ، لە «کۆشك»ی بازفتـــین، لە ڕۆژی حەوتەمدا، دەگەینە «تەنگەی هۆنی» لە بازفت. ڕۆژی هەشتەم، بە چیای «تاراز»دا تێدەپەڕن و دەگەنە «چلۆ». لە نۆیەم ڕۆژدا، «بابازید» و ڕۆژی دەیەم، دەگەینە «شیمبار». لەو یازدە ڕۆژەدا دەچنە «چالٚمونار» و لە دوازدە ڕۆژدا «چوارتەنگە» و ڕۆژی سێزدەیەم، لە «چولبار» بار و بنە دەخەن، ئەوێ خاك و هەوارگەی گەرمێنی بابادییە. ئینجا، لە چوبار هەر یەکەی بە لایەکدا دابەش دەبن و بە ئەمانە دەگوترێ تەش. شوێنی دامەزراندنی «تەشی مندالٚ» لە هەوارەکانی "خەراج"، "سلاٚواتی"، "چوار ئەستوونەڕەش"، "ئاوجدان" و "خارکەلە"یە. شوێنی "حاجیوەرە"کان لە شوێنەکانی "بەدراوا"، "نەدیدوەند" و "سەرکەمەری"یە. "ئەحمەد سمالی"یەکان لە "دۆڵی بوری"ن و "جەلیلی""یەکان لە "خەراج" و "سەرشا" ڕەشماڵ هەڵدەدەن. "تەقی عەبدولاٚییەکان" و "لەك"ــەکان لە "تەراز کەرکوژ"، "سلاٚواتی" و "خارکەلە" خەریکی لەوەڕاندنی ئاژەڵی خۆیانن. "میرقائید"ــەکان لە "ئاونی یەك"، "هەرێتی" و "سلاٚواتی" ماوەی ئارانی خۆیان دەبەنە سەر" هەروەها "ئارپەناییەکان" لە "چوبار"، "ئارپەنا"، "گرێوە" و "هەمبارسپی" بۆ ماوەیەك دەمێننەوە.

لە کاتی گەڕانەوەدا، لە یەکەم ڕۆژەوە تا پانزەی خاکەلێوە جوولەی ڕەوەند دەست پێدەکات، بە هۆی ئەوەی بەرخ و کار لەگەڵ مێگەلەکەن و، لە نێورێشدا لەوەڕ زۆرە نێزیکەی مانگێك بەرێوە دەبن. بە کوێدا چونەتە هاوینەهەوار، هەر بەو شوێنەشدا دەگەڕێنەوە. "منداڵان" لە "چەمدەر"، "قەلاتەك"، "خەسرەوئاوا"، "چلگرد"، "کێوەسوور" و "کونەگورگە" بلاو دەبنەوە. "حاجیوەرەکان" لە "چلگرد"، "نۆدێ" و "گرەکۆشك" چادر هەڵدەدەن. "ئەحمەدسمالی"یەکان لە "نیاکان" و "جەلیلی"یەکان لە "میانرووودان" و "قولتەك" بارگە و بنە دەخەن. "تەقی عەبدوڵاییەکان" لە "میانرووودان" و "نۆدێ" هاوینەهەواری خۆیان دەبەنە سەر. "میرقائیدەکاتن" لە "دارکان" و "شێخ عەلیخان" و، هەروەها "ئارپەناییەکان" تەواویان لە "شێخ عەیخان" مەڕ و ماڵاتی خۆیان بەخێو دەکەن. ئیتر "لەکەکانیش" لە "چمدەر"، "ئاوپەخشان" و "کونەگورگە" دەمێننەوە.

لەسەر ڕێگەی ئەم هۆزە چوار چۆم و ڕووبار هەیە، دەبێ لێی بپەڕنەوە. لە پایزەکۆچدا زۆر تووشی گرفت نابن. لەبەرئەوەی وشك دەکات و ئاوی نامێنێ، یان هەر ئەوەندەیە قولاپە بگرێ. ئەمەش بۆ پاراوبوونی ڕانەکە تەواوە، بەڵام لە بەهاردا، ئەو ڕووبارانە هەر لرفەیان دێت و مەترسیی ئاوبردن و خنکاندن لە ئارادایە. ئەو چۆمانەش برێتین: لە "رووباری بازفت، چلبار، شیمبار، شێخ عەلیخان" پەڕینەوەش لەو چەم و ڕووبارانە، بەم هەموو مەڕ و ماڵات و خێزانەوە، چیرۆکی خۆی هەیە، لەگەڵ سرووشتدا. ئەمانە ئاگەدارییەك بوون، یەکەم ڕۆژ دەستم کەوتن. کە دواتر لە نێزیکەوە بە چاوی خۆمان بیانبینین و تاقیان بکەینەوە. لە پاش ئەم قسە و باسانە، هاتینە دەرێ بۆ وێنەگرتن لە ڕانەمەڕەکە. کەسێك شان بە شانمان دەهات بۆ ئەوەی سەگەل نەمانگرن. سەگوەڕێك بوو دەتگوت گورگ لە مەڕی داوە. وەك ئەوەی دز لەسەر ئاوایی بێ. لەمپەرەکانمان هەو نەبوون، ئێمەش ڕۆح هاتبووە سەر کەپۆمان، بەڵام نەماندەویست ورە لە دەست بدەین و دەوروبەر پێمان پێبکەنن! ئاخری هەرچۆنێك بوو، چەند وێنەیەکمان گرت و خۆمان کردەوە بە خێوەتەکەماندا. ئەگەر هزرێك بۆ ئەو سەگەلە نەکەینەوە، ژیانمان لێ تاڵ دەکەن و وەك سیرمە دەمانپچڕن. نانی نیوەڕۆمان خوارد و من دەستم کرد بە یاداشت هەڵگرتن و نووسینی ئەرکەکانی خۆم. دیگار چاوی کەوت بەو قولاپە

بەردەی بەدەست یوسفە چکۆلی کوڕی جەعفەرقوولییەوە بوو، بانگی کرد، وێنەی لە قولاپەکە هەڵگرت. لە چیا داگەڕابوو. لە خێوەتەکان هاتینە دەرێ بزانین چ باسە. لە هەر دوو بەر دوو دیواری وشکەچنیان لە بەرد هەڵچنیبوو. لە شێوەی کۆلانێك، لە بەرا هەراوو، لە کۆتاییدا تەنگە بەر. تەنیا دوو سەر پەزی پێدا دەردەچوو. دووکەس لە پیاوەکانی ماڵێ مێگەلەکەیان بە هێ هێ، بەڕێی ئەو دالانە تەنگەبەرە دەکرد. لەو تەنگەبەرەدا مەڕەکان دەچوونە بەر دەستی دوو ژنی مەڕدۆشی ئێلاتی بەختیاری. پشتیان لە دالانەکە بوو، هەر یەکە و مەنجەلێکی مسی لە بەردەمی خۆی دانابوو. بە جۆرێك دانیشتبوون، مەڕەکان نەتوانن لە دالانەوە هەڵبێن. پیاوێك سەری هەر دوو مەڕەکانی دەخستە بن پیلی و ژنەکانیش لاقی مەڕی بەستەزمانیان لە یەك بلاو دەکرد و دەفری مسیان لە بەر گوانی ڕادەگرت و سەریان دەنا بە دوگی مەڕەکانەوە، قامکیان بە شیری مەنجەڵەکە تەڕ دەکرد و گوانی پڕ لە شیریان دادەدۆشین. وەختێ ئەو دووانە تەواو دەبوون، نۆرە دەگەیشتە دووانی دیکە. دەبوو ئەو مەڕە لەو کۆلانە تەنگەدا ڕاوەستێ هەتا دووان دووان نۆرەیان دەهات. ئەو دالانەش ناوی "دوون" بوو. ئەوانەی دەدۆشران و بەردەبوون، بە قەڵەمبازێك دوور دەکەوتنەوە و لەو لاترەوە دەخەوتن. دوو شوان وریای نەدۆشراوەکان بوون مەبادا خۆ بدزنەوە. کاری شیردۆشینەکە بە خێرایی بەڕێوە دەچوو، لە ماوەی دەمژمێرێکدا ١٥٠ سەر مەڕیان دەدۆشی. دوو مەنجەڵی مامناوەندیی پڕ لە شیریان بردەوە. ئەگەر لەکاتی شیردۆشیندا مەڕێك لاساری بکردایە، مەنجەڵە شیری بڕشتایە، بێری خۆی وەسەر دەکێشا و نەیدەهێشت. زۆرم پێ سەیر بوو، بۆ دەبێ شیر کەم بێ؟ جەعفەرقوولی گوتی، وشکیان کردووە. جەنابی ئاغا بەسەر هەموو شتێکدا ڕادەگەیشت، دەستووری دەدا و هەر کەسەی بۆ کارێك ڕادەسپارد. بۆ دۆشینی ١٥٠ سەر مەڕ، بەکەڵکوەرگرتن لە "دوون" لانیکەم ٦ کەس پێویستە لایان بۆ بگرێ. کەسێك بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکان، کەسێکی دیکە بۆ گرتنی مەڕەکان، دوو کەس بۆ ئاگەداریکردن لە مەڕەکان لە کاتی بەڕێکردن بۆ نێو دالانەکە، لەگەڵ دوو کەس بێریی مەڕدۆش. هەڵبەت یەك دوو منداڵیش دەبوو لای ئەو مەڕانە بگرن، کە خەریکی هەلاتن بوون.

کاری شیردۆشین تەواو بوو، دیسان گەڕاینەوە بۆ نێو ڕەشماڵەکان. من خەریکی نووسین بووم، سەرم داخستبوو، لەپڕ دەنگی سەگوەڕ هات. خۆبەخۆ بەشەڕ دەهاتن. سەرم بردە دەرێ بزانم چبوە، سەیرم کرد مەڕێکیان سەر بڕیوە، بە پەلە چوومە دەرێ، بۆ ئەوەی لە نێزیکەوە هەموو شت بە چاوی خۆم ببینم، جەندەکی مەڕیان بە سێپەکی مەشکەژەندندا هەڵواسیبوو. لە لای لاقییەوە کابرای قەساب خەریك بوو کەوڵی دەکرد و دایدەماڵی! گوتم بۆچی باتان تێنەکرد؟ گوتیان، ئێمە ئەوکارە ناکەین، حەرام دەبێ. پێستەکەیان بە مەبەستی مەشکە دەردەهێنا. پێستەی مەڕ و کاوڕ بە هۆی ئەوەی تەنکە هەر بۆ مەشکۆڵە باشە. لەبەرئەوەی پێستەی بزن ئەستوورترە، ئەو دەکەنە هەمبانە و کوندە و خیگەڕۆن. نێوزگی مەڕیان خستە دەرێ، گوتم: ئەوە چ لێدەکەن؟ گوتی، "هیچ، بەکاری ئێمە نایات، خەڵکی شار لێمان دەکڕن." سیپەلاکی مەڕیان خستە بەر سەگەل، ئەم شەڕەش هەر بۆ ئەوە بوو.

چوومەوە نێو چادرەکە، دیگار مامۆستایەکی باش بوو، لە هەر دەرفەتێکدا، بۆ ئەوەی لەسەر کۆمەڵناسی شارەزایی پەیدا بکەم بەهرەم وەردەگرت. خەریك بووم پرسیارم دەکرد لەپڕ میوان وەژوور کەوت. ئەو جەعفەرقوولییەش دایمەی خودا میوانی هەیە، چایی و مەنقەڵی ئامادەیە، ئەم چادرەش کە بۆ ئێمە لەبەرچاو گیراوە هەر دەمەی کەسێك دێت و دەڕوا، بووەتە خانەقای شێخی بورهان! کە دیارە ئەم ڕەشماڵە زۆریش قازانجی بۆ ئێمە هەیە. لە هەر ئان و ساتێکدا، نۆکەرەکەی خان ئامادەیە، هەوساری ئەسپەکە لە دەست میوان وەربگرێ و لغاوی لە دەم دەربێنێ و تا میوان ئامادەی گەڕانەوە دەبێ، بیلەوەڕێنێ. ئەوسا، لغاوی لە دەم بکوتێ و ڕایبگرێ تا میوان سوار دەبێ و ماڵئاوایی دەکات. هەر کە میوانێك لە ڕێوە دەهات، لە دوای تەوقەکردن و ئەحواڵپرسی، باس دەهاتە سەر ئاژەڵداری و لەوەڕگە و گێرە و کێشەی ڕۆژانە، هێندە خێرا خێرا، بە زمانی لووڕی قسەی دەکرد، هەر نەماندەزانی دەڵێ چی، بەڵام وردە وردە، گوێچکەم ڕاهات و دوای دوو سێ ڕۆژ، نێزیکەی سی چل، لە سەت لە قسەکانیان حاڵی دەبووین.

دیگار، بێسەبرانە چاوەڕێ بوو، وەختی نانکردن بێت و چەند وێنەیەکیان لێبگرێ. نانکردنیش لە ئەستۆی ئافرەتانە و لە بەردەم ڕەشماڵەکان ئەم ئەرکە بەڕێوە دەچێ.

ئێمەش بەم بیانووەوە دەمانتوانی زۆرتر بچێنە ناخی ژیانی ئەم عەشیرەتەوە. خۆمان لە چنگ ئەم خێوەتە سپییە ڕزگار بکەین. هەڵبەت دەرفەتیش زۆر بوو، پێویست نەبوو بەتاڵووکە بین، بەڵام ئەوە من بووم تاقەتم بەسەر دەچوو. وا دیار بوو، بەم خێراییە، هەویرشێلان و نانکردن دەستی پێ نەدەکرد. با، بە توندی خۆی ڕادەوەشاند و ئاوری ژێر سێڵەکەی دەکووژاندەوە. جاریٚ بەختیارییەکان بیرێکیان بۆ ئاگردان نەکردبووەوە و هەر بە شێوەی سەرەتایی نانیان دەکرد.

دیگارم ناچار کرد بکەوێنە ڕێ. بچینە سەر کێوەکە و سەرێك لە کانی بییە بێکەس هەڵبێنین. بە لالووتێکەوە ڕازی بوو. بۆ ئەوەی سەگ نەمانگرێ، کەسێك ڕەوانەی کردین و بە هەر زەحمەتێك بوو، خۆمان گەیاندە سەر نووکی کێوەکە. لە دەڤەری بەختیاری بەخت بوو بە یارمان، چوونەکەمان بە خۆڕایی نەبوو. شوانەکان، لەژێر سێبەری داری بی خەریکی پشوودان و حەسانەوەی خۆیان بوو. ڕانە مەڕ تێکڕا، لە دەوری ئەستێرەکە مۆڵی خواردبوو. ماندوونەبینیمان لێکردن، چەند وێنەیەکمان لێهەڵگرتن. دەرفەتمان لە دەست نەدا، لەگەڵیان دانیشتین و ملمان نا لە پرسیارکردن. هەق و بەراتیان، چەندەیە و ئەرکی ئەوان چۆنە. بەم جۆرە کەوتنە ئاخاوتن: ڕانەکە دەبەنە کەژ و کۆسار، دەیلەوەڕێنن، مەڕ و بزن بۆ بێری دەگرن لە کاتی دۆشیندا، دەزانن کام یەك لە مەڕەکان شیریان هەیە و کامیان نیانە، بەر لەوەی مەڕ ببڕنەوە، دەیانشۆن، بەسەرکردنەوە و سیاییگرتنیان، وەختی بڕینەوەیان بە ئەرکی خۆیان دەزانن، لە کاتی زەودا کار و بەرخەکان گۆچ دەکەن، لە شوێنی تایبەت دەیانپارێزن، لە ماوەی گێرانەوەیاندا، جگە لە هەقە بەرات، هەموو خەرجێکیان لەسەر مەڕدارە. لە دە سەر مەڕ، بەرخێك، لە دە سەر بزن، کارژیلەیەکیان هەیە. ئەمەش خۆیان هەڵی دەبژێرن. هەر بە دە مەڕ خورییەکیان هەیە. توربێنمان پێ بەتاڵ کردن بزانین چی تێدایە، کترییەکی چکۆلەی ڕەش، قروشکەیەك بۆ چاییخواردنەوە، چارەکەی نان بۆ خۆیان، ناندێنێك کە سەولەی سەگەلی تێدابوو. قوتوویەك قەند و چایی، برینگێك بۆ مەڕبڕینەوە. ئەوان بە زمانی لووڕی پێیان دەگوت: "چەرە"، هەر ئەوەندە. نیشانیان داین بەو برینگە چۆن مەڕ دەبڕنەوە، ئێمەش بە کامێرەکەمان وێنەی برینگەکەمان گرت. برینگەکە دوو کوتە ئاسنی دەمتیژە، وەك مقەست، دەسکی ئەو برینگە لە دار ساز کراوە، هەر وەك برینگی مەڕبڕینەوەی کوردەواری خۆمان. وەختێ

دەستی چەپ دایدەگرێ کار دەکات، خورییەکە دەبڕێت، ئەگەر دەستی ڕاست بجوولێ هەر دوو دەمی برینگەکە دەکرێتەوە. مەڕبڕینەوەش کاری شوان نییە و بە هەرەوەز چەند کەس ئەو کارە دەکەن، دوای مەڕبڕینەوە، نانی نیوەڕۆیان دەخۆن و دەڕۆین. بە هیوام ئەو هەرەوەزە ڕۆژێك ببینم. شوانەکە ناوی مەجید بوو، ئەوە باشترین شوانی ئەو ئێلە بوو. توربێنێکی دیکەی لەگەڵ خۆی دەگێڕا، تولەیەکی چکۆلەی تێدا بوو. دەیگوت بەتەمایە هەر لە ئێستەوە ڕای بێنێ. ببێ بە سەگێکی باش.

ئەگەرچی کانی بیی بێکەس کەم ئاو بوو، بەڵام ئەستێرێکی باشیان بۆ ساز کردبوو. مێگەلەکەش ئاویان لێدەخواردەوە. سەگی بەر مەڕی هێرشیان بۆ هێنام، باش بوو داردەستێکی باشم پێ بوو، هەتا شوان گەیشتێ، توانیم بەرگری لەخۆم بکەم. شوانی ڕانەکەش کاك مەجید بوو، جلوبەرگی بەختیاریی لەبەردا بوو، بەبێ چۆخە، بەڵام کەپەنکی دابوو بە شانیدا. ماڵئاوایی لێکردین و وردە وردە ڕانەکەی وەپێش خۆی دا. ئێمەش لەوێ ماینەوە، شوانی بزنەگەل، شوانی کارژیلەکان، یەکیان کاك مراد، دە ساڵی تەمەن بوو، شوانی بزنەکان بوو" ئەویدیکە، مێرمنداڵێکی هەشت ساڵانە بوو، ئەویش شوانی بەرغەل بوو. هەردووکیان لە کاروباری خۆیاندا زیرەك و وریابوون، لەو کوێستانەدا. بە قەد پیاوێکی کامڵ بەکار بوون. بەرخەوان بۆ ئەوەی خۆی نیشان بدات، بەردێکی هاویشت، زۆریش ڕۆیشت، دنەمدا ئەو کارە بکات، گوتی: "جارێ ئەوە هیچ نییە، با گەورە بم، دەستم درێژ ببێ، دەبێ بەردم بگاتە ئەوکێوە." کێوێکی لە بەرانبەرماندا نیشان دام، قسەکانی بۆمن زۆر جێی سەرنج بوون. داوام لێکرد بە کەڵکوەرگرتن لەو بەردانە، چەند وێنەیەکمان بۆ بکێشێتەوە. زۆرباش بەردەکانی دەناسی، بەردێکی نەرمی پەیدا کرد و لەسەر تەختەبەردێکی دی، وێنەی بزنێکی بۆ کێشامەوە. وێنەیەکی سادە و ساکار، بزنەگەلی بەرەوماڵ ڕادا، ئێمەش یارمەتیمان دا. هەر بەم کارە گیسکی یەکساڵیان لە دایکیان هەڵداوێرن، بزنی شیری بەرەو ماڵ دەبەنەوە. دوو ژنیش ئامادەی شیردۆشین بوون. شوانەکانیش یاریدەیان دەدان، زۆر زوو لە دۆشین تەواو بوون! کارژیلەیان تێبەردان، بوو بە باعەباعێك هەر مەپرسە. هەر کارژیلە بوو خۆی دەکرد بە بن زگی دایکی خۆیدا، دەستی دادەدا و گوانی دەمژی. بزنەکانیش بە حەزەوە بۆیان ڕادەوەستان، بۆنیان پێوە دەکردن و دەیانلستنەوە.

هەمیشەش لەوە دەترسان شوانەکان، خێرا هاوێریان نەکەن، بەڵام زۆر زوو هەر کەرتە و بە لایەکدا ڕەوانە دەکرا.

جەعفەرقوولی، لە بەینی ماڵەکاندا، کۆزێکی پێ نیشان داین. تەنیا مەترێك باڵای بەرز بوو. ئەویش بە وشکەچن هەڵچندرابوو، گوتی: ئەوە بۆ شەوانە جێی کارژیلەیە، لە نێوان ماڵەکاندا، مێگەلەکەشیان لە حەوشە مەڕ دەخەواند. لە نێزیك ڕەشماڵەکان، یان لە چیا. لە پشت ڕەشماڵەکانیش، گەماڵەکان، هەمیشە وریا بوون.

وختێ کاری شیردۆشین تەواو بوو، ئێمەش چووینەوە نێو چادرەکە و گوێمان شل کرد، بۆ دەردەدڵی جەعفەرقوولی. سەبارەت بە ئەرك و وەزیفەی خۆی زۆر دووا: "زەحمەتی زۆر و بێ بەهرە، شەو و خوانی ئامادە، تەش و مەنقەڵی ڕازاوە، گوێبیستی قسە و گلە و بناشتی ئەم و ئەو، دۆست و دوژمنی زۆر، لە دۆستان هیچمان بەنسیب نابێ و ترسی دوژمنیش لەوێ ڕاوەستێ. لە کار و کاسپی دەبێ، ڕۆژێك لە شاریکورد، ڕۆژێك لە ئەسفەهان، ئەگەر لە ئارانیش بین هەموو ڕۆژێ لە مزگەوت سلێمان و..." زۆری بۆ باس کردین، لە ماوەی ئەم سەفەرەماندا، هەموومان بینی. گەڕان بەم کێوانەدا ماندووی کردین و جەعفەرقوولی، دەم پاراوانە قسەی دەکرد. قسەم پێ بڕی و بە پێکەنینەوە، دەستێکم بە زگی برسیمدا هێنا. جەعفەرقوولی، قاقا پێکەنی و زۆریش بەم ڕوو ڕاستییەم کەیفی ساز بوو. خواردنی شەومان، جەرگ و دڵی مەڕەکەی نیوەڕۆ بوو، لە پاشان بە لای ڕادیۆوە دانیشتین، هەواڵەکانی لەندەن و تاران، هەر ئەو شەوە بوو دیگار، ڕێگەی کێشانەوەی پێوەندی و تێکەڵاوی خزمایەتی فێر کردم. پەڕاوێکی زۆری کۆپیکراوی پێبوو، کە نموونەی ئەوانی تێدا نەخش کرابوو.

بۆ پێکەنین لێم پرسی: ئیتر ئەوە چییە؟ "ئانتێنی تەلەڤزیۆنە؟" بە دەم پێکەنینەوە گوتی: نا! زۆر بە حەوسەلەوە تێی گەیاندم: لەسەر ئەو وێنەیە، ڕێژەی خزمایەتیی ئەوانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە. هەر یەك لەو سێ سووچ و بازنە بچووکانە، ئەگەر ڕەش بکەینەوە، ڕێژەی خزمایەتیی ئەوانمان لەگەڵ کەسەکانی دەوروبەریان بۆ دەر دەکەوێت. سێ سووچەکان نیشانەی ڕەگەزی نێرە و بازنەکانیش ڕەگەزی مێ. بەرانبەرەکان نیشانەی زەماوەند و خەت و هێڵەکانیش منداڵن.

ئەم باسە بۆ من، زۆر جێی لێوردبوونەوە بوو، هەوڵم دا فێر ببم چۆن کاری پێدەکەن. زانی زۆرم حەز لە فێربوونی زانستە، ئەویش پێی خۆش بوو یارمەتیم بدات. با بزانین چۆن دەبێ. زۆریش لەسەر کار و کرداری لوورەکان خەریکی لێکۆڵینەوە بووین. دۆزینەوەی سەرچاوە و نیشانەی سەرچاوە، زۆر بۆ ئێمە دژوار بوو، بە دوای پرسێکی زۆردا، بۆمان ڕوون بووەوە کە نیشانەی سەرچاوە "ن"یە، ئەویش بە کۆتایی فێعلەوە دەنووسێ، واتە پاشگرە. هەر وەك زمانی کوردی. ئەوان چون خەوتن، ئێمەش جێمان ڕاخست. هەر وەك شەوی ڕابردوو پیاوێك، کەپەنکی دا بەخۆیدا و لە چادرەکەی ئێمە خەوت. دەنگی سەگوەڕ و هێهێی شوان دەهاتە گوێ، بۆ ترساندنی گورگ و دڕندەی کێوی. چرامان کوژاندەوە و خەوتین، بەڵام خۆ سەگوەڕ نەیدەهێشت چاومان بچێتە خەو. وەختێ خزاینە ژێر پێخەفەوە، لە ترسی ئەوەی نەکا سەگ پێڵاوەکانم ببات، هەڵمگرتن لەژێر سەرم دایاننێم، کابرای بەختیاری ئاگای لێبوو، نەیهێشت ئەو کارە بکەم. دەیگوت: باوەڕمان وایە، ئەگەر وەختی خەوتن پێڵاو لە پشت سەرت دانێی، خەونی ئاڵۆز دەبینی. کڵاشەکانی لێوەرگرتم، لە بن لاقمەوە خستیە ژێر دۆشەگەکە. خێوەتەکەمان کونبڕ کردبوو، لە هیچ لایەکەوە با، نەیاتە ژووری، کەچی لە بنەوە هەر دەهات. بەختیاریم تێگەیان، ئەستووندەکی تاوڵەکە بەرێتە پێشێ، بۆ ئەوەی چادرەکە بنیشێتە سەر زەوی و با نەیێتە ژووری. سوپاسی کردین و گوتی، نایەوێ. پێی وابوو، مەبەستم خۆیەتی. منیش هیچم نەگوت. بەم کزەبایە وەڕەز بووم، بەڵام چارەم نەبوو.

## دووشەمە، ٥ی جۆزەردان

بەیانی بە دەنگی سەگوەڕ و سەمفۆنیای کاڕەی مێگەل وەئاگا هاتین، بەیانی زووتر لە خەوهەستاین، شەوێ باش نەخەوتبووم گوتم، سەرمام بوو. بەرقلیانیش، نان و ماست و ڕۆنەکەرە بوو بە خواردنمان. بڕیار وابوو، بچین بۆچلگرد، دەبوو جەعفەرقوولی دەنگ و باسی هۆزەکەی ببات بۆ شاریکورد و ئەسفەهان، بە ئێمەی گوت، لە چلگرد بمێنینەوە، تاکو ئەو دەگەڕێتەوە. پێشنیازەکەی ئەوم بە دڵ بوو. حەزم دەکرد زۆرتر لەگەڵ خەڵك ئاشنا بم، ئێرە و ئەوێ ببینم. ڕۆیشتن بە شوێن یەکسمەکاندا، ئەوانیش لە بژوێنێ دەلەوەڕین. هەر چۆنێك بوو، توانیان بە زەبری کەمەند دوو هێستر و ماینێك بگرن، هەر

سێیان زین کردن. دیگار چاو پڕ لە ئەرجوو، بزە لەسەر لێو تەماشای کردم، سواری ماین بوو. هێسترەکان وەبەر من و جەعفەرقوولی کەوتن. دوو کەس لە نۆکەرەکان، شان بە شانی ئێمە بە ڕاکردن دەهاتن. بۆ ئەوەی چارەوێکان لە چلگردەوە لەگەڵ خۆیان بێننەوە. نەرم نەرم، بە کێوەکاندا دەهاتینەخوارێ. پیاوێکی بەختیاری لە خوار گوندەکەوە، بە سواری ئەسپ پێمان گەیشت، لە نێوڕێدا جەعفەرقوولی پێی ناساندم. پیاوێکی ماقووڵ و قسەزان بوو. بە دەم قسەکردنەوە درێژەمان دا بە سەفەری خۆمان. هەر وەك باقی خەڵکەکە، گلەیی، لە خراپیی ڕێگەوبانی شاریکورد و چلگرد بوو. لەبەر خراپیی ڕێگەکە نە مامۆستایەك، نە بەیتاڵێك ڕوو ناکەنە ئاوەدانی، مەڕ و مالأت نەخۆشن و خەڵکەکەش نەخوێندەوارن. باسی مەڕدار و بێ مەڕی عەشایری دەکرد. دەیگوت، زۆرباش دەبوو ئەگەر بەختیاری ئاژەڵدار لە بەختیاری بێ ئاژەڵ جوێ بکەنەوە. ئەوانەی مەڕ و مالأتیان نییە، ماڵیان بۆ ساز بکەن. مەڕدارەکانیش، هەر وەك خێڵەکی وەمێنن. باوەڕی وا بوو، ئەوانەی ناچنە هەوارێ، خەریکی کارێکی دیکە دەبن و باری ئابووری و کشتوکاڵ ڕوو لە باشی دەکات. گلەیی دەکرد، بۆچی دەبێ خەتای برا لەسەر برا بنووسن؟ مەبەستی لە تەیموور بەختیار بوو. بۆچی دەوڵەت بە سەرنجەوە ڕوو ناکاتە ناوچەی بەختیاری و زۆر دەردە دڵی دیکەش" جانتای پڕ بوو لە خەفەت!

بەدەم قسەوباسەوە گەیشتینە چلگرد. دیگار و جەعفەرقوولی پێش ئێمە لەوێ بوون، لەبەر دەرگەی چایخانەکە دانیشتبوون. دەنگی خۆشی "سووسەن" لە بلندگۆکەوە دەهاتە گوێ. گۆرانییەکانی ئەو خانمە فارسە لە گوند و شار ئاشقانی خۆی پەیدا کردبوو. لەو ناوچەیەدا گرامافۆنێکی ترانزیستوری لە نانی شەو گرینگترە" بازاڕ خۆشییەکەی بۆ فرۆشیارانی ئێرانی و بیانییە. تازە چایەکمان خواردبووەوە، بەختیارییەکان لە جەعفەرقوولی کۆ بوونەوە" دیسان شکایەت و گلەوگازندە، دزی و نێوان ناخۆشی لەگەڵ هاوماڵ.

جەعفەرقوولی چوو سەردانێکی پاسگە بکات. وەختێ گەڕایەوە گوتی: پاسگە بەبێسیم پێوەندیی گرتووە، ئەوان هەواڵی هاتنی ئێوەیان نییە بۆ ئەم ناوچەیە. دیگار ئەم خەبەرەی پێناخۆش بوو. پێمگوت نیگەران نەبێ، هەستام بەنێو چلگرددا گەڕام. بە ڕێکەوت تووشی سەرۆکی پاسگە هاتم، گوتم شتێکی ئاوایان گوتووە، گوتی: زۆر گرینگ نییە، ڕەنگە نامەی هاتنی ئێوە، لە ڕێگەی پۆستەوە بە ئێمە بگات. ئەمەش چەند

ڕۆژێك دەبات. ئێوە خەریکی کاروباری خۆتان بن. گەڕامەوە و ئەم هەواڵەشم گەیاندە دیگار. نانی نیوەڕۆ، هەر لەو چایخانەیە میوانی بەختیارییەکان بووین. نان و ماست و دۆیان لە ماڵێوە هێنابوو، گۆشتاوەکەش قاوەچی لێی نابوو. خوانێکی قەڵەمکارییان ڕاخست" درێژ و باریك، دەوراندەوری خوانەکە نووسرابوو: "شوکرانەی ڕۆزی زۆر دێنێ، ناشوکری بکەی نانت نامێنێ". بۆ دیگارم خوێندەوە و زۆری پێ خۆش بوو. وەختێ نانمان خوارد، دیسان جەعفەرقوولی چوو بەلای کاری خۆیەوە.

پاڵم دابوو بە دیواری چایخانەکەوە، گوێم بۆ قسەی ئەو خەڵکە ڕاگرتبوو. هەموویان باسیان لەوە دەکرد، ڕێگەچارەیەك بۆ لەوەڕگەکان وەدۆزن. پێشتر لەمەڕ لەوەڕگەوە گرفتێك لە گۆڕێدا نەبوو لەنێو هۆزەکاندا، بەڵام ئێستە بە هۆی گەلاڵەی گشتییەوە بارودۆخەکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە. یەکێك دەیگوت، هەر کەسە و بەقەدەر مەڕ و ماڵاتەکەی لەوەڕگەی وەبەر دەکەوێت. دەیگوت: ئەو کەسەی پێنج سەری مەڕ هەیە، پێنج ڕۆژ دەتوانێ ماڵاتەکەی بەرێتە لەوەڕگە، ئەو کەسەی ٥٠ سەری مەڕ هەیە ٥٠ ڕۆژ بمێنێتەوە. من لە مەبەستی حاڵی نەبووم! یەکی تر دەیگوت، باش وایە لەوەڕگەی خەڵکی ئاوایی دیاری بکرێت، ئێلاتیش هەروەتر. کەسێکی دیکە گوتی، هەر کەسە و بە ئەندازەی مێگەلەکەی لەوەڕگەی وەبەر دەکەوێت، کە تایبەت بە خۆی بێت. چۆنی بەش دەکات کەیفی خۆیەتی، ئیتر مەڕدارێکی تر نەتوانێ توخنی بکەوێ. ئەو کەسەش بۆی نییە لەوەڕەکە بدووری. بۆ ئەم کارەش دەبێ چەند کەسێك چاوەدێر بن. کەس نەتوانێ گیایەکە بفرۆشێت. تەنیا بۆ لەوەڕی دانێن. هەر ئەو دەمە لەگەڵ بەیتاڵی هۆزی بابادی بووین بە ئاشنا. دەیگوت، هەمیشە لەگەڵ ڕەوەندانە. گەرمێن و کوێستان دەکات. باوەڕی وابوو، مەڕ و ماڵاتی بەختیارییەکان، لە بابەت شیر و خورییەوە بەنامیەن. خوری و بەرگنی ئەوان، لە ئێراندا لە پلەی سێیەمدایە. مەڕی مەشەد واتە قەرەگۆل، پلەی یەکەمی هەیە لە ئێراندا. جەعفەرقوولی ئێمەی دا دەست چایچی. ئێمەش کەوتینە ڕێ بە چلگرددا بگەڕێین.

چلگرد شوێنێکی ناخۆش نییە" ماڵەکانی هەمووی لە بەرد و قوڕن، سەربانیان بە قوڕ سواخ دراوە، هەموو ماڵێك گوێسوانە و پاساری هەیە. ئەمەش ڕێگە لە تەڕبوونی دیواران دەگرێ. هەر کوچە و شەقامێك دەبینی دووکان و بازاڕە. چلگرد شوێنی

کۆبوونەوەی بەختیارییەکانە. تەواوی پێداویستیی خۆیان لەو شوێنە جێبەجێ دەکەن. هەر دووکانێك لە ژوورەوە، سەکۆیەکی تێدایە سی سانت لە تەرکی دووکانەکە بەرزترە و فەرشی لەسەر ڕاخراوە. دووکانەکان جگە لەوەی شوێنی سات و سەودایە، وەك چەقەخانەی مزگەوتان، جێی باس و قسە و کردنەوەی گرێ کوێرەی گرفتەکانیشە. ڕەئیس پاسگە، لە یەکێ لە دووکانەکان، خەریکی حەلکردنی کێشەی چەند کەسێك بوو. لەگەڵ دووکاندارێکی چلگردی، قسەمان کرد لە سەرەتای بەهاردا ئێلاتی کە دەچنە دەڤەری کوهڕەنگ، زۆرتر ئارد و قەند و برنج و چایی و جگەرە دەکڕن. لە پایزدا وەختێ کۆچ بەرەو خوار دەبێتەوە، کوتاڵ و پێڵاو دەکڕن. ئەو چلگردە، زستانان چل ماڵ دەبێ، بەڵام هاوینان، نێزیکەی چوار هەزار ماڵ لە خۆی دەگرێ. لە سەرەتای پایزەوە، تا بەهار دێت چۆڵ دەبێ. دیسان ژیانی ئاسایی خۆی دەست پێدەکاتەوە" شارۆچکەوان، پاسگەی ژاندارمەری، قوتابخانەی ٦ پۆلی و گەرماویان هەیە" چلگرد، نێزیکەی ٢٠٠ دووکانی تێدایە. لە ساڵدا ٦ مانگ کار دەکەن و مابەقی داخراون" دووکاندارەکان بۆ ٦ مانگ دووکان دەگرن، چایچی بۆ ٦ مانگ ١٤٠٠ تمەن پارەی دابوو، بەرگ دروو بۆ ٦ مانگ ٢٨٠ تمەن" دەچووینە بەردەم هەر دووکانێك هەر شتێکمان بدیبایە ناومان دەپرسی و دەماننووسی، زۆرتر ئامانجمان ئەوە بوو خەڵکەکە بدوێنین" گەیشتینە دووکانی ئەنوەری، ئەویش لەوسەری بازاڕەکە ڕووبەڕووی بانکی میلی بوو، چاکوچۆنیمان لەگەڵ کرد و پاتۆڵێکی بەختیاریی بۆ دورین" ئەنوەری گوتی، پاتۆڵەکە بە جێگەی دۆخین سێ کێشی تێدەخا. بۆ ئەوەی گوێ لە قسەی ئەو خەڵکە ڕابگرین و وچانێك بگرین، دەبوو من لەو دووکانە پاتۆێڵك بە دوورین بدەم.

لەگەڵ ئەنوەری بە پیاسەکردن لە چلگرد چووینەدەرێ بۆ نێزیك پاسگە و داڵانی تونێڵ کوهڕەنگ. هەر ئەو داڵانەی ئاوی کوهڕەنگ دەڕژێنێتە ڕووباری زایندەڕوودەوە" سەرمان لە تاوڵی ئاسنگەرێك هەڵێنا، ئەوان پێیان دەگوت "غوربەت" بە ڕووی خۆشەوە وەریگرتین و، بە پەلەپڕوزێ چایی بۆ ساز کردین. هەموویان کۆ ببوونەوە، باسی کاری غوربەتیان دەکرد. لە دووکانی ئەنوەری گوتبوویان، لەگەڵ غوربەت، ژن و ژنخوازی ناکەن! بەڵام ئەوەیان لە بەختیارییەکان ژنی هێنابوو. بۆ ئەوەی لەم پرسە حاڵی بم، چاوم لەچاوی ئەنوەری بڕێ، سەری هەڵبڕی و بە گوێیدا چپاندم، ژنێکی بێکەسوکار بووە!

تەواوی ئەو کەلوپەلەی بەردەستی خۆی سازی کردبوو، یەك بە یەك هەموویی نیشانی داین، چەند وێنەیەکمان لێ هەڵگرتن و ماڵئاواییمان لێکرد.

لە نیۆرێدا تووشی کاك "مەهدی فەرامەرزی" هاتین، خولکی کردین بچینە تاولەکەی" کاك مەهدی پیاوێکی ژیر و وریایە، هەمەکارەی چلگردە، سەرۆکی ئەنجوومەنە، بەڕێوەبەری خانەی ئەسنافە، کارمەندی ئیدارەی ئاوی دالانی کوهرەنگە و ... چادرەکەی لەسەر کێوەکە بوو، ڕووبەڕووی چلگرد، بەسەر ئاواییدا دەڕوانی. خێوەتەکانیان، زۆرتر لە١٤ تا ٢٤ بەشی چل سانتی ساز ببوو. هەر یەك لەو تەختانە پێیان دەگوت لەت" بە تەواوی چادرەکەیان دەگوت "بوهۆن"، بەشی دواوەی خێوەتەکە تەختەیەك، دوو تەختەی زیاتری هەیە، هەمیشە وای هەڵدەدەن ئاودانەدا، بەشی دواوەی سەرەوخواریی زۆرترە و بە عەرزەوە نووساوە، بەشی پێشەوەی هەر وەك بەرهەیوان دەچێ" ڕەشماڵەکان ژنان لە مووی بزن سازی دەکەن. مووی بزنەکان قەت نابڕنەوە، لەبەرئەوەی سرووشتی بزن ساردە و زوو هەڵدەوەرێ، تەنیا نێری دەبڕنەوە، چونکە ئەوان بە سەربڕخانە دەفرۆشن. ڕەشماڵەکان بەشی زۆر دەکەن، هیچ وەختێ خۆی ناخواتەوە، خێرا نادڕێت، ئاو دانادات، سەرما و گەرما کاری تێ ناکات، هیچ عەیبێکی نییە، ئەوەندە نەبێ زۆرقورسە. چنینی خێوەتی ڕەشماڵ زۆر سادە و ساکار نییە، وەختێ بیبینم باسی ئەویش دەنووسم. کاك مەهدی لەگەڵ براکانی بە یەکەوەن، هەریەکە و تاوڵی خۆی هەیە و ماڵێکی قوڕ و بەرد لە چلگرد. ئەوانیش هەمیشە لە چلگرد دادەنیشن. خەڵووز و مەنقەڵ گەشاوە و چایی ئامادە بوو، هەڵامەتم گرتبوو، ئاوی لوگوتم ڕانەدەوەستا. شێومان کرد و خەوتین. دیسانیش سەگوەڕ نەیهێشت بخەوین.

## سێشەمە ٦ی جۆزەردان

بەیانی دەمژمێر: پێنج و نیو تیشکی هەتاو چەقییە چاومانەوە، هەردووکمان بە یەکەوە لە خەو هەستاین، ویستمان خۆمان بکەینە خەو، کاك فەرامەرز بەیانی باشی پێ گوتین، ناچار ڕاست بووینەوە و جێوبانمان کۆ کردەوە، نانی بەیانی سەرشیر و شیر و پەنیرمان خوارد“ سەبارەت بە سیاسەت و وڵات و ئاغاکان قسەمان کرد، تەنیا کاتتێپەڕکردن بوو، بە کێوەکەدا هاتینە خوارێ و خۆمان خزاندە نێودێ. کراسێکی جووتگیرفانم کڕی و خۆم کرد بە گەرماوەکەدا“ گەرماو، دیواری بەینی هۆدەکاتنی نزم بوون، هەر لەسەر دیوارەکەوە لەگەڵ دیگار، شامپۆ و سابوونمان دەگۆڕییەوە. هاتینەوە بۆ دووکانی ئەنوەری، قەولمان وابوو سەردانێکی تاوڵی ژەنیارە ئێلاتییەکان بکەین“ "تووشماڵ"، ئەم دووکانە لە ڕاستیدا جێی حەلکردنی گرفتەکانی ئەو خەڵکەیە. کەسێك نامەیەکی نووسی، باسی مەڕدزین و شاردنەوەیانی کردبوو، کەسێکیش وەك شاهید بۆی واژۆ کرد و، کاك فەرامەرز خەت و نیشانی بۆ دانا. دیگارم حاڵی کرد هەستین بڕۆین، لەگەڵ هەستانی ئێمە ئەنوەری گوتی، بۆکوێ؟ گوتم، حەز دەکەم سەرێك لە تووشماڵەکان بدەین، ئەویش لەگەڵ چەند کەسێك بوون بە هاوڕێمان، چەند تاوڵێك بە پاڵ یەکەوە بوون، گەیشتینە یەکەم خێوەت و بەدەم سەلامکردنەوە خۆمان کرد بە ژووریدا.

ئای ئەم ڕەچەڵەکە کوردانە لە چاییسازکردن چەندە ئازان، کوچکاورێك لە بەردەم چادرەکان بوو، خێرا ئاگریان کردەوە و کترییەڕەشەیان وەسەرنا، وەختێ ئاو کەوتە قوڵتەقوڵت، لە چادانی چینیدا چاییان دەم کرد. هەر بە ئاوی کترییەکە ئاوێکیان لە پیاڵە و ئیستیکان وەردا، یانی شوشتیان و چایان لە بەردەم داناین، هەر وەك ندیوبدی سەیری دەوروبەری خۆم دەکرد. بەشی دواوەی چادرەکەیان بە بەرد هەڵچنیبوو، پێیان دەگوت، "چۆل" ـــــهەرزاڵە کوردییەکەی خۆمانـــــ. چل سانتی مەتر بەرز بوو، لێفە و نوێن و تێڕ و توربێنیان لەسەر هەڵچنیبوو. بەڕەیەکی لاکێشیان بەسەردا دابوون، بە دیوی ئاوەژوودا، پرسیم بۆ ئاوایە؟ گوتیان، هەمیشە هەروا دایدەپۆشین. لانکەیەك لە نێوەڕاستی چادرەکەدا بوو، منداڵێکی تێدا خەوتبوو، بە چارشێونوێنێك داپۆشرابوو، گوریسێکی ٦ سانتیی ڕەش و سپییان لەمسەر و ئەوسەری ئەستووندکی تاوڵەکە

بەستبوو، ئەمیشیان بە زەنگوڵە و گوڵێنگی زەرد و سوور ڕازاندبووەوە، واتە ئەمەش بۆ جوانی ژوورەکە بوو، گوریسەکەش دەستکاری ژنانی ئێلاتی بوو. ئافرەتێك پاڵی دابوو بە ئەستووندێکی چادرەکەوە، چنگێك خوریی سپی لە کۆشدا بوو، ئەوەی دەکردە هۆرپە و بە تەشی هەڵێدەپێچا، کراسێکی گەنم ڕەنگی دەبەردابوو، تاسکڵاوێکی کردبووە سەری، پێشی کڵاوەکە بە خشڵ ڕازابووەوە. ژنە بەو کڵاوەی دەگوت "لەچك"، کڵاوەکەش بە ژێرچەنەیەك بە سەرییەوە گیربببوو. سەردەسماڵێکی دابوو بەسەر کڵاوەکەدا، بە دەرزیلەیەك ئەویشی لەژێر چەناگەی قایم کردبوو. بەو سەردەسماڵەی دەگوت "مینا"، ئەمەشیان بە متوموورووو و گوڵێنگی ورد ڕازابووەوە، کە تەواو سەرشانەکانی داپۆشیبوو. ژنی تووشماڵ گوتی، ئەو مینایەی دەیدەن بەسەر سەر و شاندا، چوار مەترە و قوماشەکەی تۆڕێکی ناسکە. لێم پرسی، ئەو مینایە بە شتێکی تر نابەستی؟ لە وەڵامدا گوتی، نا، مەگین لە کاتی کارکردندا، یان وەختی تازیەباری، "کولوت"ی لەسەر ببەستین، ئەویش دەسماڵێکی چوار گۆشەی ڕەشە، لە هەردوولاوە قەدی دەکەین، چوار قامك پانە، پانییەکەی دەکەوێتە تەختی نێوچاوانەوە و لکەکانی لە پشت سەرمان بە گرێدراوی شۆڕ دەبنەوە. ئینجا تێگەیشتم، وەختێ کەسێك بمرێ، یان کەسێکی ناوبەدەرەوەی عەشیرەتەکە، ئەو تووشماڵانە لە نان و دۆ دەکەون. تا ئەو ڕۆژەی پرسە و سەرەخۆشی تەواو نەبێ و جلکی ڕەش دانەنێن، ئەوانیش نانبڕاو دەبن. دەست نابەن بۆ دەهۆڵ و زوڕنا" تەنانەت بۆ هیچ لایەکیش ناچن، قسەی ئەوەمان نییە کەسێك بمرێ و بۆ ناشتنەکەی پێیان بڵێن بچن بۆ مۆسیقاژەنین، بە ئەمەش دەڵێن (سازی تازیە و چەمەری) تووشماڵەکە گوتی: ئەوە چوار مانگە سازەکانمان دەنگیان لێوە نەهاتووە. داوامان لێکرد سازەکانی بۆ هێنایین و، ئەندازەمان گرتن و وێنەمان لێهەڵگرتن. "کەڕەنا"مان بینی، لە سێ بەش پێك هاتبوو" "نێ میل" لە جنسی نەی، دەنگی دێت، درێژی ١٣ مەترە، نێزیکەی ٣ سانتی دەچێ بە دەمدا. "دەستەی کەڕنا" لە دارسانتی سازکراوە و ٣٣ سانت درێژە، ٧ کونی لە سەرەوە هەیە و کونێك لە بنەوە. سەری کەڕەنا، لە کانزای زەردە، لە چەشنی ڕەحەتیە، ٤٥ سانتی مەترە. سازی چکۆلە، لە دار چێ کرابوو، پیکی ئەو سازە ٦ سانتی مەترە، ٣٦ سانتی مەتر درێژایی دارەکەیەتی. ئەویش حەوت کونی هەیە، کونێك لە پشتەوە. دواتر دەهۆڵی نیشان

داین، ئەویش لە دار سازکرابوو، ١٥ سانت پانە، قوولایی نێزیکەی ٥٠ سانتی مەترە، هەردوو دیوی بە پێستە داپۆشرابوو. بە شریتێك لە ملی دەکرد، لەسەر سنگ و زگی ڕادەوەستا. بە دەستی ڕاست بە قوڵەگۆچانی ٣٨ سانتی دەیکوتا و بە دەستی چەپ، بە شووڵێکی چل سانتی لێی دەدا. دەستی چەپ، هەمیشە لەسەر لێواری دەهۆڵ ڕاوەستاوە، قامکەکانی شووڵەکە دەجووڵێنیٚ. داوامان لێکرد دەهۆڵمان بۆ لێبدا، چەند وێنەیەکی لێبگرین. بە نیشانەی ڕوخسەت وەرگرتن، چاوێکی لە ئەنوەری کرد، گوتی بە قسەیان بکە، ئێمەش بۆ ڕێکوپێکیی کارەکەمان، وێنەمان لیٚ هەڵگرت.

تووشماڵەکان بەختیارین، وەکو لوورێك قبووڵیان کردوون، بەڵام ژنیان پێنادەن و ژنیشیان لیٚ ناخوازن. دەڵێن کەسپەکەیان حەرامە، "نانی فوو" دەخۆن. تووشماڵەکان هەر لەنێو خۆیاندا ژن و ژنخوازی دەکەن. تەنیا پیاوان خەریکی ئەو کارەن، ژنیان نە گۆرانی دەڵیٚ، نە مۆسیقا دەژەنیٚ. خەریکی ماڵداری خۆیەتی. ئەم گۆرانیبێژە هەژارانە هیچ کار و داهاتێکی دیکەیان نییە. ئەنوەری، بەبیٚ پەردە پێی گوتم، بە چاوی سووك سەیریان دەکەن و ژنیان نادەنیٚ. تووشماڵەکانیش بەم قسەیە عاجز نەبوون. زانیمان تووشماڵەکان و تەختکێشەکان لووڕن، بەڵام غوربەت و دەلاك و هەلاج بەختیاری نین. تەنیا لووڕێك ئامادە نییە فێری ئەم پیشەیە بێت.

پیرێژنێکی سەرتاپا ڕەش هات لەویٚ دانیشت و ملی نا لە تەشیڕستن. لێم پرسی، بۆ ڕەشت لە بەر کردووە؟ گوتی: تەواوی ژنەکانی ئێلاتی کە تەمەنیان بچێتە ٣٥ یان چل ساڵ، جلوبەرگی ڕەش دەبەر دەکەن. ڕوومەتەکانی بە خاڵ کوتابوو، پرسیم، ئەمە بۆچی؟ گوتی، ئەمەیان بۆجوانییە و لە گەنجیدا کوتاومە. زۆرجاریش بۆ لابردنی ژانی جەستە، کەشکەژنۆی لاقیش دەکوتن. ئەم کارەش زۆرتر لەنێو تووشماڵ و غوربەتدا باوە، ژنانی لووڕ کەم وا هەیە خاڵ بکوتن. ویستم چەند وێنەیەکی ژنەکان بگرم، ڕازی نەبوون. ئێمەش لەسەر دڵی ئەوان بووین، ئەوەندەیان، چایی دەرخوارددابوین، خەریك بوو بکەوینە سەر ئاو! ماڵئاواییمان لیٚ خواستن و بەجێمان هێشتن. وەختیٚ بە بەر دووکانی غوربەتیدا تێدەپەڕین، خێرا ئەو شتانەی سازی کردبوون هێنای و نیشانی داین، زنجیرێك بوو هەردوو دەستی ئەسپ و هێستری پێدەبەستەوە، بۆ ئەوەی نەتوانیٚ ڕابکات، یان دز بیرفێنیٚ، کەرکیتی مافوورەکردن، گوڵمیخی تەویلە و زۆر شتی دیکەش. وێنەمان لێگرتن.

وەختێ بەجێمان دەهێشتن، زۆریان هەوڵ دا میوانیان بین بە قسەمان نەکردن. نانی نیوەڕۆ میوانی ئەنوەری بووین. قەول وابوو جلوبەرگی دێرینی لووڕەکانمان نیشان بدات. لەگەڵی چووینەوە ماڵێ، ئەم بەختیارییە، وەختی خۆی خێوەتنشین بووە، ژوورەکەی پڕ بوو لە وێنەی خزم و کەس و ئێل و عەشیرەت. بە ڕەنگی جوانەوە، مینیاتۆری لاواز لەسەر هەور، پەردەی ڕەنگین، پێشتر باسی کلاوێکی لبادی بۆ کردبووم، ویستم ببیبنم، وتی ئەو کلاوە، تایبەت بە ئاغاواتە، هەستا دەرگەی سندوقی کردەوە، کەوایەکی بەختیاری قەدیمی نیشان دام، ئەو کەوایە ئاتەگی تا خوار ئەژنۆ دەهات، سەوزێکی تۆخ بوو، بەرەکەی سپی بوو. قۆڵی درێژ و هەراو، سەردەستەکانی درزێکی گەورەی تێدا بوو، لەگەڵ بن باغەڵەکانی. کەلەکەی چیندار بوو، پێشی کەواکە چۆخەیی بەبێ دوگمە بوو. هەر وەك کوردەواری پشتێنی لەسەر دەبەستن. قەولی دا سەرتاپا جلوبەرگی بەختیاری بکاتە بەری و وێنەیەکی جوانی لێبگرین. لە نیشاندانی هەموویان خۆی دەپاراست. گورێسێکیان لەم سەر بۆ ئەو سەری هۆدەکە ڕایەڵ کردبوو، گوڵێنگ و زەنگوڵەی زۆری پێوە بوو، گوتی: "ئێمە بەمە دەڵێین، (شیردەنگ)، ئەمەش بۆچاوەزار باشە، لە تاوڵەکانیشدا هەڵیدەواسن." من ئەوەم لە تاوڵی تووشماڵەکان دیبوو، پێم وابوو تەنیا تایبەتە بە ئەوان. گوتی: بەم شیردەنگەدا، ئەسپەندەر، جگ و مووی گورگ، دەستی گورگ، ڕدێنی نێرییە کێوی، خوێی بلوورین هەڵدەواسن. دەستی گورگ بە لانکەی منداڵێشدا بۆدەرکردنی بەلا هەڵدەواسن. بۆ ئەوەی ئەوانگەل توخنی نەکەون. باوەڕیان وایە، ئەو کەسەی جارێك گورگی کوشتبێ، پشتێنەکەی لە پشتی ئەو ژنە ببەستن کە بە منداڵەوەیە، زوو لێدەبێتەوە و نەجاتی دەبێ. ئەگەر تووکی کەروێشك لەژێر سەری منداڵ دانێن خەوی خۆش دەبێ. جگە لەوەش، باوەڕیان وایە، تووکی کەروێشك بنێنە سەر برین، زوو چاك دەبێتەوە و چڵك ناکات.

پێم سەیر بوو ئەنوەری بەبێ ئەوەی لێی بپرسم ئەم هەموو شتەی پێ گوتین. نانی نیوەڕۆمان خوارد، هەلامەتەکەم زۆری بۆ هێنام، ئاوی لوتم گوتم ڕاوەستانی نەبوو، ناچار خۆم خزاندە جێوبانەوە و نووستم، لەرز و تام گرتبوو. تەواو دەمژمێرێك خەوم لێکەوت، هەڵیان ساندم.

چووین بۆ دووکانی ئەنوەری، لەسەر ڕێگە چووینە دووکانێکی کڵاوسازی. وەستا، پیاوێکی سەر و ڕووخۆش بوو، ئێمەش بە قازانجی کاری خۆمان زۆرمان کات گرت، هەرچیمان لێپرسی، بە ڕووی خۆشەوە وەڵامی داینەوە“ دەیگوت، ئەم کڵاوانە هەمووی لە کوڵکەی بزن ساز دەکات، خەڵکی شاریکورد بوو، هاوینانە دەهاتە چلگرد، خەریکی پیشەکەی خۆی بوو، دەیگوت: کوڵکەی بزن کیلۆی بە ١٥ تمەن لە ئێلاتی دەکڕین، بە کەوانی هەلاجی ئامادەی دەکەین یان دەیدەین بە کارخانە بۆمان دەکاتەوە. زۆرتر دەیدەین بە کارخانە بۆمان شی دەکاتەوە. وەختێ تەواو شی بۆوە، بە کەرەستەی "کوڵکە بڕ" وردی دەکەین، ئەگەر تەواو ورد نەبێ، کڵاوەکە جوان دەرنایات، هەڵدەوەرێ“ لە ساجێکدا بە ئاو و سابوون دەیسوونەوە، لەسەر کوانوو گەرمی دەکەن، دەوری ئەو کوانووە دە سانتی مەترە و لە دوو قوڵەوە هەڵمەکەی دەچێتە دەرێ. ئەم شوێنەش پێی دەڵێن، "جاتوە".

وەستای کڵاو هەمیشە لەسەر دۆشەکێگ دانیشتووە، سەرقاڵی ئیشەکەیەتی. شانەیەکی بە دەستەوەیە و خەریکی تیفتیفەدانی کڵاوەکانییەتی. وەختێ کاری سەرەتایی کۆتایی هات، لە قالبی دەدەن. ئەو قالبە لە دار چێ کراوە. بەکڵاوی لە قالبدراو دەڵێن "ئەنگارە"“ ئەنگارەکان لە دەفرێکدا بە ئاوی توێکڵی هەنارەوە دەکوڵێنن، بۆ ئەوەی ڕەنگی سوورگوێز بێت، بۆ کڵاوی ڕەش زاخی قاڵکراو دەکەنە ئاوەکەوە. لێواری کڵاوەکە بە مقەست دەبڕن تاکو ساف و لووس بێت. بۆ شیکردنەوەی کوڵکە و بەرگن کەڵك لە کەوان و ژێ وەردەگرن.

وەستای کڵاومالّ پێی گوتین: چەند جۆر کڵاو دروست دەکات، دانە دانە هەموویانی نیشان داین“ "شەوکڵاو" ڕەنگیان سوورگوێزی کاڵە، سەریان وەك گومبەدی وایە، ئەم کڵاوانە زۆرتر مێرمنداڵان یان خەڵکی ڕەش و ڕووت لە سەری دەکەن“ "کڵاوی خەسرەوی" ئەمانەش سەریان تەختە و زارکیان تەنگ و ڕەنگیان ڕەشە، هەر لە شێوەی ئەوانەش، ڕەنگیان سپییە و تایبەتە بە خان و ئاغاکان، ئێستە باوی نەماوە، تەنیا کڵاوی خەسرەوی لە قاڵب دەدەن، بۆ ئەوەی سەری تەخت بێ. ئەگەر شەوکڵاو لە باری درێژایی بنوشتێنینەوە، وەك ئەو کاتە وایە کە دروستی دەکات، دیوی ژوورەوەشی بە یەکەوە نانووسێ. هەر جارەی لەبارێك دەینووشتێنێتەوە، گوتم: "ڕۆژی چەند کڵاو

سازدەکەی؟"، گوتی: "نێزیکەی چوار تاپێنج دانە" خراپ نییە ڕۆژی چوار پێنج کڵاو دەکەیە سەری خەڵکی! پێکەنی و گوتی: "ئەمەیان تاوانی من نییە، ئەوان پارەم پێدەدەن کڵاویان بنێمە سەر". زۆر کارجوان بوو، بە ڕووخۆشی ڕەوانەی کردین. لەسەر ڕێگەکەمان، تووشی کڵاشچنێك هاتین، ئەویش خەڵکی شاریکورد بوو، سەری کڵاشەکە خەڵك بۆیان دەچنێ، بنەکەشی کەسێکی دیکە، ئەم وەستایەش سەروبنی لێك دەدان. بڕیارمان دا دواتر سەردانی بکەین. تەواو وەڕەز و برسی بووم، خۆمان کرد بە چێشتخانەیکدا گۆشتاوێکمان خوارد. ئەنجوومەنی ئاوایی کۆبوونەوەی هەبوو، کاروبار تەختە کرا، هەموو کەس ڕوویی لە چاییخانە دەکرد، بوو بە کەس لە کەس. بەداخەوە ئێمەش هیچمان بۆ نەکرا. هەموویان بەجێیان هێشتین، هەر خۆمانماینەوە. لەنێو قسەکانیاندا ئاگام لێبوو بۆ قەبوڵکردنی وتەکانیان خێراخێرا سوێندیان بە دار و بەرد دەخوارد. گوتم بۆچی؟ گوتیان: بۆ ئەوەی زۆر بە قورئان سوێند نەخۆین، سوێند بە دار و بەرد دەخۆین، بەڵام لە جێی خۆیدا قەسەم بە قورئان دەخۆین.

وردە وردە خەریك بوو تاریك دادەهات. دەتگوت خەمی دنیا لەسەر دڵی من بارە. دیگار، سێکوچکە دانیشتبوو، سەری کردبووە سەر ئەژنۆی دەستی هەڵپێکابوو. مات و مەلوول دەتگوت بابی مردووە. لە پڕ سەری بەرز کردەوە و گوتی، بەیانی سەرێك لە "کاك فەرامەرز" هەڵدەهێنین، گوتم باشە. فەرامەرز، سەرئێلی هۆزی بابا ئەحمەدییە. ئەوان پێی دەڵێن، "بامدی". هەر چۆنێك بوو، دەبوو ئەو شەوە بۆ خەوتن لە قاوەخانە وەمێنین. لەسەر سەکۆی قاوەخانە دووجێیان بۆ ڕاخستین و ڕاکشاین. تەواوی لەشم کەوتبووە خورو، دەتگوت کێچ دەکەوڵم کەوتووە. نەمدەزانی چی بووە، ئیتر هەتا نیوەشەو خەوم لێنەکەوت.

## چوارشەمە ٧ جۆزەردان

بەیانی زوو وەخەبەر هاتم، بەڵام هێندە ئەمدیواودیوم کرد دەمژمێر بوو بە ٧، گوتیان ئەم شەو بوومەلەرزە هاتووە، خەڵکەکە هەموو هاتوونە دەرێ و سلاّواتیان لێداوە. ئێمە هەر نەمانزانیوە. لە جێوبان هاتینە دەرێ، لە چایخانە نانی بەیانیمان بە کەرە و پەنیرەوە خوارد، لەنێو خێلاّتی پەنیرمان نەخواردوە، وادیارە سازی ناکەن.

وەڕێکەوتین بۆ لای دالاّنی کوهڕەنگ، لە پشت پاسگەکەوەیە و ڕێگەی ماشێن و سەیارەی هەیە. لە چلگردەوە مەعلوومە، گڵەکەیان هەڵداوەتەوە، سەرنووکی تەپکەکە تەخت کراوە بۆ سەیرانی خەڵکی. وختێ گەیشتین میراوەکە هات بۆ لامان، جێیەکی خۆشە. بە بێ ئەوەی پرسیار بکەین گوتی: "جیاوازیی ڕووبەری دالاّنەکە ٨ مەترە و درێژاییەکەی دوو هەزار و هەشسەد و شتێکە. ئێستە زۆرترین ئاو دەباتە ئەسفەهان، واتە ٢٢ مەتری دووجا. ئەمە لە پایزدا دەبێتە ١٢ مەتری دووجا. لەم وەرزەدا ئەسفەهان کەمتر ئاوی دەوێ. کاتێك تونێڵەکە کۆتایی هات، دەرگەکەیان کردەوە، ئاو دەر و دەشتی هەڵگرت، ڕێگەی خۆی دیتەوە و گەیشتە زایندەڕوود، لە میانڕوودان، شوێنی میزانکردن و دەرگەکەی لە پشت کێوەکەوەیە. سەدی تونێڵەکە لە پشت کێوەکەیە". کاتی خۆی شاهەباسی سەفەوی ئەم گەلاّڵەیەی دامەزراندووە. کابرای میراو، شوێنی دەستنیشانکردنی شاهەباسی نیشان داین. لە چاو دالاّنەکەی ئێستە ئەو لە بەرزییە. ئاوی کانییەکان، ڕووباری زایندەرووود هەر لەم شوێنەوە سەرچاوە دەگرێت. چاومان بە هەر لایەکدا دەگێڕا کانی و ئاو بوو. تەواوی ئەوانە دەچنەوە کوهڕەنگ و تێکەڵ بە ئاوی گەورەی "دێمە" دەبن، کە سەرچاوەی تەواوی ئاوی زایندەڕووودە، هەر هەمووی ئەم ئاوانە ڕووباری زایندەڕوود پێك دەهێنن، تا دەگاتە ئەسفەهان بەم ناوچەیەدا تێدەپەڕێ. لەو نێوەدا بۆ کاری کشتوکاڵ کەڵکی لێوەرناگرن. ویستمان بچینە ئەو دیوی کێوەکەوە، سەدی کوهڕەنگ و دەریاچەی پشتەوە ببینین. ڕێگە دوور و منیش نەخۆش بووم. دامانناا بۆ وەختێکی دیکە. قەول وابوو لەو ڕۆژانەدا تیمێکی فەرەنسایی بێن و تونێڵێکی تر لە بەشی خوارەوە دەستنیشان بکەن. بۆ ئەوەی خەساراوی ئاوەکە زایە نەبێ. لە داوێنی ئاوهەڵدێری کوهڕەنگیش کەرەستەیەکیان دانابوو ڕێژەی ئاوەکەی دەمژمێر لەگەڵ دەمژمێر، قووڵایی و تەوژمی ئاوەکەی ئەندازە دەگرت. ئێمە

هیچمان نەدی، ئەوانە سەرپەرشتیاری بەشی ئاوداشتنن پێی گوتین. دوو لوولەی دە ئینچی بە شانی تونێلەکەوە بوو یەکیان لە دەستە ڕاستی تونێلەکە تایبەت بوو بە دەستەیەك، پێشتر لە نێزیك خۆیان کانیاو هەبووە بەلام ئێستە ئاوەکە تێکەڵ بە تونێلەکە بووە. ئەوانیش داوای ئاویان کردووە و کۆمپانیش ئەم لوولە دە ئینجەی بۆ دامەزراندوون. لوولەیەکی دە ئینجیی دیکەش بە شانی چەپدا کێشرابوو، بەشی ئاوداشتنی کوهرەنگی دەگرتەوە.

وازمان لە دالان و تونێڵ هێنا و ڕێگەی ئاوایمان گرتەبەر. لە دووکانێك چایمان خواردەوە هاتین بۆ کن ئەنوەری. دووکانەی ئەنوەری ببوو بە شوێنی ئەنجوومەنی ئێمە. زۆرمان قسە کرد و چووینەوە بۆ خزمەت کلاومالەکە. چەند وێنەیەکمان لە کەرەستەکانی هەلگرت. دووکانی ئەنوەری شوێنێکی قەرەبالغە و مەکۆی خەلکی بەختیارییە. هاتینەوە دووکانەکە و گوێمان بۆ قسەی ئەو خەلکە هەلخست. پیاوێك وەژوور کەوت، دەنگوباسی دزیکردنی پێ بوو. کەسێکیان لە پاسگە گرتووە و دوو مەڕی دزیوە، لە بری مەڕەکان ماینێکی داوە ئەگەر ئازادی بکەن. بە وردی سەرنجم دابووە جۆری دانیشتنی ئەو خەلکە، گوتم: ئەم جۆرە دانیشتنە چییە؟ کەسێك گوتی: دانیشتن لەسەر چۆك. کەسێکی تر چوارمشقی دانیشتبوو، بەلام لاقی لەسەر لاقی دانابوو، گوتم: ئەی ئەوە چۆن دانیشتنێکە؟ بە پێکەنینەوە گوتی: "ئاغامەنێشتی". زانیان ئەم دانیشتنانەم پێ سەیرە، هەر یەکە و جۆرێك دانیشتن و دایان لە قاقای پێکەنین. منیش وازم لێ هێنان و ئەم باسەم گۆڕی.

هاتینەوە چاییخانەکە. نانی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد. دەمودەست فەرامەرزی مەحموودی، گەورەی عەشیرەتی بابا ئەحمەدی (بامدی) هات. خۆمان پێ ناساند و قسەمان کرد، حەوتەیەك لەنێو هۆزەکەیدا خەریکی کاروباری خۆمان بین. فەرامەرزخان، کوڕی "نەجەف خان" بە تەمەنترین سەرئێلی بەناوبانگی بەختیارییە. نەجەف خان بە هۆی پیرییەوە کوڕەکەی کردووەتە جێنشینی خۆی. ئەمەش نموونەیەکە لە دەسەلاتی سەرئێلی. خەریکی قسەکردن بووین بەلام زۆرتر هۆشم لەکن ئەو پیاوە بوو ڕووبەڕوومان دانیشتبوو، بەردەوام مژی لە جگەرەکەی دەدا و مات و پەرێشان بوو. لێم پرسی: تۆ چ کەسی؟ گوتی: راکیم. بەختیارییەکان بەم جۆرە خۆ دەناسێنن، وەختێ لە هەموو تیر و تایەفەیەك لە جێیەك کۆ ببنەوە، ناوی هۆزی خۆیان دەلێن. ئەگەر لە بەشی خۆیاندا بن

پرسیاریان لێ بکەن، "کێن؟" ناوی "تش"ی خۆیان دەڵێن، ئەوسا "ڕۆڵەکانیان" دواتر "ماڵ". پێی وتین هەوارەکەیان لە نێزیك ئاوایی "کەیکاوس"ـــە، لەسەر ڕێگەی شاریکورد بۆ کوهرەنگ، ئارانی نێوان مەزگەوتی سلێمان و ڕامهورمز. لەو ڕۆژەوە ئێوە هاتوون منیش لێرەم، سکالانامەم داوە بە ئیدارەی ژینگەپارێزی لەو کاتەوە مەحتەل و بێ وەڵامم". هۆی سکالام پرسی، گوتی: "کەسێك لە ئێلاتییەکان مەڕ و ماڵاتی هێناوە و کردوویەتە لەوەڕگەی ئێمەوە، ئەو مولکە بە سەنەد و قەباڵە شەش دانگ مولکی خۆمە و ئەویش بە زۆرە ملی خۆی تێخزاندووە و ڕانەکەی لێدەلەوەڕێنێ. لەبەرئەوەی شەڕی تایەفەیی ساز نەبێ هاوارم هێناوە بۆ ئێرە و ئاوا بە دەنگمەوە دێن."

ئەم کابرایە تەواو لە کار و کەسپی خۆی بووە. داوای لێکردین وەختی ڕۆیشتن سەردانێکی بکەین. گوتم: بە چاوان، دوو وێنەمان گرت و فیلمی کامێرەکەمان تەواو بوو. فیلمەکان لە کۆڵەپشتیدا بوون، ئەویش لە ماڵی ئاغا جەعفەرقوولی بوو. هیچمان بە دەستەوە نەبوو، بەنێو بازاڕی چکۆلە و قەرەباڵغی چلگرددا، سووڕاینەوە. هەمیشە بازاڕ هەمیشە بازاڕ، هەر وەك دیگار گوتی، شانزەلیزە. دیگار، وێنەی کورتانێکی گرت. سەردانی کەلوپەلفرۆشییەکانمان کرد. چاومان لە قاپی ئاوێنەکان کرد. دیوێکی ئاوێنەبوو، ئەو دیوەی دیکەی وێنە بوو. زۆرینەیان وێنەی ئەکتەرەکان بوو، تێشیاندا بوو وێنەی ئیمام عەلی بوو. پرسیم، کامەیان باشتر دەفرۆشرێن؟ گوتی: "سەرەتا شەمایل مشتەری زۆر بوو، بەڵام ئێستە گەنجەکان ڕوویان کردۆتە ئەم ڕەسم و وێنانە". وێنەی ئەکتەرەکانی نیشان دام. وەڕێکەوتین بەرەو دووکانی ئەنوەری. هەموو لەبەر دووکانی دراوسێکەی کۆ ببوونەوە. ئەنوەری خەریکی سەودای چراتۆڕیك بوو، کۆنەی بە تازە دەگۆڕییەوە. مێهدی خانی فەرامەرزی بە سەریاندا هات و بە چەند قسەی قۆڕ چراتۆڕی لە دەست کابرای ئەسفەهانی دەرهێنا. فرۆشیار زۆریش زیت و وریا بوو. منداڵی بەگزادان هاتبوون لە هۆزی "مولولی" ئەگەر لە کوێستان بمێننەوە. پاك و خاوێن، سوور و سپی، هەر وەك سێوەلاسوورە، هیچ لە بەختیاری تاوبردوو نەدەچون. خەریك بوون خۆیان بۆ کوێستان ئامادە دەکرد. چووین بۆ دووکانی بەڕێز ئەنوەری، هێندەم قسە بۆ کوڕەکەی کرد چەنەم شل بوو، ئێوارە داهات و تاریکایی عەرز و ئاسمانی لە خم هەڵکێشا. هاتینەوە چایخانەکە، چایچی وتی، فەرامەرز مەحموودی دوو

کەڕەت هاتووە ئێوە ببینێ. چوینە ئەو دووکانەی ئەو هەمیشە لەوێ بوو. تووشی هاتین و ملمان نا لە قسەکردن، دووکاندار لەگەڵ چەند کەسێك لە بەختیارییەکان لەوێ بوون. باسی سات و سەودای بەختیارییەکانمان کرد لەگەڵ خاوەن دووکان، بۆ ئەوەی زۆر شت بۆمان ڕوون ببێتەوە. بەختیارییەکان زۆرتر ئەم شتانە بە دووکاندار دەفرۆشن: ڕۆن، کەشك، پەنیر، (قەرەقروت) و مەڕ و بزن، ئەمەش جێی سەرنجە، بە هۆی ئەوەی ٧ مانگ لە گەرمێن و ٥ مانگ لە کوێستانن، بەڵام هەرگیز مەڕ و ماڵاتی خۆیان لە خوزستان نافرۆشن. کاوڕەگەلەکە دەبەنە کوهڕەنگ، لەوێ دەیفرۆشن. گیسکەگەلەکەش، دەگێڕنەوە وساڵی داهاتوو دەیهێننەوە لە کوهڕەنگ خوردی دەکەنەوە. مشتەرییەکان یان قەسابی شارەکەن یان چۆدارەکانی ئەسفەهانن. دووکاندارێکی چلگردی گوتی: جگە لەم شتانە، ژنانی بەختیاری ئەو ڕووەك و گیایانەی بە کاری دەوا و دەرمان دێن، لە چیاکان هەڵیدەکەنن و بە ئێمەی دەفرۆشن. ئێمەش مشتەری خۆمان هەیە و دەیفرۆشینەوە. گوتم: حەز دەکەم بیبینم. هەر بە دابی خۆیان کە هەموو شت بە دەنکی تەسبێح حیساب دەکەن، دەنك دەنك بە تەسبێحەکەی ئەژماردی: مەهلب، سەعلەب و... دەستم بەرز کردەوە و گوتم ڕاوەستە، دانەدانە تۆ بیڵێ و من دەینووسم، با بزانم ئەوانە چن. بە دەم پێکەنینەوە دەستی لەسەر چاوی دانا و گوتی: "بە چاوان، من دەیژمێرم و تۆش بینووسە، دواتر تۆ لێم بپرسە پێت دەڵێم ئەوانەچن" وتەکەیم قبوڵ کرد و دەستی کرد بە هەژماردن و تەسبێح خستن: "مەهلەب، سەعلەب، جەفت، گەز، کەتیرە" و... زۆری بیر لێ کردەوە هیچی دیکەی وەبیر نەهاتەوە. وەختێ دەنکی تەسبیحەکەی دەخست پێم وابوو، زۆر دەژمێرێ، بەڵام لە پێنج دەنك زیاتر نەبوو. گوتم: "هەرئەوەندە؟" گوتی: "ئا!" ئەمجار وتی: "مەهلەب"، بەری دارێکە توێکڵەکەی لێ دەکەنەوە و مەهلەبەکە هەر وەك چەقالەی بەلاڵوك وایە، بەڕێی هەندەرانی دەکەن. نەیدەزانی بۆچی دەبێ. دووکاندارەکان لە ساڵدا کیلۆی ١٣ تا ١٥ تمەن لە بەختیارییەکانی دەکڕن. "سەعلەب" ڕەگی گیایەکی کێوییە و کیلۆی بە ١٧ تمەن دەیکڕن. "جەفت" پێستی سپیی میوەی بەڕووە. دەیگوت، بۆ ڕەنگرێسی کەڵکی لێ وەردەگرن. کیلۆی هەشت نۆ قڕان دەکات. هەر ئەمساڵ کیلۆی دەگاتە ٧٠ قڕان. "کەتیرە" لە گوێنی دەگرن، کێوەکانی کوهڕەنگ، چی زۆرە گوێنی! بەتایبەت لە

"بیرگون". ڕەگی گوێنی دەبڕن شیلەکەی دەچۆڕێتەوە، لە پاش دوو ڕۆژ دەیبەستێ و دەبێ بە چەقە، کۆی دەکەنەوە. کەتیرە چەند جۆرێکی هەیە: کەتیرەی قۆرەیی، کیلۆی ١٢٠ قڕانە، کەتیرەی گوڵ، کیلۆی نێزیکەی ٣٠٠ قڕانە، بەڵام لە دەوروبەری کوهڕەنگ نییە، یان کەتیرەی خەرمانی هەیە، کیلۆی ٢٠٠ قڕانە. "گەز" گەردەی سپی گوێنییە، گوینییەکان لە بەشی بەررۆژ "گەز"یان هەیە. لەسەر پارچەیەك دەیتەکێنن دواتر لە هێڵەکی دەدەن، بەمجۆرە گەز دەگرن. گوتم: کەی دەیگرن؟ گوتی: پاییز. کەتیرە و مەهلەب، نێوەڕاست مانگی هاوین دەیگرن. لووڕێك زۆر هاموشۆی ئەسفەهانی کردبوو، لە نێزیکمان دانیشتبوو، گوتی: مەهلەب وەك بەهارات بە کاری دەهێنن، ڕەوانەی هیندستان و عارەبستان دەکرێت. دیگار، لە مێژ بوو پرسیارێکی لە سەردا بوو گوتی: قەسابخانەکان گیسك و کاوڕەگەل چۆن و بە چ نرخێك دەکڕن؟ وتیان، لە قەپانی دەدەن، کیلۆیەکی لێ دەردەکەن، نرخی بۆ دادەنێن دە تمەن کرێی پیکاب دەخەنە ئەو لاوە، دە تمەن پارەی شوانی لێ دەردەکەن. دەتمەن خێری خۆی حیساب دەکات، لە ڕاستیدا نێزیکەی چل تمەن کەمتر لە نرخی خۆی تەواو دەبێ. کاوڕەنێر سێ تا چوار مانگی دەفرۆشن، گیسکەنێر بوو بە ساڵ و نیوێك دەفرۆشن.

بەختیارییەکان چەنەیان گەرم داهاتبوو، بەم قسە و باسە کەیفیان سازبوو. تاریك داهات و دیگار ئاماژەی بە زگی کرد، کە زۆری برسییە. چووین بۆ قاوەخانە، شێوپلاوی ئیستامبولیمان خوارد و دیسان چووینەوە دووکانەکە، فەرامەرز لەوێ دانیشتبوو. سەیدێك لەوێ زۆری باسی شەرع و چیرۆکەئایینییەکان بۆ کردین. سەر لە نوێ خۆمان کردەوە بە چایخانەکەدا، بەرێز جەلیل ئازاد، سەرۆکی پاسگە، وەژوور کەوت، باسی عەشایر و هێمنایەتیی ناوچە و ژاندارمە، چ قازانجێکی بۆ ئێمە نەبوو. کەسێك ڕاسپاردەی سەرۆکی پارێزگەی هێنابوو، گوتبووی، لەنێو هۆزەکەدا بکەونە پشکنین، بەڵام زۆر خۆ لە ماڵی جەعفەر نەدەن. لەو کەینوبەینەدا تێنەگەیشتم، پەلەم نەکرد جەعفەرقوولی کارەکان ڕاپەڕێنێ. جەلیل ئازاد بۆ نانی نیوەڕۆی سبەی بانگێشتنی کردین. ئێمەش قبوڵمان کرد. بۆ نوستن، قاوەخانە پڕ بوو جێی خەوتن تەنگەبەر بوو. چایچی ڕێزی زیاتری لە ئێمە گرت، جێی بۆ چاك کردین و خەوتین.

## پێنجشەمە ٨ی جۆزەردان

بەیانی دەمژمێر ٧ لە خەو هەستاین و دەستمان لە ملی پەری شەو بۆوە. خواردنی بەیانی نان و ماست بوو، چێژمان وەرگرت. ماست و دۆ لە چلگرد دەست ناکەوێ. هەڵبەت بۆ فرۆش نییە. پێمان سەیر بوو، خێڵەکییەك گوتی: ئێلاتییەکان لە چلگرد، ماست و دۆ و پەنیر نافرۆشن، ئەمە لێرە باو نییە. دەیگوت: وەختێ لە ساڵی ١٣٢٦ی هەتاوی، کرێکاران خەریکی کارکردن بوون لە تونێڵی کوهرەنگ، بە چاوی ناحەز سەیری ژنانی ئێلاتیان کردبوو، ئێمەش وامان بە باش زانی ئیتر لەمەولا، ئافرەتی بەختیاری سپیایی بە کرێکاران نەفرۆشێت. لەو کاتەوە ئەم نەریتە دامەزراوە. ئەگەر جارجارێك لە شوێنێکی وەك ئێرە ماست و پەنیرتان بینی ئەوە بزانن ڕێزگرتنە لە میوان.

ئەمجاریش چووینەوە نێو خەڵکەکە، لێرە داب وایە، هەرسەرە ژنێك ئەگەر ڕێز لە پیاوێك بگرێ، دەستی ڕاستی لە ئەستۆی دەکات و گۆنای چەپی ماچ دەکات، پیاوەکەش دەمودەست پشتی دەستی خاتونەکە ماچ دەکات. لە چەند جێ ئەم ماچوموچەمان بینیوە. ئێستەش لەنێو بازاڕ ئەوا چەند جارێك، گەیشتینە بەر دووکانی قەسابێك، جەنابی ئەنوەری لەوێ بوو. ئەسپەکەی هێنا بوو ناڵی بکات، قەسابی چلگرد ئەو کارەی دەکرد، سمتاشین و گاز و بزمار و چەکووش و ناڵ، هەر ئەو شتانەی لە تەواوی ئێراندا باوە، دیگار چەند وێنەیەکی لێگرتن، منیش فیلمم پێ نەمابوو. هەر ئەوەندەمان زانی هەر کەسە و ئەسپی خۆی زین کردووە.

زۆری پێنەچوو بازاڕ پڕ بوو لە ئەسپسوار، ئەوەی هات لە بەر دەرگەی قەسابی و ناڵبەند ڕاوەستا. سەرمان سووڕمابوو، گوتمان چ باسە؟ گوتیان: کەسێك فەوتی کردووە و دەچین بۆ پرسە. ئێمەش حەزمان ئەکرد بچین و بزانین چۆنە. سێ فرسەخ دوور بوو، وڵاخی سواریشمان پێنەبوو. لە جێی خۆمان مەحتەل مابووین. هەر کەسە و گورجێك خۆی هەڵدا سەر ماڵی زین و کوێتەی خۆی غاردا. تەواویان ئاغا و بەگزادە بوون. لەو قەرەباڵغییەدا بۆمان دەرکەوت هەر کەسە و بە ئەسپی خۆی دەنازی. لووڕەکان زۆر بە ئەسپی خۆیان دەنازن. هەر کەسە و ئەسپی خۆی لەوی دیکە پێ باشترە. لەوە دەچوو قەسابی چلگرد ناسیاری باشی لەسەر ئەسپ هەبێ. زاری ئەسپەکانی دادەپچڕی و

بەددانیاندا دەیگوت چەندەی تەمەنە. تێبینییەکانی زۆر سەیر بوون. بۆ نموونە دەیگوت: ١٧ی تەواو کردووە، پرسیم: ئەمە چۆنە؟ وتی: ددانێك لە دەمی ئەسپدایە، لەگەڵ ددانەکانی دیکەی جیاوازە، نوکی تیژە، ئەو ددانە لە هەندێك تەمەندا دێتە سەرێ و لە تەمەنێکی دیکەشدا دەچێتە خوارێ. ئەوانەی شارەزان بەم ددانەدا تەمەنی ئەسپ دیاری دەکەن. زۆر سەرقاڵ بوو لەوە زیاتر بۆی باس نەکردین. لە دووکانەکە دانیشتبووین، خەڵکەکەش دەوریان دابووین. لەسەر هەموو شتێکی ئەسپ قسەیان دەکرد. یەکێ ئەسپی مل کەڵەبابی پێ باش بوو، ئەوی دیکە کلکقیت. زۆر شتی دیکەش، دەنگەدەنگ زۆر و ئێمەش لە هەموو قسەکان حاڵی نەدەبووین. باسی یەختەکردنی ئەسپ هاتە گۆڕێ، پرسیم: چۆن دەکرێ؟ وتیان: ئەوانەی شارەزان، چەرمی باتوو دەبڕن، باتووەکە دەهێننە دەرێ. چەرمەکەی بە موی کلکی ئەسپ دەبەستن، بۆ ئەوەی وشك ببێ. زۆرتر لە پێنج، شەش ساڵیدا ئەو کارە دەکەن. کەسێکی دیکە گوتی، بەڵام وەختێ بمانەوێ گایەك یەختە بکەین، لە پێشدا لە بنەوە توند دەیبەستین، ئەمجار لەسەر بەردێك باتووی دەپژێنین. دانەیەکی دیکە وتی: ئێستە ئەم کارە ناکەین، ئەو بەستەزمانە زۆر ئازار دەبینێ. وا حەوت و هەشت ساڵێك دەبێ، نە باتوو دەبەستین، نەدەیبڕین، بگرە لە ژوورەوە بە گاز ڕەگی دەقرتێنین، باتوو لەنێو چەرمەکەدا بڵاو دەبێ.

ئێمە سەرقاڵی قسەکردن بووین، کەسێك بە پەلە خۆی کرد بە ژووریدا و ڕووی لە خەڵکەکە کرد و بە بێ ئەوەی تەماشای کەسێك بکات، گوتی: جەنابی جەلیل ئازاد چاوەڕێی ئێوەیە. تێگەیشتین مەبەستی چییە، بۆ نانی نیوەڕۆ چاوەڕوانی ئێمە بوو، وەڕێ کەوتین، سەر و سەلامێکی گەرم هەر وەك جاران قسە و باسی خۆمان، خواردنەکەشمان پلاو و کەبابی ماڵێ بوو. زۆری خزمەت کردین. شەترەنجی هینا و چەندێك یاریمان کرد، زۆری لێ سەرخۆش نەبووین، ماڵئاواییمان کرد و دەرکەوتین.

چووین بۆ گەرماو، دواتر هاتینەوە بۆ دووکانی ئەنوەری. دەنگ و باس نەبوو، تاق و لۆقە هاتن و کۆ بوونەوە، جگەرەم پێدان و گۆردم بۆ هەڵکردن، گڕی شەمچەکە بەشی نەکرد و تەواو بوو. لقە شەمچەیەکی دیکەم داگیرساند، پیرەمێردێك لەوێ دانیشتبوو، لە پاش ئەم گشتە تەمەنە، سەری لە ئاوری شەمچەکە سوورمابوو، گوتی، ڕۆژگارێکی ناخۆشمان لەگەڵ بەرد و ئەستێ بردەسەر. بەردێکی چەخماخ، کوتە ئاسنێك، قوولیك

پووشوو، جاوەرە ئاور بکەوە. پووشوومان دەکرد بەنێو تەپاڵەدا، ئەوەندەمان فوو لێ دەکرد تا ئاوری دەگرت. دەرودراوسێ دەهاتن ئاگریان دەبرد. دواتر هەناسەیەکی هەڵکێشا و شەمچەکەی لێوەرگرتم، لقێکی هەڵکرد و گوتی: "ئێستەش ئاوا سووك و سانا!" کەسێك لەولاوە گوتی: ئەگەر ئێستەش لە دەرودەشت شەمچەمان پێ نەبێ بە بەرد و ئەستێ ئاور دەکەینەوە. مشتەری وەژوور کەوتن و ساتوسەودا دەستی پێکرد. ڕووم کردە دیگار، گوتم: با بچینەوە بۆ لای قەساب، با بزانین چۆن تەمەنی ئەسپ دیاری دەکات. خێرا وەڕێ کەوتین، قەساب بێکار بوو، زۆری بەخێراتن کردین. باسەکەمان لەگەڵ هێنا گۆڕێ، بەمجۆرە وەڵامی پێدراینەوە: ئەسپ، لە تەمەنی ٣ساڵیدا ددانی خوارەوەی جگە لە ددانی گەورەی پێشەوە، ٢ ددانی چکۆلە لە لای ڕاست و دوو ددانی چکۆلە لە لای چەپی هەیە، ئەمانە سێ ساڵی ئەسپ نیشان دەدەن. تەواو سپین، لە چوار ساڵیدا هەر لایەی ددانێکی دەکەوێ. لە پێنج ساڵیدا ئەو دووانەی ماون دەکەون. ددانی نووکتیژ سەر دەردێنێ. پێی دەڵێن ددانی پێنجەم هێستری مێ ئەو ددانەی لە ٧ ساڵیدا قووت دەداتەوە و لە ٨ ساڵیدا سەرهەڵدەداتەوە. لە ٩ ساڵیدا نامێنێ و لە١٠ ساڵیدا دێتەوە دەرێ. ئەمە تا ١٣ ساڵی بەردەوامە، وردە وردە گەورە دەبێ. لە پاش سێزدە ساڵی دانەیەك لە خلێنەکانی لەبەرئەوەی لە سێزدە ساڵیدا ساف نەبووە، ساف دەبێ. بەمشێوەیە دەڵێن سێزدە ساڵەی تەواو کردووە. ئەگەر لە ٧ ساڵیدا ئەسپ یەختە بکەن، ئیتر ددانی ناگۆڕێ و تەمەنی دیار نابێ. هەر ئەوەندەی دەزانی. ماڵئاواییمان لێکرد و گەڕاینەوە چایخانەکە، چاوێکمان بە جەعفەرقوولی بکەوێ، بەڵام نەمانبینی.

هێندە هەستم بە ماندووبوون دەکرد، لەسەر سەکۆی قاوەخانەکە درێژ بووم. کەسێك لەوێ نەبوو، هێشتا هیلاکیم دەرنەچووبوو، مامۆستایەکی قوتابخانەی ڕەوەندان وەژوور کەوت. لەبەری هەستاین و زۆرمان بەخێرهێنا و داوام کرد چایی بۆ بێنن. باسی قوتابخانەی ئێلاتیمان کرد، زانیم یەکەم جارە مامۆستا بۆ لووڕەکان دەنێرن، تا ئێستە تەنیا دە مامۆستایان بۆ ناردوون. پێنج کەسیان چوونەتە نێو هۆزی بابادی. دانەیکیان لە "بامدی" و یەکێ لە "هەمۆلە" و ئەوانی دیکەش نەمانزانی لە کوێن. ئەوانەم لەگەڵ مامۆستاکانی ئێلی قەشقایی لە زەینی خۆدا هەڵسەنگاند، ساڵی ڕابردوو وەختێ لەنێو قەشقاییەکان بووم نێزیکەی ٢٠٠٠ کەس مامۆستای ئێلاتیان هەبوو، ئەمە چییە و

ئەوە چۆنە؟ بەهمەن بەگی، یەکێ لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی ئێلاتی قەشقاییە. گوتم: هیچ هزرێکیان بۆ نەکردوون؟ گوتی، بەڵێ، قەول وایە چوار کەسی دیکەش بنێرن. زۆرم هان دا، دڵگەرم بێ بە خزمەتکردنەکەی، ماڵئاوایی کرد و ڕۆیشت.

هەستم دەکرد کاروبار بە باشی ناچێتە پێشێ، دڵەڕاوکێم زۆر بوو، دیگار لە من باشتر بوو، وەختێ حاڵی منی زانی، گوتی: "یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵناسێك سەبر و تاقەتی ئەوە. ئەوەی لە دەوروبەری تۆدا دەبێ، کارێکی کۆمەڵناسییە. بە جوانی سەرنج بدە، ببینە و گوێ هەڵخە، ئەگەر تێگەیشتی ئەوا باشتر، نەتزانی پرسیار بکە. سەرەتا دەبێ بزانی بۆچی ئەم دیاردەیە پێك هاتووە، چۆن سەری هەڵداوە. وەختێ کۆمەڵناسێك دەچێتە هەر جێیەك، دەبێ وابزانێ کە هیچ شتێ لەو کۆمەڵگەیە نازانێ. دەبێ هەموو شتێك بۆ ئەو جێی پرسیار بێت. نابێ وەڵامی هیچ باس و خواسێك خۆی بیداتەوە. بگرە لە کۆمەڵگەکە، لە هەستان و دانیشتنی ئەو خەڵکە، لە کار و پیشەیان، لە کۆڕ و کۆمەڵیان، ئابووری و فەرهەنگی ئەو خەڵکە بۆی ببێ بە پرسیار، تەنانەت دەبێ هەوڵ بدا، هۆی سەرهەڵدانی دیاردەیەك لە خەڵکی کۆمەڵگەکە نەپرسێ. لەبەرئەوەی ئەوانیش شارەزا نین. داب و نەریت ڕەگ و ڕیشەی لەنێو مێژووی هەر قەومێکدا هەیە و خەڵکەکەش لەو ڕەوتە ئاگەدار نین». خێرا قسەکانی دەپچڕا، تەواو زمانی فارسی نەدەزانی، منیش فەرەنسیم نەدەزانی. زۆرگران لە یەکدی تێدەگەیشتین، بەڵام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، هەردوومان باشتر دەبووین و لە جووڵە و قسەی یەکدیی حاڵی دەبووین. بە یەکەوە ئاسایی بووین، مامۆستایەکی باش بوو. دڵکراوە و دڵاوابوو، چی دەزانی حەزی دەکرد دەوروبەریشی فێری بن. کێشەی نێوانمان تەنیا زمانی لێك تێگەیشتن بوو، ئەمەش تا دەهات سامانڵ دەبوو. هەر وەختێ کارەکانمان دژوار دەبوو، کاغەز و پێنووسمان لە بەردەمی خۆمان دادەنا و بە نەخشە و پلان لە مەبەستی یەکدیی حاڵی دەبووین. ڕەنگە لە درێژەدا لەسەر ئەم بابەتە زۆرتر بنووسم.

وەرزێڕێك لە زەوییەکەی خۆیدا خەریکی دێراو هەڵدان بوو، بەم کارەی سەرنجی ئێمەی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. لە پڕ لە جێی خۆمان ڕاپەڕین و چووین بۆ لای کاکی جووتیار. لە پەرژینی باغەکەی چووین بەو دیودا، سەلام و ئەحواڵپرسیمان کرد و بە دابی خۆیان تەوقەمان لەگەڵ کرد و سەبرێك دەستی خۆمان ماچ کرد. دەستم بۆ لای

قارخکە ڕاداشت و گوتم: بە زمانی لووڕی بەوە دەڵێن چی؟ گوتی: «کورت». گوتم: بەم جۆگە ئاوە؟ وتی: «جوق». ئەوسا گوتم: بەم گونجەیە دەڵێن چی کە ئاوی جۆگەکە دەکاتە ئەم کورتەوە؟ گوتی: ئاودڕ. گوتم: بە ئاو دەڵێن چی؟ گوتی: «ئوو»، ئەدی بۆ دەڵێی ئاودڕ؟ گوتی: بۆ ئەوەی تۆ لێم حاڵی بی. بە لووڕی دەڵێن "ئوودڕ". دەرکەوت لووبیای داچەندووە، ئەوانەی بەراو و ئاویان هەیە. بۆ بەریانێك زەوی ٤ دەمژمێر ئاوی پێ دەدەن، پیرەمێرد زۆر ماندوو بوو. جگەرەیەکمان پێدا و ڕێگەی بازاڕمان گرتەبەر.

تا ئەوسەری بازاڕەکە چووین و سەلامێکمان ئاراستەی غوربەتی کرد. دیگار پاکەتێك جگەرەی شنۆیی تایبەتی کڕی، هەموو پێیان سەیر بوو بۆچی من و دیگار جگەرەی بیانی ناکێشین. خەریکی پیاسەکردن بووین لە پڕ دیگار گوتی: با بچینە لای سەید، پیاوێکی خوێندەوارە، دەمەوێ پرسیارێکی لێ بکەم. بە ڕەنگمدا زانی سەرم لە شتێك سووڕماوە، گوتی: «حەز دەکەم بزانم هۆی چییە لووڕەکان ژن نادەن بە غوربت. هەر لەبەرئەوەی لە تەواوی ئەفریقادا خەڵك ژن نادەن بە ئاسنگەر بە خراپترین چین سەیری دەکەن. پێیان وایە بەهۆی ئەوەی کار بە ئاگر دەکات تێکەڵ بە شەیتان بووە!» گەڕاین و دیتمانەوە، سەلامان کرد و لەگەڵ جەماعەتەکە تەوقەمان کرد، خاوەن دووکان دەستوبرد، دوو چایی لە پێش دانایین. دیگار بێدەنگ دانیشتبوو، وردەوردە لە پەراوێزەوە دەستم کرد بە پرسیارکردن و قسەی خۆش، چامان خواردەوە و باسەکەم هێنا سەر غوربەتەکان، تاریفی پیشە و کاریانم کرد، خۆم لە دەقی باسەکە نێزیك کردەوە، لەبەرچی بەختیارییەکان ژن نادەن بە ئەم غوربەتیانە؟ سەید گوتی: «بە هۆی ئەوەی غوربەتی ماڵ بە کۆڵن، بێ نیشتمان و بێ خانە و لانەن، هیچ نین تا خەڵك ڕێزیان لێ بگرێ.» بەم چەند ڕستەیە قسەی خۆی تەواو کرد. ویستم باسەکە بەرمە سەر ئاور و ئەم جۆرە شتانە، ئەوەندەم نەزانی کوێخای چلگرد بە سواری ئەسپەوە گەیشتە بەر دەرگە. هەر ئەوندە چاوی بە ئێمە کەوت سەلامی کرد و لێمان بوو بە قیلی کەوای سپی، ئیلان و بیلان میوانی منن، ئێمەش ڕازی بووین و ماڵئاواییمان لە خەڵکەکە خواست.

ئەم کوێخایە پیاوێکی هەژارە و تەمەنێکە دڵی بەوەندە خۆشە دەمڕاستی چلگردە. بۆ سواربوونی ئەسپەکەی فەرمووی دیگاری کرد و ئەویش بێ یەك و دووکردن سوار بوو. ئای حەزی لە غارغارێنە، لەگەڵ کوێخا وەڕێ کەوتین، دیگار چوو بە چایچی بڵێ، بۆ

نوستن دوو جێمان بۆ ڕابگرێ. مام کوێخا پرسیی بە من کرد و چوو گۆشتی کڕی. پیرەمێرد لە خۆشیی میوان، نەیدەزانی چ بکات. دیگار هاتەوە بۆ لامان ڕوو بە چیا وەڕێ کەوتین. پیرەمێرد دەتگوت، کۆنەڕاوچییە، نە دیگار بە سواری و نە من بە پێیان نەیدەگەیشتینێ! گەیشتینە سەر ترۆپکی چیا، لەو بەندەنە چادرێکی سپی هەڵدابوو. کە کەوتمە هەناسەبڕکێ، پیرەمێرد ئاوڕێکی دایەوە، وەختێ ئێمەی لە دواوە بینی ماشەڵایەکی پێدادام. گەیشتینە خێوەتەکە، کوڕی کوێخا خێرا هاتە بەردەمان و سەلامی کرد. وەڵامان دایەوە و سڵاومان ئاراستەی خاو و خێزان کرد. مام کوێخا لە خۆشیان دەستی تێکەڵ دەهات، مافوورەیەکی ڕاخست و دۆشەکێك لە سەری. دوو بالیفەیان بۆ دانایین. هەر تێڕ و توربێنێکت دەبینی دوگمەڕێز کرابوو، وام دەزنی لە بلوچستان میوانم. دانیشتین و پیرەمێرد کردی بە گوڕە و هەرا: خێرا بن ئەوە بێنن، ئەوە بەرن، ئاوا بکەن، هەر وەك دوازدە سوارەی مەریوانی میوان بێت. کوڕە جەحێڵەیەکی ساویلکەمان، لە ئاوایی دیبوو، ئەویش لەوێ کاری دەکرد و دەهات و دەچوو، دوو میوانی بەختیاری لێ بوو. کوێخا کوڕێك و دوو کچی هەبوو، یەکیان عازەب و ئەویدی چووکەتر. کوڕەکەی لە تاقیکاری پۆلی شەشەم تەواو ببوو، لێی پرسیم: «بڕوانامەی پۆلی شەش باشە؟» گوتم: باشە، ڕێنوێنیم کرد بچێ ببێ بە مامۆستای ئێلاتی. خێزانی کوێخا خەریکی نانکردن بوو. بۆ ئەوەی ئەم هەلە، لە کیس نەدەم، چووم نانکردنەکە ببینم. «دایکە ماندوونەبی» وەك دایکێك وەڵامی دامەوە. خێرا خێرا نانی پێوە دەدا. گونتکەکانی بە تیرۆك پان دەکردەوە و هەر بەو تیرۆکە ئەیدا بەسەر سێڵەکەدا بەسەر ئاورەکەوە. ناوی ئەو کەرەستانەی نانی پێ دەکرد، یەك بە یەك لێم پرسی، بە دەم نانکردنەوە جوابی دامەوە. ئەو دارەی لەسەر گونتکەکە دەیگێڕین، ٥٠ سانتی مەترە، یەك سانت و نیوە، خەڕات ڕێك و لەباری کردووە، پێی دەڵێین «تیرۆك»، ئەم تەختەی نانی لەسەر پان دەکەنەوە، ١٥ سانتی مەتر بەرزە، پێی دەڵێین «پنە»، پێی دەگوتن پنە و تیرۆك. کەوڵی نان و هەویرەکە بە دەستی خۆیان چێی دەکەن. لە توخمی بەن دەیچنن. مەترێك لە حەفتا سانت. پێی دەڵێن «کەوڵ». ئەو دەفرەی هەویری تێدا دەشێلن «لەگەن»ی پێ دەڵێن، سوێنە، بەڵام سوێنەی هەویر شێلانی ئەوان، گڵێن نییە و مسی سپییە. ئەو سێڵەی بەسەر کوچکاورەکەدا نخوونی دەکەنەوە بە لووڕی پێی دەڵێن «تووە»

بۆ ڕاگوێزان، ئاڵقەیەکی لێ نراوە، نانی لەسەر دەبرژێنن. نانەکان تا بڵێی ناسك و جوانن، ڕۆژێ دوو کەڕەت نان دەکەن. بەیانی جارێك ، ئێوارە جارێك. قەتمان نەدی پیاوێك ئەم کارە بکات، تەنیا ژنان خەریکی نانکردن بوون. کابرایەکی لوور، گوتی: پیاو لەنێو ئێلدا ژنی لە پەناوە نەبێ، لە برسان قڕی دێت. ئەگەر ئەوان نەبن پیاوی بێچارە چی لە دەست نایات. کوێخا زوو زوو دەیگوت، ئەلحەملایی هەموو شت زۆرە، ماست و دۆ، نان، هەر ئێستە کەباب دروست دەکەین. پرسیم: «مام کوێخا، شوانت بۆ ڕانەکەت گرتووە؟» گوتی: «نا، من مەڕ و ماڵاتم نییە». دیار بوو بە ڕاستی نەدار و دەستکورت بوو. خەرجی لەسەر دووکانێکی شەریکییە و نەختە زەوییەك و جاروبارەش خەڵکەکە، ئاوڕێکی لێ دەدەنەوە.

گوتی: لە تەمەنی حەڤدە ساڵییەوە کوێخام، ئێستە ٦٤ ساڵی تەمەنە. دوو ژنی هێنابوو، یەکیان ئامۆزای خۆی بووە و بە هۆی منداڵنەبوونەوە ژنی بەسەر هێنابوو. بەختیارییەکان زۆرتر کچەمام دەخوازن، بە پێی دەستووراتی باوك، کێی بۆ پەسەند کرد هەر ئەوەیە. کوێخا گوتی، چونکە لەم ژنە منداڵم نەبوو، ژنێکی دیکەم هێنا، ئێستە خاوەنی سێ منداڵم. ئیتر سەری داخست. بۆ ئەوەی بێدەنگی بشکێنم، ئاماژەم بۆ سێپەکی مەشکە کرد و گوتم ئەمە چی پێ دەڵێن؟ هەموو بە یەکەوە وەڵامیان دامەوە، نەمزانی دەڵێن چی. ڕووم کردە کەسێکی دیکە و پرسیارەکەم دووپاتە کردەوە، گوتی. بە لووڕی بەم سێپەکە دەڵێین «مەلار» وەختێ مەشکەی بە گوریسەوە پێدا کرا، پێی دەڵێن «چومشدو». خەریك بوو ئێوارە دادەهات و تاریکی دەکرد، ژنێك خەریکی تەشیڕستن بوو. زۆر باریك بای دەدا. گوتم: ئەوە چییە؟ گوتی: «دیك» گوتم: « لەگەڵ پەڕڕە» جیاوازییان لە چیدایە؟ ژنە گوتی: پەڕڕە ئەستوورتر بای دەدا، دیك باریکتر. چایی دوای شێومان خواردەوە، کوڕی کوێخا بە چراتۆڕەوە هەتا چایخانەکە ڕەوانەی کردین، بەڵام بە پەرێشانییەوە بیرم هەر لە لای ئەو بوو، کوڕە تەنیا پرسیارێك بەمێشکیدا هات و ئاراستەی دیگاری خەڵکی فەڕەنسەی کرد، ئەوە بوو: «لە وڵاتی ئێوە نان کیلۆی بە چەندەیە؟» ئەو کوڕە هەژارە ئەوەی بۆی گرینگ بوو نان بوو! گەیشتینەوە قاوەخانە و زۆریش باسی میوانداری و حورمەتی کوێخامان کرد. بۆم دەرکەوت خەڵکی چلگرد بە چاوی بێڕێزی سەیری ئەو پیاوە دەکەن. پێم ناخۆش بوو،

لێفەم بەسەر خۆم هەڵکێشا، یانی خەوتوم.  دیسان هەر وەك شەوانی ڕابردوو، لە دەرگەدان و چونەدەرێ و هاتنە ژوورێ نەیهێشت تا بەیانی بخەوم.

## هەینی ٩ی جۆزەردان

شەوی ڕابردوو خەو نەچووە چاوم، ئێستەش ژانەسەر. بە بێ وازیی نانی بەیانی دەخۆم و لەگەڵ دیگار بە ئاواییدا دەگەڕێین. لە دووکانێك باسی ئاژەڵداری گەرمە، دووکان پڕە و جمەی دێت. باسی نێری و بەران دەکەن، هەر کەسە و تاریفی مەڕ و ماڵاتی خۆی دەکات. فلاّن بەران باشە و ئەو نێرییە چاك نییە. بازاڕی قسەیان گەرمە و ئێمەش لە نێوان وتەکانی ئەواندا، ئەوەی بۆمان گرینگە دەینووسینەوە. هەڵبەت کارمان بە کاری ئەوان نییە، قسەیان پێ نابڕین، دەزانین بەرانی جسن، بۆ ئەوەی تۆرەمەی لێ بکەوێتەوە، بۆ ٧ ساڵ هێز و پێزی باشی هەیە، بەلاّم نێری هەر بۆ ٣ ساڵ بەکار دێت. دواتر یەختەی دەکەن. لە بەر ئەوەی قەڵەو و بغور دەبن زیان بە بزنەکان دەگەیەنن. مەڕ هەتا دە بەرخی دەبێ، بزنیش هەروا. بیست ڕۆژی هاوین دەمێنێ نێری و بەران تێ دەکەن. لە سەرەتای جۆزەردانەوە لە یەکدیان هەڵداوێرن. مەڕ لە چل و پێنجی زستاندا دەزێ. مەڕ چوارمانگ شیر دەدا. بزن حەوت مانگ. مانگا ساڵێك یان ٦ مانگ. بە حیسابی هەژماردەیی ئەوان نازێن. ئەوانەی دووانەیان دەبێ، دەکرێ بلێین لە سەد سەر مەڕ سەد سەر بەرخ لە دایك دەبێ. پرسیارێك لە مێشکمدایە، لەبەرئەوەی وەلاّمەکەم لەوان وەرناگرم، دەپرسم، بۆ چەند سەر مەڕ بەرانێك دادەنێن و نێریش بۆ چەند سەر بزن؟ یەکێ لەوان دەڵێ: «بۆ سەد سەر مەڕ، پێنج بەران و بۆ سەد سەر بزن پێنج نێری تەواوە». بە دوای ئەو پرسیارەدا هەموویان ڕوویان بۆ لای ئێمە وەرگێڕا. تا ئەم کاتە تەنیا چایچی لەگەڵماندا بوو، وا بزانم نەدەبوو پرسیارم بکردایە، باسەکایان هەڵبڕی، کەس دەنگی لێوە نەهات. تازە ناشتوانم بیانخەمەوە سەر باسی ئاژەڵداری. پیاوەکان زۆر بوون، پازدە بیست کەس، دووکانەکە تاریك بوو. گوتم: «شەوی ڕابردوو بەختیارییەك دەیگوت، پیاوی بەختیاری ئەگەر ئافرەتی لەلا نەبێ، جا با خێزان، خوشك، یان کچی بێ. لەبەر بێ نان و ئاوی قڕی دێت.» هەموو گوتیان، بەینەلاّ وایە. گوتم: چ کارێك لە ئەستۆی ئافرەتانە؟ دەمویست بزانم، لە بابەت کاری قورسەوە تا چ

ڕادەیەك ئاگایان لە ئافرەت هەیە. هەر یەکەی لەبەر خۆیەوە شتێکی وت و ئێمەش گوێمان بۆ ڕاگرتن. تەشیرێسی، شیردۆشین، هێنانی سووتەمەنی و ئاوردوو، دوورینی جلوبەرگی خۆیان، ماڵ و منداڵ، نان و هەویر، شیو و کوڵ و...، هیچی دیکەیان بە دەمدا نەهات. گوتم: ژن خۆ لە چ کاروبارێك دوور دەگرێ و ئێوەش ڕێگە نادەن ئەو ئەرکە بکەوێتە سەر شانی ژن؟ دیسان هەر کەسە و لەبەر خۆیەوە حیسابی کرد: دروێنە و خەلەوخەرمان، بەننایی و دیواردانان، سوێند خواردن، سەنەدی مامەڵەکردن، مەشوەرەت و پرسپێکردن، پەیام ڕاسپاردن. ئەم ئاگەداریانە هەرچەند کەمیش بوون بەڵام بۆ ئەوەی بزانین حورمەتی ژن چۆنە لەنێو بەختیارییەکاندا، بۆ ئێمە کەم نەبوو.

ماڵئاوایمان لێکردن و هاتینەوە بۆ قاوەخانەکە. هیلاکی و ماندوویەتی وای لێ کردم سەرخەوێك بشکێنم. بە گوڕەگوڕی ئەو خەڵکە خەبەرم بووەوە، سەیرم کرد، جەعفەرقوولی هاتووە و لەگەڵ لووڕەکان خەریکی قسەوباسی خۆیانن. وا دیار بوو دز هێستری ڕفاندووە. چاکوچۆنییەکمان کرد و درێژەیان دا بە باسەکە. لەنێو قسەکاندا، جەغفەرقوولی ڕووی تێ کردم و گوتی: کەلو پەلەکانی ئێوەمان هێناوە، ئیزن دەدەن دایان بگرن. واقم وڕما، وەخۆهاتمەوە و گوتم: دایان بگرن قەیدی ناکات. دیگار بە سەرسووڕمانەوە پرسی، چ بووە؟ جەعفەرقوولی گوتی: دواتر باسی دەکەین. وەختێ قسەوباس کۆتایی هات و دەورمان چۆڵ بوو، گوتی: ساواك وتوویەتی، با لەنێو هۆزەکەدا بمێننەوە، بەڵام لە ماڵی تۆ نەبن، منیش زۆر تووڕە بووم و خۆم هەڵسووڕاند، ئەوانیش زۆر پەرێشان و شەرمەزار بوون، هەرچۆنێك بوو بڕیاردرا شەوێ بچینەوە بۆ لای جەعفەرقوولی. چارەمان نەبوو، ساواك نەیدەهێشت لەنێو عەشیرەتەکەدا جێمان ببێ، کارەکەشمان دەچوو.

نانی نیوەڕۆمان خوارد و کەلو پەلەکانمان خستە جێبێکەوە، لە نیوەی ڕێدا جێب پەکی کەوت. ناچار بووین ماوەی ڕێگە بە پێیان بڕۆین. ڕەشماڵەکانی نێوڕێ لە دوورەوە دەرکەوتن. چاویان لێ بوو، جەعفەرقوولی بە پێیان دەڕوات، ئەسپێکی زینکراویان بۆ هێنا. دیگاری خەپلە، نەیدەتوانی بە پێیان بڕوات، ناچار خوڵکمان کرد و ئەویش یەك و دووی لێ نەکرد لێی سوار بوو. هاوڕێیانیش هەر کەسە و شتێکی لە کۆڵ نا. هەرچۆنێك بوو خۆمان گەیاندە فانیاوا. کەلو پەلمان لە ماڵی ئاغا جەعفەرقوولی دانا. وچانێکمان

گرت. بەراز لە ماینێکی دابوو لاقیماینەکەی قرتاندبوو. خاوەنی ماین زۆر بۆی بەپەرۆش بوو هەر ئەوەندە بوو نەدەگریا. ماین ئاوس بوو، هیچ چارەیەکیش نەبوو، دەبوو مسەبایەك بگرن هەتا ماینەکە دەزێ. ڕێگەی هەورازمان گرتە بەر، من هەمیشە لە ڕێگەدا بە پەلە دەڕۆم، بختیارییەکانیش ئەمەیان پێ ناخۆش بوو، هەر بۆیە جەعفەرقوولی گوڕاندی، ئارامتر لە پێ کەوتین.

زۆری پێنەچوو گەیشتینە تاوڵی بەڕێز جەعفەرقوولی، زۆر ماندوو بووم، هەر یەکە و لە لایەك پاڵ کەوتین، ئاور و مەنقەڵ ئامادە بوو، نازانم چۆن بوو باسی میراتی هاتە گۆڕێ. جەعفەرقوولی دەیگوت: دوای مردنی سەرۆك ئێل، کوڕی گەورە جێنشینییەتی. دەبێ خاوەن ڕەسەن بێ. واتە ئەگەر سەرۆك ئێل خاوەنی دوو ژن بێ، یەکیان لووڕ، یەکیان خانزادە. ئەگەر کوڕی گەورە لە خێزانی لووڕ بێ، کوڕی چووکەتر لە خانزادەخان، مقامی سەرۆکی بە ئەو کوڕە دەگات کە لە خانزادە بێ. زۆرم پرسیار ئاراستەی جەعفەرقوولی کرد. ئەویش بە حەوسەلەوە وەڵامی دەدامەوە. یەکەم ژن، بی بی شەوکەت، خوشکی ئاغامحەمەدی پەرویزی، مێردی کچی (سەمسام)ە. لە بی بی شەوکەت منداڵی نەبووە. ژنێکی لووڕی هێناوە پەرەکل ناو، لەو ژنە سێ منداڵی بووە، کچەکەی بە مێرد داوە و کوڕێکی بە ناوی یوسف و منداڵێکی دیکەش. بە هۆی ئەوەی پرەکل، لاسار بووە تەڵاقی داوە و منداڵەکانیشی لەکن بی بی شەوکەتن. ئێرانی خێزانی، کچی ئاغا محەمەدی پەرویزییە، لەو ژنەش کوڕێکی هەیە بە ناوی غوەڵام، کچێك بە ناوی لەیلا، کوڕێکی دیکەش بە ناوی سەعید. یوسف لە ژنە لووڕەیە، وا دیاربوو هێندە هەمییەتی نادەنێ، بەڵام گرینگی ئەدەن بە غوەڵام. خێزانێکی دیکەی هەیە بە ناوی «می نسا» ئەویش کابانی نێوماڵە. گوتم: میراتی چۆن دابەش دەکەی؟ گوتی : لەنێو براکاندا برای گەورەتر، ٢ بەشی وەبەر دەکەوێ، دایکی بەشێکی پێ دەبڕێ. دایك لەکن کوڕێك دەمێنێتەوە زەماوەندی نەکردبێ. ئەگەر کوڕێك ژنی نەهێنابێ خەرجی ژن هێنانەکەی بۆ دادەنێن. هیچی تری باس نەکرد. منیش لە ڕووم هەڵنەهات باسی میراتی یوسف و غولام بکەم. دامنا بۆ کاتێکی دیکە، بۆ ئەوەی شارەزایی لە هەموو کارێك پەیدا بکەم شتی ترم دەپرسی. دیگاریش ڕازی بوو. پرسیم: بابادییەکان کەم و زۆر چەندەن؟ گوتی: نێزیکەی ٥٠٠٠ بنەماڵە، گوتم: مەڕ و ماڵاتیان چەندەیە؟ گوتی: نێزیکەی ١٠٠/٠٠٠ سەر، سێ بەشی بزنەگەلە، نێزیکەی چەند هەزار سەر ڕەشەوڵاخ و کەڵ و گامێش و یەك سمیان هەیە. ئەم هەژمارەش نێزیکەی سێ

هەزار و چەند سەرێکی کەڵ و گامێشە، ئەوانەش لە گەرمەسێرن. زستانان لە دەوروبەری عەنبەر و لالی و، هاوینانیش لە شیرین بەهار، سارێن، سیگوەند و سەڵواتین. گامێشەکان زۆرتر عارەبی هۆگر بە هۆزەکە بەخێویان دەکەن. گامێش لە ساڵدا ٧ مەن ڕۆن دەدا، بە حیسابی ناوچەی خوزستان دەکاتە ٧ کیلۆ، لە کوهرەنگ ٦ کیلۆیە. دوو مەنی دەگێڕنەوە هەقی بەخێوکردنی، ٥ مەنی دەدەنەوە بە خاوەنی. دۆ و کەشکی بۆ ئەو کەسە دەبێ ئەم کەڵ و گامێشە بەخێو دەکات.

شێو هەڵوایەکی باشمان خوارد، لەگەڵ «مەشەدی ئەمیر سەردانی ڕەشماڵەکانی دیکەمان کرد، بە نیشانەی شەونشینی، وەختێ چووینە یەکەم خێوەت، وەك بڵێی ڕەشە با، هاتبێ لە پڕ خاو و خێزان کەوتنە کۆکردنەوەی ئەو شتانەی لەبەر دەستدا بڵاو ببوونەوە. بە گزیچار ژوورەکەیان گەسك دا، بوو بە تەپوتۆز، ئاوپرژێنیان کرد و فەرشێکیان ڕاخست، پەتوویان بەسەر دادا و دوو دەستە نوێنیان بۆ داناین پاڵی پێوە بدەین. ئێمەش پاڵمان دایەوە. خێرا ملیان نا لە سازکردنی چایی، ئەوان چاوەڕێ نەبوون ئێمە ببین بە میوانیان، ژن و منداڵ لە دەورمان کۆ بوونەوە و ملمان نا لە قسەوباس. لە هەڵواکەوە سەری قسەم دامەزراند، دەروازەیەکم کردەوە لەسەر باسی نان و چێشتی بەختیارییەکان، یەکێ لە خواردنەکانیان، «مزرۆکە» یە، ئەم خانمە هەمووی باس کرد، بەڵام من هیچ تێنەگەیشتم. مەشەدی ئەمیر بوو بە دیلمانجمان: ژنان بە هۆی ئەوەی ڕێگەیان پێ نادرێ لەنێو عەشیرەتەکە دوور بکەونەوە فێری زمانی فارسی نەبوون. مەشەدی ئەمیر لە زمان ئەم ئافرەتەوە گوتی: « ڕۆن دەقرچێنین، مێوژ و خورما، هەنجیر و بەهاراتی تێ دەکەین» مەشەدی ئەمیر ئەمەشی لێ زیاد کرد، لە بەینی گەرمێن و کوێستاندا وەختێ بە ڕێگەدا دەڕۆین، ئەوە خواردنمانە، کە دیارە ئەم خواردنە لەگەڵ نان و پەنیر و پیواز دەخورێت. واتە سێ مانگەی پایز بە دۆکڵێوی کەشك و مزرۆکە قنیات دەکەین.» دۆکڵێوی کەشك پیواز و ڕۆنی بە سەردا دەکەن، نانی تێ دەکوشین و دەیخۆین. زستانانیش، خورما، دۆشاوی خورما بە نانەوە دەخۆین. وەختێکیش زەو دەستی پێکرد، چ زۆرە شیر و ماست و دۆ، هەتا هاوین تەواو دەبێ. ژنە وشەی «کەلپتیر» ی بە زماندا هات. گوتم یانی چی؟ گوتی: نانی بەڕوو. بۆی باس کردم زۆرم بۆ گرینگ بوو، جارێ دەینووسمەوە تاکو لە نێزیکەوە دەیبینم. «ژنان بەڕوو لەسەر «بەردەڵە» دەکوتن، پرسیم بەردەڵە چییە؟ سووچی چادرەکەی نیشان دا. تاوێرە بەردێك لەوێ بوو بەردێکی خڕی بەسەرە، بۆ بەڕووهاڕین.

بەڕووەکە لەسەر ئەو بەردە تەختە ڕۆ دەکەن و بەو بەردەی سەرەوە وردی دەکەن. مەشەدی ئەمیر، لەسەر قسەی ژنانی نێو خێوەتەکە و ئەو پیاوانەی لەوێ دانیشتبوون. درێژەی دا بە قسەکانی، «ئاوی کوڵاوی بە سەردا دەکەن دەیکەن بە هەویر. سێ شەو دایدەنێن بترشێ، شەوێکیش دەیکەن بە سەلەی شووڵدا، لە ئاوی ڕەواندا ڕایدەگرن، بۆ ئەوەی تاڵییەکەی تەواو بێ. دیسا لەسەر ئەو تەختە بەردە دەیکەنەوە بەهەویر، ئەمەش پێی دەڵێن «کلك» بە ئەندازەی کێشی خۆی ئاردی گەنمی تێکەڵ دەکەن. دەبێتە کلپتی. ئەو نانەش لەسەر پنە بە تیرۆك پان دەکەنەوە و دەیبرژێنن. ئەگەر ئاردی گەنم کەمتر بێ، ئاردی بەڕوو زۆرتر، ئەوا ئەو نانەی بەدەست دێت، پێی دەڵێن «کەڵدەسی» بەدەست لە تاوەدا دەیبرژێنن. نانی بەڕوو لە سێ مانگەی زستان و مانگ و نیوێك بەهاردا ئەوە خواردنی ئەو خەڵکەیە.» یەکێ لە ژنەکان گوتی: «بڵێ بلیت بوهول چییە؟» مەشەدی ئەمیر گوتی: «هەرئەوەندەی باران لە بەڕوی گەیوی دا، ڕەنگیان دەبێتە قاوەیی تۆخ. سەر و بنی بەڕووەکان دەچنین و خۆڵەمێشی گەرمیان بەسەر دا دەکەین، بۆ ئەوەی ببرژێن قەولی دا بۆمان دروست بکات.

تاریکی تەپی دا سەرمان، چاو نەیدەدی ئەوەی مەبەستمانە بینووسینەوە. گایەك، هاتەوە ماڵێ و لە نێزیك خێوەتەکە ڕاوەستا، پرسیم هی ئێوەیە؟ هی ئەوان بوو، چی پێ دەکەن؟ گوتی، گێرە و کێشە، جووتکردن. جگە لە خۆمان خەڵکیش کاری پێ دەکەن. پرسیم مەبەستت چییە؟ گوتی: "هەر کەسێك گایەکە ببات بۆ کار، لە پێنج بەش بەشێك بە ئێمە دەگات. ئەگەر ئێمەش بەو گایە کار بکەین، دیسان لە پێنج بەش بەشێك وەبەر ئێمە دەکەوێ. ئەم داهاتەش دەبێتە ٥ کۆ" کۆیەکی بۆ گایەکە دادەنێن، کۆیەکی بۆ کرێکار، سێ کۆ بۆخاوەن زەوی و وەرزێر. خراپ نییە خەرجیی خۆی دەردەهێنێ و شتێکیش بە ئێمە دەگات. جووتێك قۆچ بەرانی کێوی، لە خێوەتەکەدا لەسەر توربێنێك بوو. خوار و خێچ تا بڵێی جوان بوون. پرسیم ئەوە چییە؟ خانەخوێ گوتی: «شاخی پازنە، پارەکە ڕاوم کرد. چاوەڕێم جووتێکی ترم دەست بکەوێ. (درگ)ی لێ ساز بکەم» مەشەدی ئەمیر بۆی شی کردمەوە، «درگ» پێڵاوی سەر بەفر. خەڵکی کوهرەنگ هەیانە و وەختێ لە چلگرد بەفر زۆر دەبێ لە پێی دەکەن. ئەم جۆرە پێڵاوە بۆ ئێمەی ڕەوەند نابێ، بەڵام لە کاتی ڕاودا لەسەر بەفری زۆری زستان بۆ ئێمە باشە. وردەوردە درەنگ بوو. جەعفەرقوولی لە هۆدەکەی خۆیەوە بانگی کردین بچین بخەوین.

شەوخۆشمان پێ گوتن و گەراینەوە بۆ خێوەتەکەی خۆمان. جەعفەرقوولی وتی دەبێ بەیانی بار بکەین، بخەون با بەیانی وەئاگا بێن. سبەی بار و بنە بۆ داوێنی شاخ ڕادەگوێزین. لە خۆشی دیتنی کۆکردنەوە و دیسان هەڵدانی چادر و ڕەشماڵ خێرا خەوتین.

## شەمە ١٠ی جۆزەردان

بەیانی وەختێ لە خەو هەستام، هەستم کرد تەواو حەساومەتەوە. چاوم بە دیگار کەوت حازر و ئامادە وەك نێچیرڤانان، کامێرەی بە دەستەوە بوو بۆ وێنەگرتن. خێرا خۆم پۆشتە کردەوە و کامێرەکانی وێنەهەڵگرتنم لەگەڵ خۆم هەڵگرت و لە خێوەتەکە هاتمە دەرێ. جەعفەرقوولی لە هۆدەی خۆیەوە گوڕاندی، «بار» لەگەڵ بیستنی ئەم وشەیە هەموو دەست بەکار بوون. بەخێرایی ئەستووندەکیان خست و ڕەشماڵیان کۆ کردەوە. تێڕ و توربێنیان لە هێستر بارکرد و سەرەوخوار داگەڕان، ئێمەش ملمان نا لە وێنەگرتن. ئەوان لە داوێنی چیا بوون و ئێمەش بە پەلە خۆمان پێگەیاندن، تاکو بتوانین لەکاتی هەڵدانی ڕەشماڵەکاندا دیسان وێنە هەڵبگرین. پێیان گەیشتین تەماشامان کرد، بۆ ڕەشماڵی جەعفەرقوولی خەریکن «سەنگچن لە پشت چادرەکە ساز دەکەن» ڕەشماڵەکە ڕووی لە چیا و پشتی لە ڕێگەکە بوو. ئەم کارەشیان بۆ ئەوە بوو، تاو لە نێوچادرەکان نەکا. هەمیشە چاویان بەسەر مەڕ و ماڵاتی خۆیانەوە بێت. دیمەنێکی جوانیان هەبوو، ڕەشماڵەکانیان لە جێی هەواری پێشتر هەڵدا. سنگ و گوڵمێخیان داکوتا، ئەستوونیان وەبەر دا و گوریسیان ڕایەڵ کرد و گرێیان دا. دەور و پشتی خێوەتیان کونبڕکرد، تەواوی ئەو کارانە لە ئەستۆی ژن و پیاوێك بوو. بە هۆی ئەوەی خێوەتی جەعفەرقوولی گەورەتر بوو، براکانی خۆی یارمەتیان دا. هەرخێزانەی ڕەشماڵی خۆی هەڵدا، تێڕ و توربێنیان لەسەر کولێن هەڵچنی. قاپ و قاچاخیش چووەنەوە سەرشوێنی خۆیان. مەشکە و دۆدانە و خیگە و دانەوێڵە لەسەر جێی خۆی. ئاور و کوچکاور هاتنەوە بەر مەیدان و چایی ئامادە بوو. هەتا دەمژمێرێك ئێمە لەبەر تینی تاوێ سەیری ئەم دیمەنەمان کرد. لەو ماوەیەدا دووکەڵی کوچکاور کوێری کردین. هەروەك هەمیشە دوو دەست پیاڵە و ئیستیکان لە پەنا ئاگردان ئامادە کرا. لە پێشدا دووچایی بۆ من و دیگار تێکرا، بە پێی بەرنامە سەر و چایەکی دیکەشمان خواردەوە، بە نیشانەی نەخواردن ئیستیکانەکەم

لار کردەوە، یانی بەسە، ئەمەش دوو ڕۆژ بوو فێر ببووم. دوای ئێمە سەرۆك ئێل و کاك ڕۆستەمی برای چایان خواردەوە تا گەیشت بە ئەوانی دیکە.

ڕەوەندان یەك یەك، خێوەتیان هەڵدا و کوچکاور دووکەڵی لێ هەستا. کۆی ڕەشماڵەکان دە دانە بوون، دوانیان خێوەتی سپیی سەرۆك ئێل، یەکیان تایبەت بە میوان دانەیەکیش بۆ نوستن. بەڕەیەکی درێژیان بەسەر تێرەکاندا دابوو. بە چیخ کۆزێکیان دروست کرد و بەرخەکانیان تێ کرد. چیخ چنەکانیش چیخیان چنی و ئێمەش وێنەمان لێ هەڵگرتن. ماشێنێك هات و لە دەشتەکە ڕایگرت. هەرهێندەی پێنەچوو بەیتاڵی ئێل پەیدا بوو. هەر ئەو کوڕە جەحێڵەی لە چلگرد دیتبووم. «مرادی»، کوڕێکی بەکار و توند و تۆڵ، پاك و ڕووڕاست. جێی باوەڕی ڕەوەندان. لە هەموو هۆبە و هەوارێك پێ بە پێ لەگەڵیانە، ئەمڕۆ هاتووە ڕانەکە واکسێنە بکات، تاکو تووشی نەخۆشی خۆراکی نەبن. سەلامێکی گەرموگوڕمان کرد و بە بێ کاتکوشتن، بە یەکەوە بۆ شوێنی مەبەست وەڕێ کەوتین. دالانێکیان بە چیخ و وشکەچن ساز کردبوو، هەر ئەو شوێنە گزرە و تفاقی تێ دەکەن. چۆخەیەکیان بۆ دکتۆر ڕاخستبوو. بەیتاڵ دەرزی بە دەست ئامادەی کوتان بوو. ڕانەکە لە پشتەوە بە فیکە و هێ هێی شوانان ڕەوانەی ئەم دالانە دەکران و کەسێك هەرجارەی مەڕێکی دەگرت و دەستی بەرز دەکردنەوە و مرادی دەرزیی دژە نەخۆشیی لێ دەدان. ئەم کارە زۆر بەخێراییی بەڕێوە دەچوو. ئەو گەنجە لەنێو ئەو هەموو پەین و تەپوتۆزەدا دەژیا. ئەوێی لە شەقامە ڕەنگینەکانی تاران پێ خۆشتر بوو. وەختێ ماندوو بوو، جەعفەرقوولی یاریدەی دەدا. ئاژەڵداران لەگەڵ ناوی فەرەنگی دەوا و دەرمانەکە ئاگەداری تەواویان هەبوو. مێگەلێك واکسێنە کرا، گەڕاینەوە بۆ نێو ڕەشماڵەکە و نانی نیوە ڕۆمان خوارد. دوای نانخواردن بەیتاڵ دەست بەکار بووەوە و ئێمەش لە کنیان ڕاوەستاین. وەك جاری پێشوو جەعفەرقوولی یاریدەی دکتۆری دا. دیگار تەواوی قسەکانی ئەوانی تۆمار کرد. کوتان کۆتایی هات و گەڕاینەوە خێوەتەکە. من و دیگار وەلای سەرێ کەوتین، پاڵمان وەدەستە نوێنەوە دا، بەڵێ میوان عەزیزە. سەرۆك ئێل پاڵی دابوو بە ئەستوونی تاوڵەکەوە، بە نیشانەی میوانداری نۆکەرانی خان هەموو لەبەر دەرگەی خێوەتەکە ئامادەی خزمەت وێستابوون. ئەوە ڕاستە جەعفەرقوولی سەرۆك ئێلە، ساماندارە و دەسەڵاتی هەیە، هەمیشە سفرە و خوانی بۆ میوان ئامادەیە،

ئەوەندەی من بیناسم ئاکاری پیاوانەیە و ڕەوشتپاك و دلۆڤان و دڵاوایە. کەسێکی بەهێز و سوارچاکە، دەست و تفەنگی باشی هەیە، هەر وەك ئێلاتییەکان دەڵێن پیاوی دەوێ شان لە شانی بدات. جگە لەمانەش وەك باوکێك وایە بۆ تەواوی هۆزەکەی. درۆی بە دەمدا نایات، ڕووڕاست و قسە لە ڕووە، لە کەس ناترسێ. ئەگەر نۆکەرەکان لە دەرێ دادەنیشن لەبەرئەوە نییە جەعفەرقوولی پێی گوتبێتن، بگرە ئەمە نەریتێکی کۆنە لەنێو هۆز و خانەکاندا، ئەم دابەش قەت ون ناکەن. ئامانجیشم ئەوە نییە بەشان و باڵی جەعفەرقوولیدا هەڵبڵێم. مەبەستم ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی ئەو هۆز و ئێلاتانە بوو.

یەکێ لە نۆکەرەکان مات و پەرێشان دەستی لە ئەژنۆی هەڵپێکاوە، قڕوقەپی کردووە، سەری بەرداوەتەوە و چیلکە لە عەرزی دەژەنێ. ئەو پیاوە هەر ئەو خواڕەحمەیە، شەوانە لە خێوەتەکەدا لە لای ئێمە دەخەوت. وەختێ دەچووین بۆ چلگرد بە شانی ماڵاتەکدا ڕایی دەکرد و زۆریش سەر و دڵخۆش بوو. خەفەتی هیچی نەبوو، بەڵام ئێستە نازانم بۆچی نێوچاوانی تێکناوە. زۆرم هەوڵ لەگەڵ دا، سەرتا هیچی نەگوت، بەڵام ئاخری ملی نا لە دەردی دڵ هەڵڕشتن. تێگەیشتم شەوی ڕابردوو ٥ بەرخی جەعفەرقوولی گورگ خواردوویەتی. شوانەکەش برای خواڕەحم بووە. خواڕەحمیش هێندەی پێ ناخۆش بووە تۆراوە و ئێستەش پەشیمان بۆتەوە و گەڕاوەتەوە. نیگەرانی ئەوەیە ئاخۆم جەعفەرقوولی ڕایدەگرێتەوە. ئەوە هەموو خەم و خەفەتی ئەو بوو. بەیتاڵ چوو بوو بۆ ماڵی ئاغا ڕۆستەم، جەعفەرقوولی لە ڕەشماڵەکەدا لەنێو خاو و خێزانەکەیدا بوو. من و دیگار و خواڕەحم بە یەکەوە بووین. دیگار بە بن گوێیدا چرپاندم ئاودەستێك ساز بکەین. ئەم پێشنیازەم زۆر پێ باش بوو، تا بڵێی یەك و دوو، هەستاین و هاتینە دەرێ. جەعفەرقوولی وەختێ پێی زانین پرسی خەریکی چین؟ گوتم وای بە باش دەزانم ئاودەستێك ساز بکەین. گوتی، پێیان دەڵێم بۆتان ساز بکەن، بەڵام ئێمە حەزمان دەرکرد بە دەستی خۆمان دروستی بکەین. بەردمان کۆکردەوە و لە پشت تاوڵەکان چوار دیواریکمان دانا. جەعفەرقوولی هات بۆ لامان، زۆر پێکەنی و چوو کامێرەکەی ئێمەی هێنا و چەند وێنەیەکی لێ هەڵگرتین. هاتینەوە نێو ڕەشماڵەکە، پرسیم ڕۆستەم خان لە کوێیە؟ گوتی خەریکی واکسێنەی مەڕەکانییەتی. جەعفەرقوولی ڕاکشا و ئێمەش چووین بۆ لای ڕۆستەم خان. بە دەستی خۆی خەریکی کوتانی بەرخەکان بوو. بەیتاڵ دەستووری دابوو یەك

سمەکان بێنن دەرزیان لێ بدەن. هێنایانن. بەزمێکی خۆش بوو، هەریەکەی بە لایەکدا ڕای دەکرد. وەختێ سواریان دەبوون ئارام دەبوونەوە و ڕادەوەستان. واکسێنەیان لەژێر پێستی ملیان دەدا. هێسترەکان هەڵیان دەخستەوە و ڕایان دەکرد. هێسترێك بە کەس زەوت نەدەبوو. هەوڵی دەدا بۆی دەرچێ، بەڵام خەڵکی زۆری لە دەور بوو ڕێگەی نەبوو. لە دوو لاوە گوریسیان خستە لاقی، بەڵام ئەو دوو کەسەش پێی نەوەستان. ئەمجار گوریسیان بۆ کردە کەمەند، جەعفەرقوولی هاتە یاریدەمان، گوریسیان هەڵسووڕاند و لاقی چارەوێی تێکەوت، جەعفەرقوولی سەری گوریسی ڕاکێشا و هێستر پێوە بوو. بە هەموو هێزی خۆی توانی ڕای بگرێت. ئەم بێزمانەیان گرت و لچی خوارێ و هەردوو گوێیان باهەڵدا. هێستر جووڵەی لێ بڕا، واکسێنیان لێ دا و بەرەڵایان کرد. هێستر وەختێ دەربازی بوو نەیدەزانی بە چ لایەکدا هەڵێ.

کاری دەرزیلێدان تەواو بوو، ئێمەش هاتینەوە چادرەکەی خۆمان، بە دووی ئێمەدا بەیتاڵ و ڕۆستەم خان هاتن و برایەکی پەرویزیش هات. ڕۆستەم داوای شووشەیەك دەرمانی کرد کەچی بەیتاڵ پێی نەدا. تەنیا سۆرەنگی دەرزییەکەی بۆ پڕ کرد. شوشەیەکی دەرمان دا بە جەعفەرقوولی بۆ کوتانی بزنەکانی پەرویزی.

چایی خورایەوە و بەیتاڵ و ڕۆستەم خان و پەرویزی ڕۆیشتن. دیگارسەبارەت بە شێوەی لێکۆڵینەوە و نووسینی فیشی کارەکەی زۆری قسە بۆ کردم. شێوەی کار و زانیارییەکانی لە دەفتەرێکدا نووسی بۆوە، وەك مامۆستایەك نیشانی دام، زۆرم سوپاس کرد. دەمە و زەردەپەڕ لەگەڵ جەعفەرقوولی سەبارەت بە ئاژەڵداری قسەمان کرد، کەڵکمان لە قسەوباسی ئەو شوانانە وەرگرت کە لەوێ بوون. ئەم ناوانەی خوارەوەمان نووسییەوە:

بزنەگەل، گیسك: کەمتر لە یەکساڵ. دووبڕ: نێری لە یەك ساڵ بەرە و ژوور. «بەڵام لە کوردیدا یەکبڕ و دووبڕ بۆ یەك سم بەکار دێت». بەلەبۆز: ئەو نێرییەی دەکەوێتە پێش ڕان. مێگەل: ناوە بۆسەرجەم مەڕ. قۆچ: بەران. گوێلك: گاو و مانگای کەمتر لە یەك ساڵ. پانێر: گوێلکە نێری یەك ساڵە. جاش: گوێدرێژ: بەچکە کەری کەمتر لە یەك ساڵ. جوانوو: بەچکە ماین: کەمتر لە یەك ساڵ.

ئەو ناوانەمان دەپرسی، جەعفەرقوولی وەڕەز بوو، برسی بوو. دەستووری دا شێویان هێنا، گۆشتاوێکی ئێلاتیمان خوارد. هەتا بوو بە دەمژمێر یازدەی شەو حەپەی سەگ و

لوورەی گورگ و دەنگی زەنگ و زەنگوڵەی نێری و بەران و شوانمان تۆمار کرد. لە نێزیك کوچکاورەکە دانیشتبووین، سەیری بەرۆکی پڕلە ئەستێرەی ئاسمان، تەونی هەزار خەیاڵی لە سەردا دەچنین. خوامرادیش لە لای ئێمە دانیشتبوو، جێمان پێدادا و دەستەملانی بووکی خەو بووین.

## یەکشەمە ١١ی جۆزەردان

بەیانی تاو و بان گەرم ببوو لە خەو هەستاین. خوامراد ڕۆیشتبوو، کەلوپەلی خەومان کۆ کردەوە و خۆمان نیشان دان، نانی بەیانیان هێنا و جەعفەرقوولی تەشریفی هێنا، زەبتمان دانا، دەنگی سەگوەڕمان پڕقەوە کرد، دەتگوت لە خێوەتەکدا شەڕەسەگە. سەگەلی ئەو دەوروبەرە چادریان گەمارۆدا، ئەوەندە پێکەنیبووین ئاو لە چاومان دەهات. زەبتمان کووژاندەوە، سەگوەڕ کۆتایی هات. ئەوشەوە تا بەیانی جەعفەرقوولی نەخەوتبوو، لەیلای بەرمەمکانەی جەعفەرقوولی زۆر نەخۆش بوو، هەر ئێستە بمرێ یان تاوێکی دیکە. پلەی گەرماپێو، سی و هەشت و نۆی نیشان دا، زۆرم پێ سەیر بوو، گوتی شەوێ چل بووە. خوامراد چوو بوو بە شوێن حەکیمدا. لەبەر دەرگەی ڕەشماڵەکە ڕۆستەم خان بزنەکانی پەرویزی واکسێنە دەکرد. لێی نێزیك بوومەوە و لەبەر ڕووناکاتیی هەتاو وێنەیەکمان گرت. دیگار دیسان دەنگەدەنگەکەی تۆمار کرد. لە خێوەتەکەدا دانیشتبووین، دکتۆر وەژوور کەوت. پیاوێکی کامڵ بوو، جانتاکەی بە دەست خوامرادەوە بوو، سەلامی کرد و بە بێ مەحتەلبوون کەلوپەلی پزیشکیی لە ئاودا کوڵاند و منداڵەی پشکنی. ڕیخۆڵەکانی چڵکی کردبوو، دوو دەرزی لێ دا و شووشەیەك حەبی پێ دا. بی بی ئێران، خێزانی جەعفەرقوولی بە لایەوە ڕاوەستابوو، زۆر بۆی بە پەرۆش بوو. لە دکتۆری پرسی چاك دەبێ؟ دکتۆر بە جەفەنگ گوتی، تۆ هەر لە ئێستەوە پەنجا هەزار تمەن شیربایی ئەو کچە وەرگرە. بی بی ئێران، مارەییەکەی پەنجا هەزار تمەن بوو. کچی محەمەد خانی پەرویزییە و دایکیشی کچی «سەمسام»ە، خوێندەواریی هەبوو جوان قسەی دەکرد.

دەوا و دەرمان درا بە کچە، پیرێژنێك هات و حەبی وەرگرت و ڕۆیشت، منداڵێکی نوقسانیان هێنا و دکتۆر پشکنی و بڕیار درا بۆ چارەسەری ڕەوانەی ئەسفەهانی بکەن.

پیاوێك هات تووشی کەمخوێنی هاتبوو، دەبوو ئەمەش پێی ڕابگەن. دواندنی دکتۆریش شارەزایی باشی بە ئێمە دەبەخشی. دەیگوت، بەختیارییەکان تەنیا هەلاّمەت و ژانەسەر دەگرن، نیخەی سنگیان دێت. کەم وا هەیە تووشی نەخۆشیی دیکە بێن. وتی: هەتا ئێستە دووجار نەخۆشی بەشی فریاکەوتنمان بووە. یەکیان ئاغا جەعفەرقوولی زۆری نەمابوو ڕیخۆڵە کوێرەی بتەقێ، بەزەبری سەهۆڵ گەیاندمانە ئەسفەهان، لەوێ عەمەلمان کرد. ئەوی دیکە ژنێکی دووگیان بوو بە هۆی کێشەی دێزەڵەی لێنەدەبووەوە. بەفر و سەرمای دەمەو بەهاری زەردکۆیان پێ ناکەوێ و تووشی هەلاّمەت دەبن. تەواویان لەش ساخن. کەمتر نەخۆش دەبن. ژنیان بەبێ دکتۆر منداڵیان دەبێ، وا هەیە بەدەم ڕێگەوە لە پشت گابەردێك منداڵەکەی دەبێت و لێ دەبێتە و هەرخۆی نێوکی دەبڕێت. نە تووشی نەخۆشی دەبن و نەخوێنیشیان لەبەردەڕوات. ژینگەکەیان خاوێنە و هەموو شت لە جێی خۆیدایە، تەنیا ناتوانن پاکوخاوێنیی خۆیان ڕابگرن. ئەو جلوبەرگەی دەیکەنە بەریان هەتاکو تاو نەیسووتێنێ و نەڕزێ داینانێن. ئەگەرچی کەمتر گەرماو دەکەن، زۆریش لەش ساخن. حەزی دەکرد بزانێ بارودۆخی خوێندن لە دەرەوەی وڵات چۆنە سەبارەت بە پزیشکی. بەتەما بوو لە دەرەوە درێژە بەخوێندن بدات. دیگار گوتی، لێرە پێویستییان بە دکتۆرە و تۆش دەڕۆی؟ ئەویش هەروەك ئەوخەڵکە وتی، «ئێرە بۆ منداڵەکانم بەکار نایات، چی لەوان بکەم؟». تەواو. پرسیم سەردانی تەواوی ڕەشماڵەکان دەکەی؟ گوتی: نا، هەرگیز، تەنیا لەبەر جەعفەرقوولی خان هاتم. یەك ڕاست ئەمەی وت. واقم وڕما. ئەمەش نموونەیەکی دیکەی. جەعفەرقوولی کاوڕێکی سەر بڕی و کەبابێکی دەرخوارد دا، بە پیاسەکردن هەتا بەردەم ترۆمبێلەکە لەگەڵی چوو. بە وتەکانیدا بۆم دەرکەوت لەگەڵ دەوڵەت پەیمانی هەیە و ئەو پەیمانەش لە ناوچەی بەختیاری ڕایگرتووە. تەواو بەتەمای هەلاّتن بوو. تەواو بە پێچەوانەی ئەو جەحێڵە بەیتاڵە، کە زۆر دڵسۆزانە خزمەتی مەڕ و مالاّتی ئەو هۆز و ئێلاتەی دەکرد، وای دەزانی هەمووی هی خۆیەتی.

هەوا زۆر گەرم بوو هەمووخزابووینە خێوەتەکەوە و هەناسەمان دەر نەدەهات. جەعفەرقوولی ون بوو. مێشکی زەوی دەکولاّ و هەرد و بەرد هەڵمی لەسەر هەڵدەستا. بەژدارەکانیش لەبەر سێبەری تاوڵەکان سەریان کردبووە سەر دەستیان. بێدەنگی وڵاتی لەژێر چۆك نابوو. دیگار

ویستی بچێ مەسینەیەك ئاوبێنێ، سەگەل ڕێیان پێنەدا. چارەی نەما و گەڕایەوە. کچەکەی جەعفەرقوولی ئافتاوە ئاوی بۆ هێنا. ترسەنۆکیی خۆی نیشان دا. دەرفەتێکی باش بوو بۆ سەرخەوێك. جەعفەرقوولی بە ئێل و عەشیرەتەوە گەڕایەوە و دەور و بەرمان قەرەباڵغ بوو. دەرکەوت چووە سەردانی ڕانەکەی کردووە. وەختی دۆشینی مێگەل بووە، دیگار نێو چاوی تێك نا بۆچی بە ئێمەت نەگوتووە، گفتی دا سبەینێ. بوو بە کەباب برژاندن و هەر کەسە و هەوڵی دا زگی خۆی تێر بکات. جەعفەرقوولی بە جێی هێشتین، مەشەدی ئەمیر لە لامان مایەوە. تەمەنی حەوت ساڵ بووە نێزیکەی ٥٠ ساڵە بە بێ خەڵات و بەرات خزمەتی ئەم بنەماڵەیە دەکات. سێ بەهار لە جەعفەرقوولی چکۆلەترە بەڵام بیست ساڵ پیرتر دیاری دەدا. سەری سپی بووە و تاق ددان لە دەمیدا نەماوە. ئەگەر بیدوێنی لەسەر ڕەوەند و ئێلاتی و گەرمێن و کوێستان جانتای پڕە لە چیرۆك. زۆرم حەز کرد لەو کۆچ و کۆچبارەدا لەگەڵێدا بم. کاکڵی قسەکانی ئەوە بوون. هەڵبەت ڕاوێژی خۆش بوو، بەڵام نەمدەتوانی وشەکانی بنووسمەوە. مەشەدی ئەمیر لە دەنگ تۆمارکردن بێزارە و ڕازی نەبوو قسەکانی تۆمار بکەین. تەنانەت پێش بە جەعفەرقوولی دەگرێ ئەویش لەمایکرۆفۆنەکەدا قسە نەکا. ئەمە پوختەی قسەکانی بوو. ئەلێرەوە دەکەوینەڕێ، هەتا دەگەین بە کۆەزەرد، هەموو شتێك ساکار و دوور لە شتی سەرنجڕاکێشە. ئەوەی هەیە ڕێگەیە و بەردەڵان. ئەوسا لەوێوە هەوراز و زەردوما دەست پێ دەکات، تمتمانە، هەڵدێر و تاوێر و نشێو. هەر دیمەنێك دەبینی چیرۆکی هۆبە و هەوار و مەڕ و مەڕداری لە خۆ گرتووە. ژن دووگیانە و منداڵێکی بە کۆڵەوەیە، گایەکی بار کردووە و لەم ڕێگەیە وەپێش خۆی داوە. باران دەبارێ و بە پەلە ڕەشماڵەکان هەڵدەدەن. گریان و نوکەی منداڵان، کاڕەی مەڕ و باعەی بزنەگەل، دەنگی سەگوەڕ، بۆڕەی گاوگۆل و فیکەفیکی شوان، گوڕە و دەنگە دەنگی ئەو خەڵکە دەر و دۆڵی پڕ کردووە. باران بە لووزە و سەرەوخوار دێت، ئاو بە تەمای ماچی شیو و دۆڵ سەری پێوە ناوە، خەریکە خۆ دەخزێنێتە ڕەشماڵەکانیشەوە، بەڵام ڕەوەندان گوێیان لێ نییە و دەخەون، دەبێ بخەون خۆیان بۆ گەیشتن بە شوێنی مەبەست ئامادە بکەن. پێخەف باران خووساندوویەتی، لە تاریك و ڕوونی بەیانیدا بار و بنە باردەکەن و ماوەی ڕێگە دەبڕن. هەتا بەرەو پێشڤە دەچن هەورازە و ئەستەم، بزنەڕێیە و هەڵدێر، سەرکەوتنە ڕوو بە سەختیی سەرما. بەفر زۆرە و جێ جێ، لە ئەژنۆ دەدا. کڕێوە و باڕن دەست پێ دەکات، ئاسمان و زەوی سپیپۆشە. با و بۆران بەفرەکە ڕاپێچەك دادا و چاوچاو نابینێ، بەڵام ڕەوەندان سوورن لەسەر

ڕێگەڕۆیشتنی خۆیان. ڕاوەستان و سرەوتن لە لای خێڵەکییان بێ واتایە. نابێ کەس لەو ئێلە دوا بکەوێ. ئەوە یاسای ژیانی خێڵەکیانە. منداڵان هەر ئەوەندەی لەسەر پێی خۆیان ڕاوەستان بەرپرسی ژیانی خۆیانن. دەبێ ڕێگە ببڕن. نابێ لە ڕێگە بکەون دایك و باب هەر کەسە و ئەرك و وەزیفەی خۆی دیارە. لەسەر ئەم هەموو چارەوێ و بار و سەربارەڕا، جێیەك نییە منداڵێکی پێڕەوکەی سوار بکەن. ئەوەی پیر و زورهان و پەککەوتەیە یان ئاغا و کوێخایە بۆی هەیە سواری ئەسپ و هێستر بێ. هەرچی خێوەت و چیخ و نوێن و بانە، باری یەکسمان کراوە. ئەگەر کەلوپەل توانایی ڕۆیشتنی هەبوایە دەبوو ئەوانیش بە پێیان بڕۆن. دایکێك لانکەی بە کۆرپەوە داوە بە کۆڵدا پێ بە پێی ئەو خەڵکە ڕێگە دەبڕێ و منداڵێکیشی لە قەڵاندۆشی کردووە، هەوڵ دەدا هەرچۆنێك بێ لەو کۆچ و کۆچبارە بەجێ نەمێنێ، بگا بە هەواری گەرمەسێر، هەوا ئارامە و شوێنێکی سازگارە بۆ هەوارچیان. لەگەڵ هەوا دەگەڕێن، هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان لە سرووشت وەردەگرن. لەو ڕێگەیەدا نان و خۆراکیان ئاردی بەڕووی برژاوە. واتە لە دابەشکردندا، کۆمەڵناسان، ئەوانە دەورەیەکی تەواو سەرەتایی «کۆکردنەوە» دەبەنە سەر. یانی سەرەکیترین جۆری بەدەستهێنانی خۆراك. هەر ئەوانەن لە سەفەری پڕمەترسی ڕێگەی دوور، شەو و ڕۆژ بە بێ خۆف بەنێو گیاندارانی دڕندەدا، هەر وەك گورگ و بەراز و چەقەڵ و پڵنگ، مار و دووپشك و گەزۆك و خزۆك دەڕۆن و ناوەستن. تازە خۆیان بە سرووشت سپاردووە، ترس لە لای ئەوان واتایەکی نییە. ئەگەر ترسێکیان ببێ، لە مرۆڤ دەترسن، ئەویش لەو کەسانەی لە شارەوە هاتوون. زۆرجار وا بووە منداڵێکی هەشت ساڵانە دوو گورگی ڕەپێ ناوە و نەیهێشتووە کاوڕێك بخۆن، ئەویش بە دەستی بەتاڵ. پیاوەکانیش دەبێ شان بە شانی شوانەکان ئاگایان لەو مەڕ و ماڵاتە بێ، لە ئاوی ڕووباران بیانپەڕێننەوە. نەهێڵن ئەسپ و هێستر هەر یەکەی بە لایەکدا ڕا بکات. ئەسپی سڵۆك و هێستری لاسار و نەسرەوتوو، دیق بە خاوەنی دەکات. هەر لەو سەفەرەدایە «نان و دۆی ترش، تۆراغ، نان و پیاز، خواردنی ئەو ڕەوەندە زەحمەتکێشانەیە.»

مەشەدی ئەمیر چەنەی گەرم داهاتبوو، بە سەدان دیمەنی هەر بە قسە لە هۆبە و هەوار و خێڵ و ڕەوەندان لە پیشانگەی چاویدا نیشان دەداین. ئێمەش شەش دانگ هەست و هۆشمان لە لای ئەوە و سەیری ڕەوکە و ڕان و قەتارەی ئەو خلێلەساتە کردووە. مێگەل لە لایەك و ڕەوکەی یەکسمان لەو لاوە لەو بژوێنە دەلەوەڕێن. کیژۆڵەیەکی حەوت یان هەشت ساڵانە سواری ماینێکی جوانی بە بێ زین و جل بووە و ئارام ئارام بۆ لای ماڵی ڕۆستەم خان

دەچێ. ئەو کیژۆڵەیە بە پێیان، بەتاقی تەنیا کندرێکی پێیە و کەوتۆتە کێوان، دەگەڕێ تاکو چارەوێ ببینێتەوە، هەرچۆنێك بێ ڕەشمەی بکات، سواری بێت و بە نەرمەغار بیهێنێتەوە ئاو و خوێی بداتێ، دووبارە بیباتەوە بۆ ئەو کەژ و کێوە. بینیومانە کورێژگەی هەشت تا دە ساڵان، بە کێو و شاخەوە لەبەر بەرغەلن، لەنێو ئەم هەموو گورگ و بەرازەدا چەکی دەستیان تەنیا گالۆکێکە بە ئەندازەی باڵای خۆیان. جەعفەرقوولی گەڕایەوە، ئاگر کرایەوە و دووکەڵ داوێنی ئاسمانی گرت. زەردە جێی خۆی دا بە تاریکی و لە دەوری ئاور دانیشتن کەیف و سەفای لە لایە. ڕۆستەم خان هات و چەند بەختیارییەك دەوریان داین. بازاڕی قسە و باس خۆشە، باس باسی ئاژەڵ و پەز و کۆچ و هەوارە، کەمتر باسی وەرزێڕی و کشتوکاڵ دێتە ئاراوە. شێو خوراوە، قسە و باسەکە بوو بە شانامە و کۆتایی نەهات. ئەوەی بەکار دەهات قسەکردن و دواندنی بەختیارییەکان بوو. زۆریشم پێ سەیر بوو چۆن لە یەکدی تێدەگەیشتن. دیگار تەواوی ئەو گرمە و قاڵەی تۆمارکرد. زۆریەك لەو کەسانە لاسایی ئەوانەیان دەکردەوە لەوێ نەبوو. قاقایان دەکێشا. وەختێ دیگار نەوارەکەی بۆ هێنانەوە، ئەوەڵ قاقاکێشان گەیشتە ئەوپەڕی کەژ و کۆ. بەختیارییەکان بە هەستەوە گوێیان بۆ قسەی خۆیان ڕاگرتووە.

وەختی خەوهات و ئەوانیش بڵاوەیان کرد، ئێمەش هەر کەسە و لە حاستە خۆی ڕاکشاین، تازە خەریك بوو چاومان گەرم دەبوو، چەق و لوور و سەگوەڕ دایچڵەکاندین. گوێدار و بێ گوێ وەخەبەر هات. زانیمان سەگەل هەڵمەتیان بردووەتە سەر شوانەکانی ماڵی پەرویزی بە وێدا تێدەپەڕین. ئەمەش سەگوەڕێك بوو هیچی دیکە، ئەم شتانە لێرە زۆر ئاساییە.

## دووشەمە ١٢ی جۆزەردان

خواردنی ئەم بەیانییەش نان و ماست و ڕۆنەکەرە بوو. چاوەڕێی وانەبێژی عەشایەربوون. زۆری پێنەچوو تەشریفی هێنا، ئەم گەنجە ساڵێك بوو کاری لەگەڵ ئەوان کردبوو. دیاربوو جارێ بەم چەند ماڵە بیست قوتابی هاتوون. قسەیان لەوە کرد لە باتی قوتابخانە، خێوەتێك لە کوێ هەڵدەن. ئاخری لەسەر ئەوە ساخ بووینەوە هەستاین و بەرانبەر ماڵی ڕۆستەم خان خێوەتی فێرگەمان هەڵدا. خێوەتێکی سپی گومبەدی. هاتینەوە تاوڵەکەی خۆمان، ئەو خەڵکە سوێرقسە و ئێمەش تامەزرۆ، کوێخای ئاوایی فانیاوا لەوێ بوو. ئەم گوندە بە ناوی «محەمەد کازمی فانی» شاعیری ناوداری عەشیرەتەوە ناو نراوە، کەم وا هەیە بەختیارییەك ببینی و شیعری ئەم شاعیرەی لەبەر نەبێ. وەختێ ئەم هۆزە لەم شوێنە نیشتەجێ دەبن، ئەم ئاواییە سازدەکرێ و ئەو ناوەی لەسەر دادەنێن. قەول وابوو کوێخا چەند جەحێڵێك کە هێشتا ناسنامەیان بۆ نەکراوە، بیان داتە دەست ئیدارەی نیزام تاکو ببن بە سەرباز. ناوی سەربازەکانی پێ بوو وەختێ لە گیرفانی دەرهێنا و خوێندییەوە، بابی یەکێ لەو ناوانە لەوێ دانیشتبوو. کوێخا پێی دەگوت: تۆ بڵێ نازانم کوڕەکەم لە کوێیە، منیش دەڵێم نەمدیوە، بەڵام هەتا کەی؟ چارە نییە هەردەبێ بچێ و سەربازی بکات. کەیفی لە شۆخی و جەفەنگ بوو، گوتی: یان پەلە ناکەین خوا دوو کوڕی دیکە بەشا بدات، ئەویش لە خۆشی کوڕان عەفوو بۆ سەربازەکان لێ دەدا و دەیانبەخشێ.

سەگوەڕ دەستی پێکرد و خەبەریان هێنا غەریبەیەك هاتووە. دووکەس نێزیك بوونەوە هەر کەسە و هەوساری چارەوێی خۆی بە دەستەوە بوو. سەگەل گەمارۆیان دابوون ئەسپەکان خەریکی ڕاکردن بوون. یەکیان جلکێکی شڕوشیتاڵی لە بەردا بوو، کۆتێکی هەراوی قۆڵ درێژی کردبووە بەری و سەردەستەکانی هەڵدابووەوە. مەعلوم بوو چەرچییە، خەریکی سات و سەودایە. پەنایەکی عەلاحیدەی دابین دەکرد و ئەو کەلوپەلەی دەیکڕی لەوێدا عەمباری دەکردن هەتا ئەو ڕۆژەی دەگەڕایەوە بۆ شار، باری دەکرد و دەیبردن.

وەختی دۆشینی مێگەل بوو. «می نسا»ی لووڕ، خێزانی جەعفەرقوولی لەگەڵ ئافرەتێکی دیکە خەریکی مەڕدۆشین بوون. ئێمەش جێ نەدەما نەچین و وێنەی لێ

هەڵنەگرین. لە دوورەوە چاومان لێ بوو ترۆمبێلێك هاتە بەر ڕەشماڵەکان و ڕۆیشت. دوای ئیستێك جەعفەرقوولی قاوی لێ کردین. چووین بۆ لای خێوەتەکان. سەیر بوو سەگەکان ئەوجار کاریان بە ئێمە نەبوو. ئەمەش لەبەرئەوە نەبوو ئێمەدەناسن، بگرە یەکێ لە بەختیارییەکان گوتبووی ئەو چۆخە درێژە مەکەنە بەرتان. ئەم گەماڵانە هەر کەس چۆخەی لە بەردابێ پێی دەوەڕن! قسەکەی ڕاست بوو، لە بەیانییەوە چۆخەم نەکردۆتە بەرم ئەوانیش کاریان بە ئێمە نییە. بەبێ ترس و دوودڵی ڕۆیشتم بۆ لای چادرەکە. ئێمەیان بە محەمەدخانی پەرویزی ناساند. بابی بی بی ئێران و برای بی بی شەوکەتە. بە واتەیەکی تر لە لایەك برای ژنەکەی جەعفەرقوولییە و لە لایەکی دیکەشەوە خەزووریەتی. پیرەمێردێکی قەڵافەتدار و لاقێکی شەل بوو. مێردی کچی سەمسامە. واتە لەبارەی ژن و ژنخوازییەوە تێکەڵ بە خانەکان بووە. لە لای هەمووان ڕێزی تایبەتی هەیە و پیاوێکی ژیر و هۆشیارە. باسی ڕاو و شکار و جوامێری و مرۆکوژی هاتە گۆڕێ. وای لێهات باسەکە هاتە سەر بەراز، گۆیا لەو ڕۆژانەدا زۆری بۆ ناوچەکە هێناوە و ماینێکی سەقەت کردووە. وابوو بە چاوی خۆمان دیتمان. زۆریش بەداخەوە بوون بۆ دەبێ لەنێو ئەو هۆزەدا چەك نەبێ بۆ کوشتنی ئاژەڵی دڕندە. یەکێ وتی، ژاندرمەکان بێن و بیکوژن. شانۆنامەی «دار بە دەستانی وەرزیلم وەبیرهاتەوە و زۆریش پێکەنیم. دوای نانی نیوەڕۆ باسی دزینی هێستر هاتە ئاراوە. تاوانبار خۆی خستبووە پەنای جەعفەرقوولی ئەگەر کارێکی بۆ بکات.

هەر ئەوەندەمان زانی دەنگی سەگوەڕ پەیدا بوو، پیاوێك دەهاتە پێشێ مەندیلی سەوز لە سەردا. سەید، تەشریفی هێنا. سەگەل دەوریان دا، ئەم ڕێبوارانە بۆ بەرگریکردن لە خۆیان شێوازێکی تایبەتیان هەیە، بە بێ ئەوەی گوێ بدەن بە بەژدار سەریان دادەخەن و بە ڕێگەی خۆیاندا دەڕۆن، لە پشت خۆیانەوە داردەستەکە هەڵدەسووڕێنن، گەماڵیش لە ترسی دار نێزیك نابێتەوە. سەید، گەیشتە بەر دەرگەی ڕەشماڵەکە و سەلامی کرد و هات دانیشت. ڕدێندار و بێ سمێڵ بوو. کوێخا ملی نا لە پرسیارکردن، بەڵام ئەو خۆی گێل دەکرد و وەڵامی نەدەدایەوە. کوێخا گوتی، من دەبێ بزانم چ کەسی و لە چی دەگەڕێی لە کوێوە هاتووی. ئەمجار گوتی، من وەجاخزادەم، حوسێنی نەسەبم. خەڵکی خوزستانم، هاتووم هەقی جەددم وەربگرم. هەرچۆنێك بوو بە

بێ شەرمی خۆی پێنج تمەنی هەقی جەدی لە جەعفەرقوولی سەند و تێی تەقاند. (ئەمەش هەقی شاڵ سەوزی دەستێنێ!)

ئەم دانیشتنە وەڕەزی کردین، لەگەڵ دیگار بە بیانووی شوشتنی جلوبەرگ لەگەڵ مەشەدی ئەمیر ڕۆیشتین بۆ دەم ڕووبارەکە. هیچ کە بەرگ و لیباسمان شۆرد مەلەیەکی باشمان کرد و مەشەدی ئەمیرمان ناچار کرد خۆی بشۆرێ و جلەکانیشی خاوێن بکاتەوە. هەر چییەکمان کرد هەر ئەوەندەی بە قسە کردین دەست وچاوی بەسابوون شوشت و ئەویش هەر نەیشۆردبا باشتر بوو. وەك بڵێی ئەوانە وەك پشیلە وان، هەرگیز حەز ناکەن خۆ لە ئاو بدەن. سەرم سووڕمابوو ئەوانە هەمیشە هاواریانە دەڵێن گەرماومان نییە، کەچی توخنی ئاو ناکەون! لە گەڕانەوەدا سەیرمان کرد، دوو سێ ئەسپ و هێستر لەبەر دەرگەی ڕەشماڵەکان بەسرا بوونەوە. سەلاممان کرد و دانیشتین. یەکێ لە پیاوەکان «جانمراد» کوێخای «تش»ی ئارپەنایی بوو. واتە کوێخای کوڕی خودادا. سەبارەت بە لەوەڕگە قسەیان دەکرد، گوێمان ڕاگرت بزانین چی دەڵێن، باش بوو لووڕی تێ دەگەیشتین. تەواوی لەوەڕگەی ئەو ناوچەیە لە قەباڵی شێخ عەلیخان و داوێنی ڕەزدە، بەشی ئارپەنایەکان بووە. لەو کاتەوە، لەو ڕۆژەوە لەوەڕگەکان دەستیان بە سەردا گیراوە ئەوان دەستیان لە هەموو شت بۆتەوە. ئێستەش دانیشتبوون ئەم گرفتە بخەن بە لایەکدا. وابێ ئارپەناییەکان وەك ئەم خەڵکە بتوانن لەو هەرد و مەکانە بێبەش نەبن. محەمەدی پەرویزی ڕیش چەرموو بوو دەیگوت: بەر لە هەموو کەس ئارپەناهی بەشیان بە سەرییەوە هەیە و دوای ئەوانیش ماڵی میرکائید، کردوویانە بە جۆ وا دیار بوو، میرکائیدی لەو ناوچەیەدا کشتوکاڵیان هەیە. دوای حاسلاتیش هی مەڕدارەکانە، بەڵام نەك هەموو مەڕدارەکان، بگرە تەنیا ئاژەڵدارانی هۆزی بابادی.

بە پێی ڕێکخراوەی ڕامیاری عەشیرەتی بەختیاری، هەریەك لە هۆزەکان دەبێ چوار سەرۆك عەشیرەتیان هەبێ. دوو سەرۆك لە ئێلخانی و دوو سەرۆك لە حاجی ئێلخانی، بەڵام لەو کاتەوە محەمەدی پەرویزی بۆتە زاوای سەمسام بەشێك لە هۆزی بابادی دراوە بە ئەو. هۆزی بابادیش بوو بە خاوەنی پێنج سەرۆك. بە پێی یاسای عەشیرەتی، هیچ سەرۆکێك مافی ئەوەی نییە، دەست لە کاروباری تایبەت بە سەرۆکێکی دیکە وەردا، بەڵام ئێمە ئاگەدار بووین کە جەعفەرقوولی بە کاروباری هەموو ئێلی بەختیاری

ڕادەگات. ئەمەش قسەی بەڕێز جەعفەرقوولی بوو. نۆرە قسەی کەسی نەدەدا و بە عادەتی خۆی توند توند قسەی دەکرد. دایمەش خۆشڕاوێژ و دەم بە پێکەنینە. دیگار گوتی: کەمێ لە سەرەخۆ بە" گوتی ناتوانم، گوتی ئیزن بدە تۆماری دەکەین، ڕازی نەبوو ئێمەش فریا نەدەکەوتین قسەکانی بنووسینەوە. دەیگوت، مالّیات و پیتاکی عەشیرەت بە پێی یەکەی مایین دامەزراوە، واتە بۆ هەر چارەوێیەك ماین بڕە پوولێك دیاری کراوە. ئاژەڵەکانی دیکەش هەر وەك ماین حیساب دەکرد و مالّیاتیان دەسەند. یانی ٤ سەر ڕەشەولاخ بەرانبەر بە ماینێك، ٤ سەر گوێرێژ بەرانبەر بە یەك ماین، ٢٠ سەر مەڕ یان بزن بەرانبەر بە یەك ماین حیساب دەکرا، ئەڵبەتە بۆ هەر ماینێك بەرانبەر بە ماینێك مالّیات وەردەگرن. بەشێك لە هۆزی بەختیاری کە برێتین لە تایەفەی مەحموود سالّح، کیان ئێرسی، زەلکی و موگویی. لە سنوورێکی تایبەت بە عەشیرەتەکەدا دەژیان. چکۆلەتر و خاوەنی لەوەڕگەیەکی کەمتر بوون. خەڵکەکەش زۆر نەبوون. ئاغاکانی ئەو ناوچەیەش مالّیاتی کەمتریان لێ وەردەگرن و سازاون. واتە ئەگەر کەسێك لە خەڵکی ئەو بەشە لەو عەشیرەتەدا بۆ نموونە خاوەنی دوو ماین، سی سەر ئاژەڵی وردە، دوو سەر ڕەشەولاخ و چوار سەر گوێرێژ بێ. بەرانبەر بەو خشتەیەی خوارەوە مالّیات دەدا، بۆ وێنە ئەگەر هەر پەل ماینێك ٢ قران مالّیات لەبەرچاو گیراوە. دەبوو ئەو کەسە ئەو مالّیاتەی بدایە، واتە تەواوی دەوڵەتەکەی حیساب دەکرا و دەبوو مالّیاتی ئەوان بەبێ کەم و زیاد بدات.

**دارایی**

**٢ سەر ماین ....٢ سەر ماین (٨ پەل) ..٢ قران ..١٦ قران ٣٠ سەر مەڕ.... ١/٢/١ سەر ماین (پەل) .. ٢ قران ..١٢ قران ٢ سەر ڕەشەولاخ .. ١/٢ ماین (٢) ..٣ قران ..٤ قران ٤ سەر گوێدرێژ ..١ ماین (٤) ..٢ قران ..٨ قران ٥ سەر هێستر (٢٠) ........٤٠ قران**

به پێی ئەم دابەشکردنە ناونیشانی عەشیرەت بووە بە«چوارلەنگ» واتە یەکەی ماڵیاتی ئەوان ٤ پەلی یەك ماین حیساب کراوە. ئەو بەشەی دیکەی عەشیرەت کەوا ناوچەیەکی بەربلاوتریان بە دەستەوەیە، لەوەڕگەی باشتریان بە دەستەوە بووە. ژمارەیان زۆر بوو. چەند هۆزێکی وەك «دوورکی باب» لە هۆزی زرئەسوەند، گەندەلی، مۆری، ئیسی وەند، بامدی، ئیسترکی و هەمۆڵە لە خۆدەگرێ و «بابادی باب» هۆزی بابادی عالی ئەنوەر، بابادی عەکاشە، ڕەوکی، مول مولیل، شەهتی، مەدمولیل، گومار، بیدبنی، گلە و ئەحمەد موهمەدی دەگرێتەوە و هۆزی گەورەی بێهداروەند و تایەفەی ناوچەی دیناران و تایەفەی جانکی، لەو بەشە دەگرێتەوە. ماڵیاتی زۆرتریان بۆ دیارکردن، واتە ماینێکیان بە دوو ماین دادەنا. واتە بۆ هەرماینێك و ژمارەی ئەوان ٨ پەل ماڵیاتیان دەدا. لە دوای ماوەیەك پەیکیان پێ بەخشین و بۆ هەرماینێك حەوت پەلیان بۆ حیساب کردن، کە بە ناوی حەوت «لەنگ» پەل، ناوبانگیان دەرچوو. ئێستەش کە دەبینین عەشیرەتی بەختیاری بە دوو بەشی مەزن، واتە حەوت لەنگ و چوارلەنگ دابەش دەکرێن. بە پێی یەکەی ماڵیاتی دیاریکراو ئەگەر کەسێك لە بەشی حەوت لەنگ خاوەنی ئەو سامانە بێ کە لە بەشی چوارلەنگ" بە پێی خشتەی خوارەوە دەبوو ماڵیات بدات:

**دارایی**

**٢ سەر ماین ..١٤ پەل ..٢ قران ..٢٨ قران ٣٠ سەر مەڕ ..٢١ قران، ..١٠ پەل ..٢ قران ٢ سەر ڕەشەولاخ .. ١/٢ ..٣ پەل ..٢ قران .. ٧ قران ٤ سەر گوێدرێژ ..٧ پەل ..٢ قران ..١٤ قران ........، ٣٥ پەل (نێزیکەی ٩ سەر هێستر) ..٧٠ قران**

لە کۆی ئەوانەشدا ئاژەڵانی نەزۆك هەروەك، هێستر، یان حەیوانی نێر، جوانەگا، نێرەکەر، ئەسپ، نێری، بەران، کاوڕەنێر، گیسکەنێر، جاشك و جوانوی مێ معاف بوون و بەخشران. جەعفەرقوولی گوتی، ساڵی ١٣١٠ی هەتاوی تایەفەی بابادی ١٧٠٠ تمەنیان ماڵیات بۆ سەرلەبەری مەڕ و ماڵاتەکەیان داوە. ئەو ماڵیاتەش سەرۆك هۆز و کوێخاکان لە پێشدا بە پارە حیسابیان دەکرد، ئەوسا بە پێی ئەو پووڵە کەلوپەیان وەردەگرت. هەڵبەت تەواوی ئەوانە پچڕ پچڕ قسەی جەعفەرقوولی بوون. شەوێ دانیشتم و دەستم کرد بە نووسینەوەیان، لە هەرجێیەکدا گیرم دەکرد دەچوومە لای مەشەدی ئەمیر و چەند کەسێکی دیکە. هەتا وای لێ هات هەموو شتم بۆ ڕوون بووەوە، کە دەبێ زۆرتر بە دوایدا بچم. بیستم خانەکانی عشیرەت خەریکی سەرژمێریی مەڕ و ماڵاتی عەشیرەتەکەن. بۆ ماڵیات سەندن. لادێنشینانیان ناچار دەکرد بە دانی پیتاك و ماڵیات بە ناوی جووتبەندەوە. ئەمەش دەبێ بەدواداچونی زۆرتری بۆ بکەم. دیگاریش خەریکی ڕێکوپێککردنی نووسراوەکانی بوو، لەو لاشەوە خێراخێرا پرسیاری لێ دەکردم. ئەو شتانەی خۆی نەیدەزانی لە منی دەپرسی. منیش بۆ ئەوەی زانیاری زۆرترم دەست بکەوێ، هەر تاوەی خۆم دەکرد بە خێوە تێکدا، ئاخری هەر دوو شەکەت و ماندوو خۆمان کرد بە ژێر پێخەفدا و نووستین.

## سێشەمە ١٣ی جۆزەردان

بەیانی جەعفەرقوولی سواری هێستر بوو، خواحافیزی کرد و ڕێگەی چلگردی گرتەبەر. من و دیگاریش چووین بۆ ماڵی ڕۆستەم خان و جەعفەرقوولی و سەردانی زۆر شوێنمان کرد. چووینە تاوڵێك خەریکی جۆلاییی و چۆخەچنین بوون. دۆیان بۆ هێناین و زۆریش بەتام بوو. بۆ چنینی چۆخە، کەڵك لە دار و تەونی ڕاکشاو دەکەن. تەکنیك و شێوازی هەر وەك بەڕەکردن وایە، بەڵام ئەوە تا بڵێی هەوداکانی زەریف و ناسکە، ژنان دەوریان داوین و لەسەر چۆنییەتی ئەم پیشەیە قسەیان بۆ کردین. گەورەکچێکی چۆخەچن داوای جگەرەی لێ کردین، زۆرم پێ سەیر بوو. جگەرەمان پێدا، نەیزانی دایگیرسێنێ، کەچی دەیزانی بیکێشێت. چەندە تامەزرۆیانە دووکەڵی جگەرەی قوت دەدا و بە لووتیدا دەری دەدایەوە. چەند وێنەیەکی تیریگێڕی و نانکردنمان هەڵگرت. بڕێکیشمان حەب بەسەر خەڵکەکەدا دابەش کرد. ڕوومان کرا بووەوە و سەرمان بە هەموو تاوڵ و هۆبەیەکدا دەکرد. تەواو دەمانزانی ئەوەیان ئێلخانییە و ئەمەشیان حاجی ئێلخانی. هەتا وای لێهات پرسیارم کرد، گوتیان: خانەکانی عەشیرەت سێ برا بوون، ئێلخانی، ئێلبەگی و حاجی ئێلخانی. ئێلخانی و حاجی ئێلخانی یەکیان گرت و ئێلبەگیان لە ناو برد. دوای ئەوە لەسەر هێز و دەسەڵات چەند ساڵێك خۆبەخۆ قڕە و هەرایان تێ کەوت و پێك هەڵپڕژان، هەتا چارەیان لەوەدا دیت بە یەکەوە دانیشتن و عەشیرەتیان بەسەر دوو دەستەدا دابەش کرد. بەشێك بوو بە ئێلخانی و ئەو بەشەی دیکەش حاجی ئێلخانی. هەر بەشە و ماڵیاتی لە هۆزی خۆی وەرگرت. هەڵبەت نەك ئەوەی ئێلەکە بە گشتی بکەن بە دوو کەرتەوە، بگرە دەستەیەك بوون بە ئێلخانی و دەستەیەکی دیکەش حاجی ئێلخانی. واتە لە بنەماڵەیەکدا چەند کەسێك ئێلخانی و باقی خێزانەکە حاجی ئێلخانی بوون. هەبوون لە نێوان دوو برادا، هەر کەسە و سەر بە لایەنێك بوون. سەرۆك ئێلەکانیش دوویان ئێلخانی و دووانەکەی تریش حاجی ئێلخانی، جەعفەرقوولی حاجی ئێلخانی بوو. جا بۆیە هەر کەسە و هەوڵی ئەوەی بوو تەرەقی بدا بە هۆز و ئێل و تایەفەی خۆی.

ماندوو بووین و هاتینەوە بۆ ڕەشماڵەکەی خۆمان. نانی ئەم نیوەڕۆیەمان بەهێزوپێز بوو. دۆکلێوی کەشك، لەگەڵ دەورییەك ڕۆنەکەرە. نەماندەزانی چۆن بیخۆین، خوامراد گوتی: ڕۆنەکەی تێکەڵ بکەن، خۆی دەتوێتەوە. یەکەم کەوچك دەممان بە مەڵاشوومانەوە سووتاندی و گەیشتە گەدەمان، ئاو لە چاومان دەرپەڕی. هەر نەمانزانی چ تامە، لە دەوریدا ساردمان کردە و خواردمان. تامی ترش بوو، تەواومان نەکرد. چایی دوای نانیان زۆر درەنگ هێنا. وا دیار بوو ئەوان دوای نانخواردن چاییان نەدەخواردەوە. دیگار دەنگی هەڵێنا و گوتی: «خوامراد بچۆ بڵێ بەڕێز دیگار داوای چایی دەکات. خوامراد بە قسەکەی ئەو هەستا چوو، گوێم لێ بوو دەیگوت: «بەڕێز دیگار داوای چایی دەکات.» بی بی ئێران، گوتی: هەر ئێستە لە هزری ئەودا بووم.

چاییمان خواردەوە و ماوەیەك ڕاکشاین، دواتر هەستاین بچین سەردانێکی قوتابخانەی عەشایەر بکەین. زەبت و کامێرەمان هەڵگرت و وەڕێ کەوتین. لە ترسی سەگەل خوامرادمان لەگەڵ خۆمان برد. مامۆستا و شاگرد لەسەر پۆل بوون. لەنێو خێوەتە قوچەدا دوو بەڕە ڕاخرابوو، کەلوپەلی مامۆستا لە گۆشەیەك هەڵچندرابوو، چەمەدانێك، چرایەکی چێشتسازکردن، چراتۆڕێك، دەستێك نوێن، کۆت و شەرواڵی تایبەتی مامۆستا لە نێوەڕاستی خێوەتەکەدا کرابوو بە شانی ئەستوونەکەدا، جلوبەرگی بەختیاری کردبووە بەری. قوتابیان ورد و درشت لەسەر بەڕەی ڕەق دەوری مامۆستایان دابوو. تەختەڕەشەیان بە خوار و خێچی بە چاردەکەوە هەڵپەساردبوو. مامۆستا بە دەستێك ڕایگرتبوو، قوتابییەکانیش دەیاننووسی. پاکەرەوەش بە دەست مامۆستاوە بوو، لە هەر جێیەکدا بە پێویستی دەزانی پاکی دەکردەوە. سەرەتا لەسەر ئاماژەی ئێمە منداڵەکان دەهاتن و ئەوانەی دەمانپرسی وەڵامیان دەدایەوە. وەختێ ئێمەش ماندوو بووین مامۆستا بانگی دەکردن. ناوی ئیرەج کەریمی بوو، بە دڵسۆزی کاری لەگەڵ دەکردن، لە ماوەی سێ مانگدا زۆر باش خوێندەواری کردبوون. هەر کەسێکی بانگ دەکرد چەند وشەیەکی پێ دەگوتن و ئەوانیش دەیاننووسی. زۆرتریش ناوەکان ئەمانە بوون. ئەمەریکا، فەرەنسا، لەندەن، کازابلانکا و لەم بابەتە. دوای ئەوانەش هەرجارەی منداڵێك چەند خولەکێك قسەی دەکرد لەسەر سەعدی، حافز، فردەوسی، وڵات، دایك، خوزستان، کتێب، وەلیعەهد و زۆر شتی دیکەشی لەبەر کردبوو، ئیزنی لە مامۆستا وەردەگرت و لەسەر شوێنی خۆی

دادەنیشتەوە. ڕۆستەم گوتی، کەی قوتابخانە کۆتایی دێت، چارەی نەبوو، ئەو کوڕەکانی لە فێرگەبوون و هێشتا مەڕ و ماڵاتەکەی ئاو نەدابوو. ئەمەش ئەرکی ئابوورییە لەسەر شانی منداڵ لە هۆزەکەدا. مامۆستا کۆتایی بە وانەی ئەمڕۆی هێنا و ئێمەش لەسەر ئیزنی ئەو جگەرەیەکمان داگیرساند. نامەی ڕێزلێنانی نیشان داین و ئێمەش زۆرمان تاریف کرد و دڵگەرمیمان پێ دا لەسەر کارەکەی سوور بێ، بە گەرمی دەستمان گوشی و لە چاوانیدا هەستمان بە خۆشحاڵی کرد.

هاتینەوە چادرەکەی خۆمان و ڕاکشاین چاوم لە میچی تاوڵەکە بڕی، بیرم لە مامۆستا و خێوەتی قوتابخانە دەکردەوە، بۆ دەبێ وا بێ؟ ئاخۆم بە ڕاستی ئەمە ڕێگەیەکی باشە؟ لەگەڵ ئەم ناوانە، لەگەڵ ئەم سروود و هەڵبەستانە و مامۆستاکاندا، ئەوەی بۆیان بووەتە بتێك بەهمەن بەگییە ئەگەر بێت و بەجێیان بێڵێ، بارهێنانی عەشایەری ڕادەوەستێ. جگە لەمەش بۆ بارهێنانی عەشایەری چی بۆ کردوون. تا پۆلی شەش، وانە بە منداڵەکان دەڵێتەوە، دواتر چەند کەسێك بۆ وەرگرتنی سیکل قەبوڵ دەکات و ئەو وانەیەی هەشتێ لە مشتێ فێربوون هەر وەك خۆیان دەمێننەوە. مات و پەرێشان، نە کتێبێك بە دەستەوە هەیە و نە پەڕتووکخانەیەك، نە دەسەڵاتێکیش بۆ درێژەدان بە خوێندن. تەنیا وریابوونی زیاتر ئەویش کرچوکاڵ، بەو دۆخەوە نەدەتوانن ببنە شوان و گاوان، نە ئەوەی بگەن بە بەهەشتی خەونەکانیان، واتە لەوەندەش دەبن کە هەبوون.

خوارەحم هات و گوتی خەریکی گوریس گرتنەوەن. ئێمەش چووینە سەیری گوریس هۆنینەوە، بی بی شەوکەت، خەریکی ئەو کارە بوو. هەر وەکو پەلکە بەنەکانی بەسەر یەکدا دەهۆنییەوە، بە مەودای حەوت سانتی مەتر دەیکرد بە گوریس بە درێژایی دە مەتر. بۆ ئەو کارەش سنگێکی لەنێو ڕەشماڵەکە داکوتابوو، سنگێکیش لە دەرەوەی ڕەشماڵەکە، بە دەست ئەمدیو ئەودیوی بە بەنەکان دەکرد، بە بێ هیچ کەرەستەیەکی پێشکەوتوو. جار لەگەڵ جاریش بە کەرکیت دەیکوتا و توندی دەکرد. بە حەزی خۆی وێنە و خەتی دەخستە سەر گوریسەکە.

هاتینەوە نێو چادرەکەی خۆمان و ئەوەی لە دەرەوە نووسیبوومان لە دەفتەری تایبەتدا هەمووومان کۆ کردەوە. هەر وەختێ لە کاری خۆم دەبوومەوە، ئەم سەفەرنامەیەم دەنووسییەوە. مامۆستای قوتابخانە ڕادیۆکەی خۆی هێنا و لەسەر

شەپۆلەکورتەکان لە ئیستگەیەك دەگەڕا کە مەبەستی بوو. کەس نییە بەم ڕادیۆیە موعتاد نەبووبێ و ئەمەش ڕێگرە لە بەردەم کاری ئێمەدا. بەڵێ دەنگی ڕادیۆ عێراق و لەندەن و تاران سەرنجی ڕاکێشان. تێگەیشتن کە ئایەتوڵا حەکیم بە ڕەحمەتی خوا چووە. مامۆستا وتەیەکی پێ نەبوو بیڵێ بە تەمای ڕۆیشتن، حواحافیزی کرد. شەو تاریك و ئەنگوستەچاو بوو، خوامراد لە مامۆستای پرسی، «لایتت هەیە؟ مامۆستا نەی بوو، جەعفەرقوولی بە مام مرادی گوت «لایتی» دیگار لەگەڵ خۆی بەرێ. مسەبایەکمان گرت بزانین ئەوە چییە، بەڵێ ئەوەی ئەوان وتیان هەر ئەو چراقەوە حەیاتەکەی خۆم بوو. کە ناوەکەی ئینگیزییە، هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ناوچەی خوزستان، کانی نەوتە و بەشێکی زۆریشی ژینگەی بەختیارییەکانە. وەختێ نەوتی باشوور بە دەست ئەو بەڕێزانەوە بوو بەختیارییەکان کاریان بۆ دەکردن. ئینگلیزەکانیش لەگەڵ خانەکان کەین و بەینیان هەبوو، تەنانەت بیستوومە زۆرتر قەول و بەڵێنیان لەگەڵ ئەوان بووە. عەشیرەتی بەختیاری زەوی داوە بەو ئینگیزانە، خەڵکی بەختیاریش بوونەتە بەردەست و کرێکار، لەسەر ئەم کانەی گەوهەرە ڕەشە. ئینگیز ئاغایە و ئەوانیش نۆکەر. چەندە زیرەکن لەسەر ئەم خەڵکە. کەڵك و بەهرەی خۆیان لەو خەڵکە وەردەگرن. بوون بە «ئاغا و ئەرباب و ساحەبی موڵك و ماڵ. دەستەملانی ئەو بیرۆکانە ببووم هەر بۆیە چەند دەمژمێر تەمەنی شەو کەم بووە و منیش خەو نەچووە چاوم.

## چوارشەمە ١٤ی جۆزەردان

سەرەتای بەیانی ڕۆژێکی تازەمان بە خواردنی هێلکە و ڕۆن دەست پێکرد بە ڕۆنی کەرەوە. لە پڕ بە مێشکمدا هات هێلکەیان لە کوێ هێناوە، لێم پرسین، وتیان هی مامرەکانی خۆمانە، چوار پێنج مریشکمان هەیە، بەڵام من تا ئێستە هیچم نەدیبوو. خەریکی خۆ کۆکردنەوە بووین بچین بۆ نێو هۆزێکی دیکە. لە هیچ کات و ساتێکدا وێنەهەڵگرتن و پرسیار و یاداشت هەڵگرتنمان لە دەست خۆمان دەر نەدەکرد. بە تەواوی لەگەڵ خەڵکەکە تێکەڵاو ببووین، هەر کەسە و سەرقاڵی کار و پیشەی خۆی بوو، ئێمەش هەر تاوەی خۆمان بە شوێنێکدا دەکرد و کەسێکمان دەدواند. ترۆمبێلێك لە ڕێگەوە هات. ڕۆستەم خان قاوی کرد «ئاغای کەریمی، بازرەس!» هەڵبەت لەگەڵ

منی نەبوو، ڕووی لە مامۆستا بوو. بازرەسەکان لەگەڵ مامۆستا سەردانی خێوەتی قوتابخانەیان کرد و دوای ماوەیەك هاتن لە لای ئێمە دوو چایان خواردەوە و بەجێیان هێشتین.

کەلوپەلمان ئامادە کرد و لەو لاوە دامانناو، دیسا وەڕێ کەوتین. لەنێو چادرێك دەنگی سکاڵا و گلەیی و بناشت دەهات، لەسەر لەوەڕگە بوو، کەسێکیش گۆیا دەستدرێژیی پێ کرابوو، ڕووی کردە کێوی بی بێکەس و گوتی «ئەی بی بێکەس دەیدەمە دەست تۆ دادم بستێنە!» سەرم سووڕمابوو لەو داوا و سکاڵایە. لەگەڵ ئێمە هاتنە نێو ڕەشماڵەکەوە، ئەوەندە دانیشتن هەتا بوو بە نیوەڕۆ. خەڵکی بەختیاری لە هەرجێیەك بن لەسەر خوڵککردن ڕاناوەستن، بچنە هەر لایەك دەخۆن و دەمێننەوە. نانی نیوەڕۆمان خورما و ڕۆن بوو لەگەڵ پیواز. دەورییەك بۆ من و جەعفەرقوولی و دیگار، یەکیش بۆ ئەو سێ کەسە. تازە ئێمە دووپارووەمان خواردبوو ئەوان سمێڵیان سڕییەوە و کشانەوە جەعفەرقوولیش هەروەتر. میوانێکی بەختیاری بانگی خوارەمی کرد و دەستوری دا نان و خوانەکە کۆ بکەنەوە. جەعفەرقوولی لەبەر ئێمە وتی دەست ڕابگرن ئێمەش وتمان تێر بووین و سفرەیان لا برد. ئەمەش دابی بەختیاریگەلە.

حاڵم باش نەبوو، بەردەوام دەکۆخیم، دیگار زۆر بۆم بە پەرۆش بوو، چەند حەبێکی پێ دام، هەر نەمدەتوانی بەسەر پێوە ڕاوەستم یان دانیشم. ئەوانیش نەدەڕۆیشتن نەختێك ڕابکشێم. سەرم کردە سەر بالیفەکە و دەوریان چۆڵ کردم. منیش ڕاکشام و لە پاش یەك دوو دەمژمێر وەخەبەر هاتم، لەشم سووك ببوو. دیگار و جەعفەرقوولی هێشتا خەوتبوون. ئەوانیشم لە خەو هەستاند، جەعفەرقوولی لەگەڵ چەند کەسێك ڕۆیشتن بۆ نێو ڕانەکە. یەك دوو پیرەپیاو هاتبوون بۆ دیدەنیی ئێمە، یەکیان زانیبووی ناساخم هاتبوو بۆ ئەحواڵپرسی. ڕەوتی ژیان لەنێو هۆزەکادا شلوشەکەت بوو، جووڵەیەکی جێی سەرنجت نەدەبینی. تەنیا شوانەکان سەرقاڵی کاری خۆیان بوون و ژنان بە کاروباری ماڵ ڕادەگەیشتن و پیاوان بێکار بوون. ئەم وەرزە ئاوایە. مامۆستا، هێدی هێدی هات بۆ لامان، ویستی بە پیاسەکردن تاوێك بەم کەژ و کێوانەدا سەرکەوین و هەوای نساران هەڵمژین. نە کاتم بوو نە تاقەتی کەژەوانی. مامۆستا وەڕەز بوو نەیدەزانی چ بکات. بە یەکەوە چووین سەردانێکی بی بی شەوکەتمان کرد. خەریکی هۆنینەوەی گوریس بوو. ژنانیش دەوریان دابوو خەریکی شانەکردن

و تەشیڕستن بوون. هەر کەسە و لەبەرخۆیەوە خەریك بوو، چەند ژنێك خوری و بەرگنیان لە ڕەنگ و زاخدا کوڵاندبوو، دەیاندا بەسەر سێپەکی مەشکەدا تا وشك ببێتەوە. دار و تەون و چۆخەچنین بە دەست ژنانەوە ئامانی نەبوو. ئەمەش لە لایەکەوە داهاتێکی باش بوو بۆ ماڵەکان. جەعفەرقوولی و بی بی ئێران هاتنەوە. بی بی سواری ئەسپ بوو، پێ لە ئاوزەنگ و دەست بە هەوسارەوە، هەر لە خۆی جوان بوو وێرغە و غارعارێن، وێنەیەکی سەلارانەمان لێ گرت. تێڕ و جەواڵیان لە چەند هێسترێك بار کردبوو. ئەوانە کەلوپەل و نان و پێخۆری ئەو شوانانە بوون، سبەی ڕانەکە بەرەو کێوە زەرد ڕادەدەن. مەڕ بۆ تێربوون چی گیر ناکەوێ و تەنیا بزنەگەل دەهێڵنەوە.

لە دوورەوە دوو سوار دەرکەوتن، یەکێ لەوانە «سپای دانیشی فانیاوا» بوو. لێمان نێزیك بوونەوە و کابرای بەختیاری هات بۆ لای ئێمە، مامۆستا چوو بۆ لای تاوڵەکان. بۆم سەیر بوو، پرسیم کوێوە دەچێ؟ بەختیاری گوتی، دەچێ بۆ لای بی بی شەوکەت. زۆری پێنەچوو گەڕایەوە، جەحێڵێکی بێ شەرم و بێ حورمەت و لەخۆبایی بوو، وەك بەعزێك لە خەڵکی شاری. لەچاو ڕەوەندان زۆر خۆی بە پیاو دەزانی. وەك بۆمان دەرکەوت، بە هۆی ئەم خدە و ڕەوشتەیەوە بەختیارییەکان دوو جاریان بەرشەق داوە. نازانم بۆچی ئەو جۆرە کەسانە ڕەوانەی ئەم ناوچەیە دەکەن. نەسیحەتیان ناکەن، کە ئەوان دەچنە نێو خاووخێزانێك، خاوەنی ڕێز و شکۆمەندین، گرینگیمان پێ نەدا و ڕۆیشت. دوو بەختیاری هاتنە لامان، خەڵکی ئەم دەڤەرە هەتا نەگەنە بەردەمت سەلام ناکەن. سەلامیان کرد و لەبەر دەرگەی ڕەشماڵەکە لەسەر زەوی دانیشتن و باسی گرفتەکانی خۆیان بۆ جەعفەرقوولی کرد. باسی دزرانی مەڕ بوو. هەتاو خۆی لە خۆرنشین خزاندبوو، ڕووناکی نەما و تاریکی داهات. لە هەر شوێنێك ترووسکایی بوو، لە تاوڵەکانەوە سنگی تاریکی دەبڕی لەم کەژ و کۆیەدا. بەم تیشکانەدا دەتزانی عەشیرەت چۆن ئەم چیا بەرزانەیان ناوەتە ژێر چۆکی خۆیانەوە. شوانەکان ڕانیان دەهێنا و لە پشت ڕەشماڵان دەیانخەواند، هەر کەسە و دەخزایە بەرۆکی کەپەنکێکەوە، لە چەشنی داهۆڵی سەر بێستان دەچەقین و ئاگایان لە مێگەلەکە دەبوو، ترسیش لە گورگ و دز لەوپەڕیدا بوو. لەم شەوە تاریکەدا دەنگی شوان و لوورەی گورگ و دەنگی سەگوەڕ سامی شەوی دەشکاند.

**پێنجشەمە ١٥ی جۆزەردان**

لە دوای نانخواردنی بەیانی دوو هێستریان بۆ زین کردین و سوار بووین. مەشەدی ئەمیر لەگەڵمان هات لە چلگردەوە چارەوێکان بگێڕێتەوە. لەنێو ڕێدا تووشی جووتیارێکی بامدی هاتین خەریکی جووتکردن بوو. زەویی تەق تەق و سەرپاك بەردەڵان، دووگای لەژێر نیردا، هۆگانی دەبڕی و دوور دەگەڕایەوە. زانیمان ئەو هەموو زەحمەتە لە وێنەکەدا نیشان دەدەین، ناچار دابەزین وێنەیەکی جووتوگامان گرت. سوار بووینەوە و درێژەمان دا بە ڕێگەی خۆمان، هەتا گەیشتینە دەستەیەك ڕەشماڵ. ئەوانە لە تیرەی تەقی عەبوولایی بوون. داری قاڵی و تێڕ و توربێن بە حەواوە بوو، وێنە و نەخش و نیگار سەرنجی ڕاکێشاین. تامەزرۆیانە دابەزین بۆ پرسیار و وەڵامێك و وێنەیەکیش بگرین. لە لایەك سەگەل دەرەتانی نەدەدا و لە لایەکی دیکەش ئافرەتان سەر و خوڵکیان لەگەڵمان خۆش نەبوو، وامان بە باش زانی سوار بینەوە و بەجێیان بێڵین. لەم شاخ و کێوە جگە لە ئێمە سێ کەس بنی ئادەمیت نەدەبینی. مەشەدی ئەمیر لەمەڕ فەرەنسییەکانەوە پرسیاری لە دیگار دەکرد. ئەویش زۆر نەرم و نیان وەڵامی دەدایەوە، مام ئەمیریش باسی داب و نەریتی خۆیانی بۆ دەکردن. وەختێ کەسێکیان دەمرێ، چۆن ئەو تووشماڵ و دەنگبێژانە دەهێنن، کۆتەڵێك لە مردووەکە سازدەکەن و لەسەر ڕیزەبەردێك ڕایدەکێشن، چیخێکی لە دەور دەگێڕن، دەوروبەر بە جلکی ڕەش دادەپۆشن و دوو ماین بە جلی ژنان دەڕازێننەوە، تووشماڵیش هەوای چەمەرچۆپی دەژەنی و بە دەوری چیخەکەدا دەگەڕێ و ماینەکانیش بە شوێنیدا، ژنانیش بە خۆڕنین و وایلۆکچڕین و...

بە کێوەکاندا هاتینە خوارێ و گەیشتینە سەر ڕێگەی ماشێن بۆ چلگرد. داڵانی کوهڕەنگ و تاڤگە دەرکەوت. لە شانی چەپی جێدەستی شاهەباس دیار بوو بە چیاکەوە، وەختێ ویستوویەتی کێوەکە ببڕێ و ئاوی کوهڕەنگ بخاتە سەر زایندەڕوود. گەیشتینە چلگرد، لەگەڵ دۆستان چاکوچۆنیمان کرد و لە چاییخانە چایەکمان لەگەڵ مەشەدی ئەمیر خواردەوە و چووین بۆ بازاڕچەکە بۆ ئەوەی فەرامەرز مەحموودی ببینین. وتیان ئێمە فریا نەکەوتین خەبەری پێ بدەین، ئێستە لە هەوارەکەی خۆیەتی. لەگەڵ دیگار قەرارمان دانا دوانیوەڕۆ جێبێك بەکرێ بگرین و وەڕێ بکەوین. چەند نامەیەکمان

دا بە پۆستە و خۆمان کرد بە گەرماوێکدا. کەس نەبوو بڵێ بارتان بە چەندە! خۆمان ڕووت کردەوە و لۆنگمان کردە بەرھەڵبێنە، گەرماوچی ھات و گوتی ئاوەکەساردە. چاوی ڕەشمان کاڵ بووەوە و جلەکانمان کردەوە بەرمان و دەرکەوتین. گەرماوچی خەریکی سازکردنەوەی لوولەی ئاو بوو گوتی، دەمژمێر دوو ئامادە دەبێ. دیسان ئەم دووکان و ئەو دووکان دواندنی ئەو خەڵکە و گوێھەڵخستن بۆ گفتولفتیان. دەستەیەك باسی ھەرزانبوونی گۆشتیان دەکرد، کە چۆدارەکان دەستبەتاڵ دەگەڕێنەوە و ڕەوەندان ئاژەڵ نافرۆشن. لە دووکانێکی تر چەند کەسێك دەوریان داین، پێشنیازیان دەکرد لە چلگرد میوانخانەیەك ساز بکرێت. ساماندارەکانی ئەسفەھان و شوێنەکانی تر پووڵ و پارەی خۆیان لە دەوروبەری تونێڵی کوهڕەنگ خەرج دەکەن و قازانجێکیان بۆ چلگرد نییە. داوایان لە ئێمە دەکرد ویست و داوای ئەوان بگەیەنین بە گوێی فەرمانداری شارەکە.

ھاتینەوە بۆ قاوەخانەکە، سەر و چاومان شوشت و لەگەڵ ئاژەڵدارێك قسەمان کرد، لووڕی بەختیاری نەبوو، بەڵام بە پێی ڕێگەپێدان ئاژەڵەکانی لە بژوێن و لەوەڕگەی بەختیارییەکان دەلەوەڕاند، تەپلەی دوو سووچی قەشقایی لە سەردا بوو. دەیگوت ڕانەکەمان ھاوینان دەبەینە لەوەڕگەی نێزیك چالشتەر، زستانانیش دەچینە بژوێنەکانی باغەڕەش (باغ سیا)، دەبید و مراوی لە نێزیك شیراز. دەبێ مانگێك بەڕێوە بین. زۆر بەڕێز و حورمەتەوە باسی عەشایەری فارسی دەکرد، باوەڕی وا بوو ئەوان باشترین عەشیرەتن. لێم پرسی خۆت لە ئێلی قەشقاییی؟ گوتی نا، ئێمە سێ پشتمان پێشتر ھاتوونەتە شیراز لێرە گیرساوینەوە. سەرچاوەی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەردەبیل. خەریك بوو باسەکەمان گەرم دەبوو، چایخانە باوەشی بۆ خەڵك دەگرتەوە و «مۆری» سەر سەکۆیان قەرەباڵغ کرد. مەڕداری شیرازی چایەکەی تەواو کرد و بەجێی ھێشتین. ئێمەش سەری قسە و باسمان لەگەڵ «مۆری»گەل دامەزراند. ئامانجمان لەو قسانە ئەوە بوو زانیاری زۆرتر لەو ھۆز و تایەفەیە بەدەست بێنین، بگرە لە دەرفەتێکی باشدا سەردانی ئەوانیش بکەین. لەسەر زۆر و کەمیی ئەوانە پرسیارمان کرد. لەگەڵ یەکدی کەوتنە مشتومڕ، بە تەسبێح و قامکئەژماردن لێکیان دایەوە و گوتیان، نێزیکەی ٤٥٠٠ خێزانن. لە بەرەبای مەزنی «دورکی باب» دوای ئەوە باسی وەچە و نەوە و داب و

نەریت و ژیانی ئەوان زۆرمان پرسی، ئەوەش تەواو کاتی گرتین. سەرنجی ئەم نووسراوەی ژێرەوە بدەن:

گورداگونی

ماندەنی/ مەسبەح/ مەولا/ غوەلامعەلی/ شەریف/ حەیدەر.

بۆری

بیرەوەند/ محەمەدحاجی/ سەباحی وەند/ هەزارسی/ سەیدعەلیوەند.

عیدیوەند

عەلی ئەسەد/ قالب/ خودابەخش.

عەلیجانوەند

بەندەر/ عەبدولا/ عەبدسالح/ بارام/ تەهماسب/ عەلی جوون/ بەهنەم.

قاسم عەلیوەند

غەریب شا/ سەید/ لوتفعەلی/ مەحیعەلی/ سەی مراد/ شەهریار/ عەبدولکەریم/ ئەولحسێن/ زەینلعابدین.

مۆری.....ئاروەند

یوسف/ شاباز/ تاهیری/ خەیبەر/ ئەسفەندیار/ سۆسەن/ غوەلام/ حاتەم/ مرادی بازفتی سەرێ. غەریبوەند(غەریب گەر) جەعفەر/ جەعفەر/ خدر/ مراد/ مرادی بازفتی خوارێ. دوورکی باب..../کەمەرزێڕین..../ سلێمان/ محەمەد/ کەریم.../ ناسر/ ئادینە/ مراد/ مراد/ کەریم.../ سێ ماڵ/ خواداد/ بوساق/ محەمەد/ عەولا/ ئەلاوێردی/ بابایی/ نەبی/ عیماد/ هەلیلی/ نەقی/ عەبدوەند..../ ئەفراسیاب/ شاناز/ مەولا/ هاشم/ هاشم/ باقر/ شەفیعەلی/ فەرامەرز/ محەمەد ترکی/ عەسکەر/ سادق/ خواوەندی.

مۆرییەکان بە گشتیی لە ناوچەی بازفت، لە بەشی لێڕەوارەکانی بەختیاریدا دەژین، ئەمەش تەواوی دار بەڕووە و هەواری ئەوانە، ئەم شوێنەش چۆڵ ناکەن. بەختیارییەکی بابادی لەوێ بوو گوتی: مۆرییەکان لە ئەستێرەناسیدا زۆر شارەزان و تەنانەت سەبارەت بە کەشوهەوا ئاگەداریی باشیان هەیە. بە قسەکانیاندا وا دیار بوو بە هۆیی ئەوەی ئەو بەشەی ئەوان سەرەڕێی ئێل و عەشیرەتی بەختیارییە، هەموو هۆزێك دەتوانێ بەم

دەڤەرەدا تێپەڕێت. خێڵ و تایەفەکانی دیکە زۆریان تووشی گرفت و زەحمەت دەکەن. تەنانەت لە شەڕی ئاغاکانیشدا، خەرج و پیتاکی سوارەکانیش لەسەر ئەم کەسانە بووە. بە دوای ئەم باسانەدا هەرکەسە و چوو بە لای کاروباری خۆیەوە. لە بازاڕی چلگرد کەلوپەل و جلوبەرگی خۆیان دەکڕن. ئێمەش نانی نیوەڕۆمان خوارد و لەوێ دانیشتین. ئاغاموسای جەهانگیری یەکێ لە گەورە پیاوانی ئێلخانی تایەفەی بابادی، قسەزان و ڕاوێژخۆش و ئاکارجوان بوو. قسە و باس دەستی پێکرد، هەر وەك هەموو خانەکان حەز بە چارەی یەکدی ناکەن، ئەویش دەستی پێکرد کە بەختیارییەکان هەژار و بێ چارەن. ئاغاکان زۆردار و بەرژەوەندخواز بوون. سەرۆك هۆزەکان هەمیشە لەگەڵ کاروباری ئاوەدانی بۆ عەشیرەتەکان ناڕازیبوونی خۆیان نیشان داوە و حەزیان کردووە هۆزەکە وەك خۆی بمێنێتەوە. شەرمەزارن لەوەی لەگەڵ کەسێکی وەك تەیموور بەختیار هاوناو و خزم و کەسی یەکن. زۆر خەراپ تێکەڵ دەبن. وا دایار بوو لەگەڵ سەرئێلەکانی دیکە نێوانی خۆش نەبێ. دایمە کۆمەڵگەی داخرا و لەم گرفتانە بێ بەش نین. هەموو یەکەیەکی بچووك کەموکوڕی تێدایە، بەڵام لە هەمبەر هێرشی دەرەکیدا قەت وا نییە کۆك و تەبا نەبن. ئەو نێوان ناخۆشییەی لە نێوانیاندا هەیە وەکو خۆی دەمێنێ و لە دژی پەلاماری دژی خۆیان ڕادەوەستن. ئەمە لەنێو عەشیرەتیشدا هەر بەم چەشنەیە. لەماڵیشدا کە یەکێك لە بچووکترین یەکەی ئابووریی ئێلەکەیە، دژایەتیی سەر هەڵدەدا و زۆر جاریش دەگاتە ئەوپەڕی، بەڵام لە هەمبەر پەلاماری ماڵدا هەموو دەستبەیەکی دەکەن و پشتی یەکدی بەر نادەن. لەنێو منداڵیشدا ناخۆشی ڕوو دەدا، بەڵام لە بەرانبەر منداڵیشدا هەر بەم جۆرەن. هەروەها لەنێو «تەش»دا دژایەتیی منداڵ هەیە، بۆ ئەمەش باقی منداڵەکاتن یەك دەگرن. لەنێو تایەفەشدا هەر بەم شێوەیە و.... هەر ئەو ئاغاموسا جەهانگیرە، لە منداڵی جەهانگیری تەش، لە منداڵی بابادییە. لەگەڵ جەعفەرقوولی لە بەرە و منداڵی فەرامەرزی تەش، منداڵی تایەفەی بابادییە. ڕەنگە ناکۆکیشی هەبێ. خۆ ئەگەر هات و بۆ نموونە «منداڵ» بکەوێتە بەر هەڵمەتی منداڵی «جەلیل» بە خێرایی کێشە ناوەخۆییەکان پشتگوێ دەخەن. قەرارمان لەگەڵ مووسا خان دانا زۆرتر یەکدی ببینین. هەستاین و چووین بۆ گەرماوەکە، نۆرەی ژنان بوو. چونمان بۆ لای فەرامەرزی مەحموودی ڕاگرت بۆ سبەی بەیانی بۆ ئەوەی خۆ بکەین بە گەرماوێکدا.

دوا نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەمان کردە ڕۆژی پشوو، لەگەڵ دیگار خەریکی قسە و کاروباری خۆمان بووین. زۆری تاریف کردم، هانی دەدام لەسەر کۆمەڵناسی درێژە بە خوێندن بدەم. زۆری کتێبی باش ناو هێنا، هەڵبەت بە زمانی فەرەنسی بوون. وردە وردە تاریکی باڵی دەکردەوە و ئاگر و ڕووناکی تاوڵ و خێوەتان وەدەر دەکەوتن. ژن و کچانی تاوڵی ئەولاتر مەشکۆلە و چەلەنگیان لە هێستران بار کردبوو. دادەگەڕان بۆ لای کوهڕەنگ. بەختیاری بە چۆخە و پاتۆڵی دەلینگ زلەوە دەهاتن و دەچوون. سەلام و ئەحواڵپرسیمان لەگەڵ کردن. بە پیاسەکردن گەیشتینە پاسگەی عەسکەری. لە ژاندارمەکانمان پرسی، فەرەنساییەکان نەهاتوون؟ ئەوان هەواڵی هیچیان نەبوو. بڕیار وایە فەرەنساییەکان دالآنی دووەم بکۆڵن. لە گەڕانەوەدا سەردانێکی جەلیلی ئازادمان کرد، ئەویش سەرگەرمی ڕێکوپێکی دۆسیە و پەروەندەیەك بوو، خواحافیزیمان کرد و ڕۆیشتین. ئەسکەندەری فەرامەرزی، کارمەندی ئیدارەی ئاو تووشمان هات و زۆر بە گەرمی خولْکی کردین، هەر وەختێ کارێکمان هەبێ بەسەر سەر و بە چاوان جێبەجێی دەکات سوپاسمان کرد.

شێومان کرد و هەر کەسە و بەسەر کوێتەی خەیاڵەوە ون بووین. نازانم دیگار بیری لەچی دەکردەوە، بەڵام من لە گێژاوی هزر و ئەندێشەدا لانکەم دەکرد. بیرم دەکردەوە ئاخۆم داهاتووی من بە کوێ دەگات، بڵێی دەرفەتێکم هەبێ؟ نازانم ژیان لەگەڵم ڕووی خۆش دەبێ یان تفت و تاڵتر؟ ئەو کۆمەڵناسییەی من خۆم کردووە بە ژێر سەیوانیدا لە بابەت زانستییەوە بۆ من بەهرەیەکی دەبێ یان هەر خۆفریودانە و هیچی دیکە. فێرگەیەکیشم لە بەردەمدا نییە، چارەنووسم نادیارە. لەسێ ڕێیانی گوماندا قەتیس ماوین. ڕێگەیەکی کۆمەڵناسیمان تەنیا بۆ خۆنیشاندانە، یەکیان کۆمەڵناسیی زانستی و ئەویدیکەشیان دێمییە و خۆماندووکردنە. دەشمانەوێ ئەو سێیە تێکەڵاو بکەین. لە ڕێگەی کۆمەڵناسیی ڕاسپاردەییەوە ئیدارە ڕازی بکەین و پارەیەك وەربگرین و ژیانمان دابین بکەین. لە ڕێگەی کۆمەڵناسیی زانستییەوە هزرڤانان و لێتۆژانی کۆمەڵناس مەرزەم بکەین، دێمی و ڕەمەکیش بەشی خۆمانە و هاوڕێیەکی کارمەند دەیگوت، «ئەوە ژیاننناسییە» تاریك داهات و چلگرد بێزووی بە کەسێك دەکرد. ئێمەش خەومان دەهات. تازە خەو چوو بووە چاومان دەڕابەی چایخانە دایچڵەکاندین. لەم چوار

دیوارییەدا بە دەم خڕڕەخڕڕەوە چایچی دەرابەی هەڵدایەوە. مووسا خانی جەهانگیری هاتە ژووریٚ. شەودرەنگ و ئەویش ناچار بوو لە لای ئێمە بخەویٚ. چایچی تەختی سەفەری بۆ کردەوە و بێدەنگی هەمووماانی دە ئامێز گرت.

### هەینی ١٦ی جۆزەردان

بەیانی دەمژمێر پێنج و نیو لەخەو هەستام، دیگاریش وەخەبەر هات. خۆمان کۆ کردەوە و نانی بەیانیمان خوارد. چووین جگەرە بکڕین خوامرادمان دیت بەیانی زوو لەگەڵ جەعفەرقوولی هاتبوو. خوامراد گوتی قەول وایە لەگەڵ جەعفەرقوولی چاویان بە «تیمسار» دادوەش بکەویٚ. لەو ڕۆژەوە دەستی ئاغاکان لەسەر ئێلات کورت بووەتەوە بۆ هەر یەك لە هۆزەکانی ئێران فەرماندارێکی نیزامی دامەزراوە. بە پێی ئەو پلانەی پێشتر ئامادە کراوە، وا دیار بوو عەشایەر هێزێکی پاشەکەوتی ئەرتەشی ئێرانە و حیسابی لەسەر دەکرێت. هەر بۆیە فەرماندەی چەکداریان بۆ داناون. بەختیارییەکی بابادی گوتی: لە بەینی هۆزی بابادی و بامدیدا دوژمنایەتی هەیە و دەستیان بە خوێندا چووە، هەر دوو لا بە خوێنی سەری یەکدی تینوون، هەر بۆیە لە هیچ لایەك کەس ناوێری ئامووور بدات. هەر کەس پەل ببزێویٚ چوار پەلی دەقرتێنن. جەعفەرقوولیش لەم کێشەیە دوور نییە، بەڵام بە پشتیوانیی تیمسار دادوەش پێی ناوەتە موڵکی بامدییەوە. بەرەی خدری لە تەشی میرکائد هۆزی بابادی لە ساڵی ١٣٤٠دا سەیفوڵای بامدی، سەرۆك هۆزی بامدی لە چاڵمنار، لە کاتی کۆچ و هەواردا دەکوژن و ئەمەش خوێنێکە و بامدی تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە. هەرچۆنێك بێت جەعفەرقوولی دەچێتە لای بامدییەکان ئێمەش دەچین بزانین دەبیٚ بەچی.

جێبەشرێکمان پەیدا کرد و هەتا لە ١٥٠ تمەنەوە بە ٧٠ تمەن ڕازیمان کرد کلکی وشتر گەیشتە عەرزی، من و دیگار بەو کەلوپەلەوە بگەیەنێتە لای فەرامەرزی. ڕێگە و بان نەبوو بۆیە کاکی شۆفێر بە چەقی نەعلەتدا چوو بوو. ئەمە ڕێگەی یەکسمان بوو، خەڵکەکە بە پاچ و بێڵ تەختیان کردبوو، جێبەکەش بە هەزار ئەڵا و وەڵا پێیدا تێدەپەڕی. کاکی شۆفێر لەبەر ژانی ددانی حەجمانی لێهەڵگیرابوو. دەوا و دەرمانی ئێمەش ژانی نەشکاند، شەقڵی ماشێنی تیمسارمان دیتەوە و بە ڕووباری کوهرەنگدا

تێپەڕین و لە پاش دوو دەمژمێر گەیشتینە چۆمی بیرگان، گکە موڵکی فەرامەرز بوو، لە داوێنی کێوەکە باروبنەمان لە جێبەکە داگرت. ئەم ناوچەیە بە گشتی بە «بیرەگون» و بە ناوی خێوەتی فەرامەرز «چنار»ەیە. ئەگەر مشووری ئەم ڕێگەیە بخۆن دەچێتە گوندی شەهریاری، کە ئاواییەکی سی ماڵییە. هاتنی ئێمە بۆ نێو بامدییەکان و تەشریفهێنانی جەنابی تیمسار دادوەش بە زیانی ئێمە کۆتایی هات. بەختیارییەکان هەر ئەوەندەی چاویان بە تیمسار کەوت ئێمەیان لە بیر چووەوە. تیمسار بەیانی هاتبوو قەولی پێدابوون بۆ نانی نیوەڕۆ بگەڕێتەوە. بامدییەکان ئەسپیان زین کردبوو لە قەراخ ڕێگەکە چاوەڕێ بوون تیمسار بگەڕێتەوە و بە سواری بیبەن بۆ هەوارگەی خۆیان. ئێمەش دەستمان لە هەمبانە بەربوو، ناچار باسکە و باسك تێهەڵبووین بۆ شوێنی مەبەست. دڵمان بەوە خۆش بوو لێرە لە ترسی سەگ نێوکمان ناکەوێ. چەند کەسێك بە دووربین لە ڕێگەکەیان دەڕوانی و چاوەڕێی جەنابی تیمسار بوون. فەرامەرزیش دەتگوت چاوی ناوەتەوە هەدای نەدەدا و ئەمر و فەرمانی دەردەکرد. هەڵبەت بە گەرموگوڕی پێشوازی لە ئێمە کرد و بەڕێی ڕەشماڵانی کردین. شەش دانە لە چادرەکان تایبەت بوون بە فەرامەرزخان، ئەو دراوسێی بەدەورەوە نەبوو. لە تاوڵەکەدا دانیشتبووین، بابی فەرامەرز وەژوورکەوت. پیرەمێردێکی سەد ساڵ تەمەن، ساخ و پتەو، وەك گوێزی ئازا و گرێی داربەڕوو، هێشتا دووی بە سێ نەبووە. زۆر بەخێرهاتنی کردین و لە لامان دانیشت. بەختیاریگەلی بامدی هاتن بۆ لامان جارێ شکایەتی خۆیان ئاراستەی نەجەف خان دەکرد. هەر کەسە و بە ڕبەی خۆی دەپێوا و کەس بە دۆیی خۆی نەدەگوت ترشە. زۆرینەی شکایەتەکان لەسەر دزی بوون و ناڕازی لەوەی بۆ دەبێ جەعفەرقوولی بتوانێ بێتە ئێرە؟ نەجف خانیش بە زۆری بێدەنگی دەکردن. کێوەزەرد تەواو ڕووبەڕووی ئێمە بوو. چۆمی بیرگون لە داوێنەوە خوڕەی دەهات. ئەم ڕووبارە کەوتووەتە نێوان بامدی و بێهداروەندەوە. سەرتاسەری کێوەکە وەك دمەڵ، گوێنی دایگرتووە. قازانجی زۆرە و کەتیرەی لێ دەگرن. لە پایزدا گەرد و گوڵی گوێنی دەگرن و بە هێڵەك دایدەتەقێنن، کیلۆی بە دوو تمەن دەیفرۆشن. فەرامەرز دووربینی لە چاوی نەکردە، هەتا دەمژمێر یەك جەنابی تیمسار دەرکەوت و خەڵك خێزەرەیان کرد و بەرە و پیری چوون. نەجەف خان حاڵیی کردین، لە شوێنی خۆمان نەجوولێین و هەمیەتی وێنەدەین. پیاوێکی بەوەج بوو

لەکن هیچ کەسێك سەری دانەخستبوو. وەختێ تیمسار هاتە نێو چادرەکە لە جێی خۆی جووڵەی نەکرد. تەنانەت حەولی بوو ئێمەش بە دابی خەڵکی شار ڕێزی لێ نەگرین. جەعفەرقوولی و ستوانێکی لە تەکدا بوو. سفرە وخوانیان ڕازاندەوە و فەرامەرزخان بۆ ڕێزگرتن لە میوانی پایەبەرز ئافتاوە و لەگەنی گێڕا. خواردنی نیوەڕۆ کشمیشپلاو بوو لەگەڵ گۆشتی مۆغەرەپشت و کەبابی بەرخ، دۆی ترشی ڕازاوە بە شیوت و گوڵ. نەجەف خانیش بەردەوام بە ئێمە ڕادەگەیشت و واینەدەزانی کەسێکی دیکە لەوێیە. لەگەڵ تیمسار کەوتینە گەرمە قسە، تەوەرەی باسەکەمان لەسەر ئێلاتییەکان بوو. گەرەکی بوو بزانێ بیر و ڕای من چۆنە. باسی ئاژەڵی دڕندەم کرد کە زیانێکی زۆر بە مەڕ و ماڵاتی ئەو خەڵکە دەگەیەنێت. داوام لێ کرد مشوورێکی ئەوخەڵکە بخوات. بە بێ ئەوەی یەك و دوویی لێ بکات بڕیاری دا بە هەریەك لە تایەفەکان ٥ تفەنگ بدات. بەختیارییەکان قەت شکیان بۆ ئەوە نەدەچوو چاکەی وایان لەگەڵ بکەن. لە خۆشیان پێیان بە عەرزەوە گیر نەدەبوو. فەرامەرز و جەعفەرقوولی نەیانتوانی خۆشحاڵی خۆیان بشارنەوە بە بەر چاوی تیمسارەوە بە بزە و چاو و برۆ سوپاسیان کردم. باسی ڕێگە و بانم کرد، ڕایەکی تایبەتم نەبوو تەنیا مەبەستم خرابی ڕێگە بوو. هەر بیری لێ نەکردەوە گوتی (گریدێر) دەنێرم ڕێگەکەیان بۆ خۆش بکات. بە کورتی تیمسار شیری بۆ دادابوون، بە کوردییەکەی جێی خۆی لەنێو ئێل کردەوە. ئیتر نازانم چ سیاسەتێك لە پشت پەردەوە بوو، هەرچۆنێك بێ بە قازانجی بەختیارییەکان تەواو بوو. نەجەف خان وەك ڕێزلێنانێك خێراخێرا گۆشتی دەنا بەردەمی من، فەرامەرزیش بۆ تیمسار دادوەش. جارناجارێك لە دەرەوە دەنگ و هەرا پەیدا دەبوو، بەڵام دەستەیەك خێرا بێدەنگیان دەکردن. بامدییەکان بوون، حەزیان بە چارەی جەعفەرقوولی نەدەکرد. بە تەمای تۆڵەسەندنەوە بوون، هەموو دەمانزانی خۆڕانانێکی خۆڕاییە. لە ڕاستیدا نەدەبوو جەعفەرقوولی هەر وا بە سادەیی بە بەر چاوی بامدییەکانەوە بێت و بچێت. تەنانەت ئەگەر کەسێکی وەك دادوەشی لەگەڵدا بێت. ئەوە مەسەلەی خوێنە و هەروا بە ئاسانی لە بیر ناچێتەوە. خۆ ئەگەر ئاگری ڕقی عەشیرەتەکە بڵێسە بستێنێ تیمسار ناتوانێ بەر بەم گڕکانە بگرێت. جەعفەرقوولی زۆری پارێز دەکرد، زۆر ئارام بوو، بەڵام زیت و زیرەك. هەڵبەت ڕووبەروویی نەیاری دانەنیشتبوو، بەڵام ترسی پێکرانی هەبوو، لەوە دەچوو چەکی

نایاسایی لەنێو ئێلاتی هەبێ. لە کاتی نانخواردندا لە نێوان من و دادوەشدا بوو، دوو کەسی بەختیارییش لە پشت سەری بوون. دوای نانخواردن گیرنەبوون و ماڵئاواییان کرد. نەجەف خان وەختی بەڕێکردن چووە بن گوێیەوە، جەعفەرقوولی بە نیشانەی ڕەزامەندی خێراخێرا سەری بۆ دەلەقاند، وا دیار بوو قەولی دابێ، چاوم لێ بوو دڵی پڕ بوو بە دەستەسڕەکەی چاوی وشك کردەوە. زۆر هەستیارە. حەزم کرد بچمە بنج و بناوانی مەسەلەکەوە، بزانم نەجەف خان چی بە جەعفەرقوولی گوت وا بەم چەشنە ئەم پیاوەی هەژاند. بەختیارییەکان بە حورمەتەوە دادوەش و جەعفەرقوولی و ستوانیان سواری ماشێن کرد. ماشێن وەڕێ کەوت و دەستەیەك مستیان لێ ڕاست کردەوە لە باتی بەڕێکردن. بەختیاریگەل دانیشتن خەریکی حەلکردنی گرفت و باسی خۆیان بوون. قەول وا بوو کەسێك چاوەخانوویەك دروست بکات، کەسێکی دیکەش ئیزنی سازکردنی نەدەدا دەیگوت ڕێگە نادەم کەس لە زەوی مندا پێمەڕە قوڕاوی بکات. نەجەف خان دەیویست کێشەکە بە لایەکدا بخات، بوو بە گوڕە و هەرا، سەرم وەژان کەوت و لە خێوەتەکە هاتمە دەرێ. دیگاریش بە دوای مندا. فەرامەرز لە دەرێ بوو. چووینە ئەو دیوی تەپۆڵکەکەوە و گەیشتینە ماڵێکی دیکە و لامان دا خێوەتێك، چایان دەم کرد هەموویان بێدەنگ بوون. وەختێ بەختیارییەکان لە جێیەك بە بێدەنگی دادەنیشن، هیچ کەس سریوەی لێوە نایات. لانکەیەك لەوێ بوو وێنەیەکم لێ هەڵگرت. دەستێکم بەو بەڕەیەدا هێنا لەوێ دابوویان بەسەر توربێن و تێڕ و جەواڵدا. زۆرجوان چندرابوون. تێڕەکان بە بەن و گوڵێنگ ڕازابوونەوە، وەختێ دەیاندەن بەسەر هێستر و مایندا بەو پەتە لەزین و کورتانی هەڵدەبەستن و قایمی دەکەن. لێواری توربێنەکان قاڵێچن کراوە، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی سەخت و هەڵەمووتدا زوو نەدڕێ. ئەمەش وەك کۆبە لێواری توربێنەکە ڕادەگرێ و جوانییشی پێ دەبەخشێ. ئەم کر و دەستکردانەش سەرلەبەری کاری بەختیارییەکانە. لە کاتی کۆچ و کۆچباردا کەڵکی لێ وەردەگرن. دەوروبەری خێوەتەکانیان بە جوانی بەردچن کردبوو. ئەمەش بۆ ڕەشماڵەکان وەك دیوارێك وابوو. خەریك بوو تاریك دادەهات کە هەستاین، قەولمان پێ دان جارێکی دیکە سەردانیان دەکەینەوە. لە خێوەتی فەرامەرز نێزیك دەبووینەوە، خەریك بوو هەوا فێنکی دەکرد. زریان سەرمای بەفرەکانی کێوەزەردی لە ڕوومان دەپژاند. لە دەم دەرگەی ڕەشماڵەکە فەرشێکمان ڕاخست و لە

قوڵکەکەدا ئاورمان کردەوە. دانیشتن لە دەوری ئاور دیمەنێکی جوانی هەیە و هەستێکی تایبەت بە مرۆڤ دەبەخشێ. بەختیارییەکی بامدی بەسەر ئەسپێکی بێ زینەوە ڕەوەیەك ئەسپی وەپێش خۆی دابوو. دەیهێنانەوە بۆ لای خێوەتەکان بۆ ئەوەی ئاو و خوێیان بداتێ. شوانەکانیش ڕانەکەیان بەرە و بێرەدۆش ڕادەدا. ژنانیش بە سەتڵ و مەنجەڵەوە ئامادەی مەڕدۆشین بوون. شوانێکیش دووان دووان سەری مەڕەکانی دەخستە بن باڵی و چرکەی لێ دەبڕین. چەند کەسێکیش لای بەرغەلەکەی گرتبوو. هەوا تاریکتر دەبوو ئێمەش لە دەوری کوچکاور پوورەمان دابوو. خەریکی چاییخواردنەوە بووین. تاریکی شەو و بڵێسەی ئاور دیمەنێکی جوانی بە ڕەشماڵەکان بەخشیبوو. لە هەر چرکەیەکدا شۆقی ئاورەکە ڕوخساری ژن یان پیاوێکی دەردەخست. لە هەموو لایەکەوە هەر دەنگی فیکەی شوان و زەنگ و زەنگوڵە بوو دەهات، لەگەڵ گوڕە و هەرای ئەو خەڵکە و نەجەف خان. ئەویش بە دابی خۆی کەپەنکەکەی داخستبوو لە سەری دانیشتبوو، قیت و میرانە، لە دوورەوە قەفی سمێڵە سپییەکەی دیار بوو. ئەو پیاوە نێزیکەی سەدەیەك لەو سرووشتە پاك و خاوێنەدا ژیاوە. ڕاستی، پاکی و جوانیی لەو ژینگە بێ غەلوغەشە وەرگرتبوو. لە ماوەی ئەو سەد ساڵە تەمەنەیدا تەنیا ژنێکی هێنابوو. لە بنەماڵەی تالبیی بامدیگەل، پێنج کوڕ و چوار کچ ماوەتەوە.

شێو بەربەسێڵیان پێ داین. دوای نانخواردن پیرەمێردێك گۆرانییەکی لووڕی گوت، زەبتمان کرد و خەوتین.

## شەمە ١٧ی جۆزەردان

بەیانی بە دەنگی نەجەف خان خەبەرم بووەوە، بەردەوام دەنگی دەهات و دەستووری دەدا. دەنگی مەشکەژەندن دەهات. دیگار خەریکی شوشتنی دەست و چاو و دەم و ددانی بوو. گورجێك لە جێگە دەرپەڕیم و جێوبانەکەم کۆ کردەوە و مەحتە مام تاکو نۆرە ئافتاوەم بگاتێ. ئافتاوە بە دەست دیگارەوە بوو، سەلامم لە نەجەف خان کرد و بە گەرمی وەڵامی دامەوە، دەستوری دا ئافتاوەیەکی دیکە بۆ من بێنن. بەرات لە هەموو کەس زیاتر دەهات و دەچوو. ئەو جموجوڵەی لە ماڵی جەعفەرقوولی دیبووم لە هیچ جێیەك نەمدیووە. ئەمانە ئەوەندە دارا و دەوڵەمەند نین، بێنەوبەرەشیان کەمترە. تێکڕا

نانی بەیانیمان بە ماست و ڕۆنەکەرەوە خوارد. نەجەف خان ڕۆیشت و پیرەمێردەکەی شەویّ هاتەوە بۆ لامان. دەست بۆ هەموو شتێك دەبات. دەفتەری یادداشتەکەی لەدەست وەرگرتم، وا دیارە موتالاّی دەکات. تاقیم کردەوە، نەخوێندەوار بوو، هەر پێی خۆشە سەرلە کاران دەربێنیّ. ویستم بزانم تێکەڵی و ڕێکوپێکیی ماڵ لە لای ئەو وەك خزم و کەس چ تاریفێکی هەیە. بۆ ئەو مەبەستە قسەم لەگەڵ دیگار کرد. گوتی بپرسە، فەرامەرز و ئەوانی دیکەش لەویّ بوون. ملم نا لە پرسیارکردن. دیگار ئاماژەی کرد نەختیّ بە هێمنی دەستی کرد بە نووسینەوە. بە تەما بووم لەسەر یەك هێڵ بنووسم، بەڵام دیگار فێری کردم دەستووری نووسینەکەی چۆن دەبیّ. لەو سەفەرەدا فێر بووم، چ نیشانەیەك بۆ پیاو، چ نیشانەیەك بۆ ژن دادەنێن. ٠ نیشانەی ژنە. = نیشانەی زەماوەندە. < نیشانەی پیاوە. ^ نیشانەی منداڵە.

لە نووسینی نیشانەکان بوومەوە. دیگارگوتی: وا باشە بە دەورەی هەر یەك لە ڕەشماڵەکاندا خاڵ دابنێین. ئەم دابەشکردنەش بوو بە ٥ ڕەشماڵ. ئەمەش کارێکی فرە دژوار بوو. هەر دژوارییەك ئەزموونێکی بە دواوەیە. بەم کارەمان ساڵ و تەمەنی کەسەکانیشمان دیاری کرد.

بە هۆی ئەوەی کار و ئەرکی ئێلاتی هەتا دەمژمێر حەوتی بەیانی تەواو دەبیّ، ئیتر لەمەولا ژن و پیاو وەختیان زۆرە بە دەوری یەکدیدا کۆ ببنەوە و خەریکی قسە و باسی خۆیان بن. ئێمەش بە سەرنجەوە گویّ لە قسەی ئەوان ڕادەگرین. وردە وردە گەرما هێرشی هێناوە. ئەو پیرەمێردە ناوی کاك حەبیبە، وەختیّ دەکەوێتە قسەکردن تازە نۆرەی کەس نادا. شانەیەکی دارینی بە دەستەوەیە و بەردەوام ڕدێنە کەم مووەکەی شانە دەکات. ئەگەر ڕێگەی قسەکردنی نەدەنیّ دەکەوێتە وێنگ و باوێشکدان و خۆهەڵکراندن و سەرکردن بەنێو دەفتەرەکەی دیگاردا. زۆر بە وردی لێی دەڕوانیّ. بانگێشتن کراین بۆ خێوەتێك، زۆرمان پیّ خۆش بوو. بە تەپۆڵکەکەدا شۆڕ بووینەوە، چەند تاوڵێك بە دەوری یەکەوە تایبەت بە ماڵێك بوون. بەسەر یەکیّ لە خێوەتەکانەوە چاومان بە کەشکی قولەمیچە کەوت، دایاننابوو بۆ وشکبوونەوە. ژنێك لەبەر دەرگەیی چادرەکە لەسەر کوانوو خەریکی کوڵاندنی پێستی هەنار بوو. خورییان پیّ ڕەنگ دەکرن. وەختیّ زاخی

تێکەڵ دەکەن ڕەنگەکە تەواو ڕەش دەبێ. بە بێ زاخ دەبێتە سوورێکی تۆخ. دیمەنی ڕەشماڵەکان جێی سەرنج و لێ وردبوونەوە بوو. بە بەردی وشکەچن دەوری چادرەکانیان دابوو. کۆزی بەرخەکانیش بە پاڵ ڕەشماڵەکانەوە بوو. دیواری خوار و خێچ و گێڕ. دیوی ژوورەوەی چادرەکانیش بە تێڕ و بەڕە ڕازابووەوە. هەر کەسێك زۆرتر تێڕی هەبێ سامانیشی زۆرترە. ئەمانەش کر و دەستچنی خۆیانە. تا بڵێی جوانن و بە نەخش و نیگارن. کەسانێکی زۆر لە خێوەتەکەدا دانیشتبوون. خەریکی تەختە و دامە بوون. هەرکەسێك دەهات و لای دەدا یەکسمەکەیان لێ وەردەگرت و بە ئەستووندکی تاوڵەکەوە دەیانبەستەوە. هەڵبەت ئەو کەسانە میوان نەبوون. کاریان بە فەرامەرز بوو، دەهاتنە ڕەشماڵەکە. هەر کەس دەهات دادەنیشت و جووڵەی لە خۆی دەبڕی. بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ لەوێ دەمانەوە. ئەمەش لەنێو بەختیارییەکاندا زۆر ئاساییە. نانی خۆیان دەخۆن و دەڕۆن. لەنێو بەختیاریدا باوە دەڵێن، دەرگەی بەختیاری بۆ هەموو کەس ئاوالآیە. جەرگ و دڵی مەڕیان بۆ کردین بە کەباب. یەك سفرە و یەك خواردن بۆ هەمووومان هات. دەمژمێر یەکی نیوەڕۆ خواردن ئامادە بوو. ڕایەخی دەستکردی خۆیان داخست، باریك و درێژ. دەوریی برنجیان لە پێش دوو کەس دانا. بە هۆی ئەوەی من و دیگار شارنشین بووین سەر و کەوچکێکیان بۆ هێناین. خانەخوێ قیت ڕاوەستابوو تاکو نان و گۆشت و دۆی زیاتر بێنێ. نەمزانی خوڵکم کرد دانیشێ نانەکەی بخوات. وتی نا! ئێمە لە لای میوان نان ناخۆین. وەختێ میوان تەواو بوو، ئینجا ئێمە خواردنی خۆمان دەخۆین. نان خورا و سفرە کۆ کرایەوە. ئەو کەسانەی کاریان بە فەرامەرز بوو لە چادرەکە چوونە دەرێ و قسەی خۆیا لەکن ئێمە نەدرکاند. کەسێکش «دەی بەلال» و «فایز»ی بۆ گوتین، دیگار دەنگی تۆمارکردن. گوێمان لە دەنگی کیژۆڵەیەك بوو لەگەڵ دیگار بە چاو یەکدیمان دواند. بە فەرامەرزمان گوت، دەکرێ ئەو دەنگە تۆمار بکەین؟ وتی دەکرێ کەس پێی ناخۆش نییە. زەبتمان هەڵگرت و چووین بۆ لای دەنگەکە. پێشتر ئاوا ئازاد نەبوون. لێرە ژن و پیاو بە یەکەوە دادەنیشن، لەگەڵیان تێکەڵ بووین. زۆرمان وێنە لێ هەڵگرتن، ئافرەتەکانیش زۆریان هاوکاری کردین. هاتینەوە بۆ نێو ڕەشماڵەکەمان. میوانەکانیش تەك و تووکیان تێ کەوت. هەر کەسێك هەڵدەستا سۆراخی ئەسپ و هێستری خۆی دەگرت. لە چادرەکانەوە دەنگ دەهات هەر کەسە و سواری ئەسپی خۆی بێت. لەو نێوەدا بابا

ئەحمەدییەکان زۆریان پێ خۆش بوو لە جێیەك کۆ ببنەوە و خانووبەرە سازبکەن. ئەوەیان بە دڵەوە دەگوت. بەم دیوارەی بە دەوری ڕەشماڵەکانیاندا هەڵچنیبوو لەوە نەدەچوو لە ماوەیەکی کورتدا هەوارەکەیان وەگوێزن. وادیارە زۆرتر پێیان خۆشە خەریکی کشتوکاڵ بن. لەو ماوەیەدا ئاگام لێ بوو چوار پێنج نامەیان نووسی بوو کە بەر بە ئاوەکە نەگرن، با تووشی ناخۆشی و دڵمەندی نەبن. چەند نامەیەك بۆ شوێنی خۆی ڕەوانە کرا، لەو زەویانەدا ماڵ ساز نەکەن، ئەوە موڵکی بابی منە و...

لەوێ هەستاین و هاتینەوە بۆ لای ڕەشماڵی فەرامەرز. لە تەختایی بەر دەرگەی چادرەکە فەرشێکمان ڕاخست و دانیشتین. جێیەکەمان بەسەر هەموو لایەکیدا دەڕوانی. دەمە و زەردەپەڕ بوو شنەی بلاوێن ڕۆحی تیفتیفە دەدابن. چایی دەمی هێنا و بە دەم چاخواردنەوە زۆرمان قسە کرد. کاروباری هۆزەکە لە دوانیوەڕۆدا دەستی پێکرد و ژنەکانیش لەبەر دەرگەی ڕەشماڵەکان خەریکی مەشکەژەندن بوون. ڕانەکە بۆ دۆشین گەڕا بووەوە و لە نێزیك چادرەکان لەسەر پەچە کەوتبوو. دەنگی خۆشی زەنگ مۆسیقایەکی تایبەتی بەم دەر و دەشتە بەخشیبوو. لە داوێنی ڕەشماڵەکان زەوی و زاری کشتوکاڵ خۆی دەنواند، بەشێکی زۆریان بەراو بوون، هەڕەمەکی دابەش کرابوون. کەسانێك بە وێدا دەهاتن و دەچون. زینی ئەسپێکیان هێنا و جەعفەر برای فەرامەرز وەك زینسازێکی کارامە دەستی کرد بە نۆژەنکردنەوەی، چەرمی ساخ کردەوە و ئاوزەنگی وێخست. گرامافۆن بەردەوام خەریکی کارکردنە و هەر تاوەی قەوانێك دەگۆڕن. ئەم دەنگ و ئاوازانەش زیانێکی زۆر بە گۆرانیی ڕەسەنی ئەو ناوچەیە دەگەیەنێ. هەر وەك گۆرانییەکانی ئەو پیرەپیاوەی چەند قامێکی بۆ گوتین. تەنانەت بۆ ئێمەش باش نییە و ڕێگەی کارکردنمان لێ دەگرێت. ولاخێکیان نارد نەجەفخان لە لای بەراوەکان بێنێتەوە لە نێزیك ڕووبارەکە. فەرامەرز هەر بۆڵەی دەهات، بۆچی ئەو پیرەپیاوە داناکەوێ، بۆ ئەوەندە خۆی ماندوو دەکات. ئێوارە و گڕی ئاوری دەم ڕەشماڵەکان، سەفا و وەفای بەردەوامی ئێلاتی نیشان دەدا، بەڵام ئەمجارە ئەو دەنگەی دیگار لەو کچە ئێلاتییەی تۆمار کردبوو، کەوتە سەر دەنگەکانی دیکە. زۆر بە هەست و سۆزەوە گۆرانی «دەی بەلا»ی دەوت. ئەم شیعر و ئاوازە بۆ خەڵکەکە ناسراو و پەسندە و هەرگیز کۆن نابێ. دیگار بە جەفەنگ ناوی نابوو سروودی نەتەوایەتیی بەختیاری. وەختێ هەتاو ڕووی لە

خۆرنشین دەکرد ئەم ئاوازە ڕۆحی بەم کوێستان و هەوارە دەبەخشی. دیگار بە قاچی ئاماژەی پێ کردم، ئاوڕ بدەمەوە، بە قامکی سێرەی لە شوێنێك گرت و پێکەنی، ئاوڕم داوە و بەرات، برا ڕەبەنەکەی فەرامەرزم چاو پێ کەوت، سەری نابوو بە ملی یەکسمەکەوە و دەستی بە یاڵ و بژی ماینەکەدا دەهێنا، بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ لە دوور ڕامابوو، گوێی بۆ دەنگی دلڕفێنی کچە خێلاتی ڕاگرتبوو، وا دیارە تۆوی ئەوینی دلداری خەریکە لە دلّی ئەم پیاوە ئێلاتییە بێ غەلوغەشەدا چەکەرە دەکات. هەموو جارێك بە دەم ئاوازەکەوە خەریکی خۆڕاژاندنە و هەناسە هەلدەکێشێت. ئەو تێڕامانەی من و دیگار وای کرد ئەوانەی دەور و بەریشمان پێی بزانن، ئەوانیش چاویان تێ بڕی و بەرات پێی زانی و بەخۆیدا شکاوە. لە پڕ وەك هەلۆ خۆی خستە سەر پشتی ئەسپەکە و ڕووی کردە پەرچەمەڕەکە، لە مالەکان دوور کەوتەوە و ئاوای ئەو دیوی بەندەنەکە بوو، ئەو جێیەی ئێمە دەنگی ئەو شۆخەمان لێ تۆمار کردبوو.

نەجەف خان قیت و قنج بەسەر مالّی زینەوە بۆ لای ئێمە دەهات. کوڕەکانی بە تالۆکە بەرەو پیری چوون، هەوساری ئەسپیان لە دەست وەرگرت و دابەزی. هەر بە دابی خۆی مەسینەیان بۆ هێنا، دستنوێژی هەلگرت و چوو لەو لاوە سەری بە سووژدەی یەزدانیدا دا، وەختێ لێ بووەوە قاپووتەکەی هێنا و لە قەراخ ئاورەکە چوار مشقی دانیشت. لەو کاتەدا بەرات گەیشتێ و زینی لە پشتی ئەسپە شێ دامالّی و بەرەلای پشت چادرەکانی کرد. دایە دەستە و نەزەر، ئامادەی خزمەتکردن، زۆریش بە ئێمە ڕادەگەیشت. وەختێ چایی لە پێش دادەنایین زۆر پیاوانە سەری بەرز ڕاگرت و گوتی، «دەبێ دەنگی ئەو کچە وەسەر بخەن با گوێم لێ بێ»، ئێمەش حەزمان نەکرد دلّی بشکێنین، دیسان دلدۆڕاوانە لە زەریای ئەویندا کەوتە مەلەکردن. دەنگی گریانی زارۆیەك بەرز بووەوە، نەیدەهێشت چێژ لەو ئاوازە دلڕفێنە وەرگرن، نەجەف خان تووڕە بوو، گوتی لێرەی لابەرن. سەرم لە ژیانی ئەو پیرەمێردە سووڕمابوو، سۆلەی چرای ڕەشمالەکان بە ئامێزی کێوەزەردەوە، ژیانی ساکار و بێژەنگی ئەم هەوارە سالهای سالە بەو داب و نەریتەوە، بەو یاسا و خاوێنی و کەژ و کۆوە، مانەوە و ڕاوەستاوی بەو ئێلاتیانە بەخشیوە. تەك و تووك ئاگردانی بەر دەرگەی ڕەشمالەکان زەردایییان لێ دەبڕا و دەکەوتنە ژێر چەپۆکی تاریکییەوە. شەو خۆی دەکێشاوە و ئێمەش خەوتین. بەرات

کەوش و کاڵەی هەڵکێشا، چوو یەکسمەکە بێنێتەوە نەکا زیانی بکات. بزەی مانگەشەو دزەی کرد و خەوی لە چاوان ڕفاند و بێدەنگی بە سرووشت دەبەخشی.

## یەکشەمە ١٨ی جۆزەردان

بەیانی وەختێ هەستاین فەرامەرز هێشتا لە خەودا بوو. بەرات چایی ئامادە کردبوو دەستی نابووە ژێر چەناگەی لە تەنیشت کوچکاورەکە خەیاڵ بردبوویەوە. بە هێمنی چووم لە پەنای دانیشتم بگرە شتێکی لێ هەڵکرێنم. وەختێ چاوی بە من کەوت ساکار و بێ پەردە گوتی، ئەو کچە گۆرانی گوت و من ددانم لە ژان کەوت. نانی بەیانی پێ داین و چوو بە لای ڕیشتاشینی خۆیەوە. کەسێکی دیکەش هات و گەنەتووکی پشت ملی تاشی. بە هەورازەکەدا سەرکەوتم بۆ ئەوەی بە هەستەوە لەم دەرو دۆڵە بڕوانم. دیسان دەنگی تۆمارکراوی کیژەئێلاتی سەرنجی ڕاکێشام. گەڕامەوە بۆ جێی خۆم، سەیرم کرد بەرات لە دنیای خۆیدایە، ئاواتەخوازە چرۆی هیوای بترووکێ. فەرامەرزیش خەریکە شیعرەکە وەردەگێڕێتە سەر فارسی و دیگاریش دەینووسێتەوە، بەڵام هەرهەمووی بە لووڕی پێ دەگوت. سێ ئەسپیان زین کردووە من و دیگار و فەرامەرز سوار بووین و وەڕێ کەوتین، ڕێگە بێ بڕانەوە و لێژ و هەڵەمووت! چارەوێکان وەسەر ناکەون، لە زۆر شوێن ناچارین دابەزین و بە دووی خۆماندا بیانکێشین. جاری وایە ئەسپەکەی من پێی دەچەقێنێ و لە دووم نەیات. ئەوەندەم نەزانی فەرامەرز زانی چ باسە گوتی «وەختێ ئەسپەکە بە دووی خۆتدا ڕادەکێشی چاو لە چاوی مەبڕە». بە قسەم کرد و ئەسپ ڕێگەی لەگەڵ داگرتم. نێزیکەی دوو دەمژمێر بە ڕێگەوە بووین، ئەوجار گەیشتینە «چاڵ دەرەچنار» دۆڵەچنار، لە ناوچەی «بیگون». دە ڕەشماڵێکیان لە شوێنێکی تەختانی هەڵدابوو. دوو کانیاویش لە تەنیشتیان. ملیانا لە قسەکردن، هەر بەسەر پێوە، ئێرەش « هەواری « مەجید تالبی»ی خاڵی فەرامەرز بوو. قەول وابوو نانی نیوەڕۆ لێرە بمێنینەوە و شەوێ میوانی عەیوەزخان بین. سەرۆك هۆزی تایەفەی بامدی لە تیرەی «کەشکی». بۆ ئەوەی ناسیاری لەسەر ئەم تیرە و تۆرەمانە پەیدا بکەین، بزانین تایەفەی ئەم هۆزانە کێن، لەگەڵ دیگار ڕێك کەوتین لە یەکەم دەرفەتدا، بچینە لای بەتەمەن و ڕیش چەرمووەکانی تایەفە. خشتە و نیشانەیەك پەیدا بکەین. دابەزین و چووینە

ڕەشماڵێك تا بلێی پاك و خاوێن و خانانە بوو. پەتووی مەلافەگیراو ئامادە بۆ دانیشتن، دەستەنوێن بە ڕیز بۆ پاڵ پێوەدان. بە گەرمی خۆڵکیان کردین و وەلای سەرویان خستین. بەدوای ئێمەشدا ئەوان خێزەرەیان کرد و بە ڕیز دانیشتن. هەل و دەرفەت لە وە باشتر نەدەبوو، هەرهەموویان بە سالاچوو ئاگەدار بەحاڵ و ئەحواڵ. لە ئێمە پرسیار و لەوانیش وەلام، کێن و چ کەسن:

لە یەك هێڵدا، تایەفەی بامدی (بابائەحمەدی)- دورکی باب- سیراجەدین= برام، ئۆدیوی، ئەحمەد فەخرەدین، دەروێش میرحاج، کووهی، دەروێش ئادەمی.

کەشکی= کەریم، محەمەد ڕەزا، شەمە، کازم، ئەلقاس، بابا، ڕەحیم.

مەجید تالبی و فەرامەرز مەحموودی کوڕی «برام»ن. ئەم باسەش تەواو بوو. تووشماڵەکانیش لە لایەك بوون. ڕەنگە هەر بۆ ئەو میوانییە بانگێشتن کرابێتن. هەرلەو ڕەشماڵەدا، تووشماڵ شمشاڵەکەی نا بە لێویەوە و بە ئاوازێکی حەزینەوە تێی توڕاند، خەمڕەوێن و هەستبزوێن. کەس سریوەی لێوە نایات، دیگار خەریکی تۆمارکردنی دەنگی شمشاڵە. ئەو دەنگە خۆشە ئاوپڕژێنی دڵ و هەناوە، وردە وردە خەڵکەکە وەڕەز دەبوون. داوایان لە تووشماڵەکان کرد، دەهۆڵ و زوڕنایان بۆ لێ بدا. ئاوازی «دارولك» دەستی پێکرد، بوو بە سەما و چۆپیکێشان. لەو سەماکردنەدا دوو کەس لە پیاوانی ئێلاتی بە لێکدانی دارولك کەوتنە هەڵەکەسەما. یەکێك داردەستێکی ئەستووری بە دەستەوەیە بۆ بەرگریکردن لە خۆی ئەوی دیکە شووڵێك. بە جووڵەیەکی تایبەتەوە لە قاچ و قوولی دەدا، هەرلەو کاتەدا وریای یەکدین. لە بنەوە ئاگایان لە یەکتر هەیە و ئەو کەسەی بە تەمای دەستوەشاندنە شووڵەکەی لە پشت خۆیەوە دەشارێتەوە. خاوەن دارەکەش نازانێ بە کامە دەست شووڵەکەی لێ دەدەن. ئەگەر بێت و زۆر وریا نەبێ زەبری شووڵ چزە لە قاچ و قوولی هەڵدەستێنێ. ئەم شێوە سەمایە تەواو ڕەزم و کارەزارە، لەنێو بەختیارییەکاندا. هەر وەختێ یەکیان دۆڕا، جێگۆڕکێ بە دارو شووڵەکە دەکەن و دواتر بە پێچەوانەوە. ئەو کاتەی کار دەکەوێتە تووڕەبوون، تووشماڵ ئاوازەکە دەگۆڕێ و کەسەکان بە دەسماڵەوە سەمایەکی دیکە دەست پێ دەکەن و دەبێتە ڕەشبەڵەك و چۆپیکێشان و دەسرە هەڵسووڕاندن. تووشماڵ هەوای سێ پێیی دەژەنی و خەڵکەکەش بە پێی ئەو ڕیتمە هەڵدەپەڕن. «نابێ ئەمەشمان لە بیر بچێ زۆرینەی سەما

و هەڵپەڕکێکانی گەلی بەختیاری وێکچوون و نێزیکایەتی هەیە لە جۆری هەڵپەڕکێی کوردەواری)).

دەفرێکی پڕ لە بەفریان هێنا بۆ ئێمە، بە کەوچك دەستمان کرد بە خواردن. پرسیم لە کوێ هێناوتانە؟ دوو کەسیان نیشان داین، چووبوون لە بەفرەچاڵ هێنابوویان. کاسەیەکیان دۆ هێنا پڕبوو لە بەفر تا بڵێی بەتام بوو. پیاوەکان خوڵکی یەکدیان دەکرد و دەیانخواردەوە. کابرای تووشماڵ بە بێ ڕاوەستان خەریکی کاری خوی بوو. دەیانگوت لەسەر یەك ٢٤ دەمژمێر بەردەوام دەتوانێ خەریکی زوڕناژەنین بێ. قوولیك شووڵی تەڕ لەو لاوە داندرابوو ئەو کەسانەی سەرقاڵی یاری و سەمابوون، هەروەختێ دانەیەك دەشکا خێرا شووڵێکی دیکەیان هەڵدەگرت. تا ئێرە بۆ من دەرکەوت بامدییەکان لەو هۆزەدا زۆرتر بە خۆیان ڕادەگەن، تەواو چێژ لە ژیان و سرووشت وەردەگرن. کوڕێکی گەنج بەم دار و لکە زۆرجوان سەمای دەکرد، بە هەر دوودەستی نووکی شووڵەکەی دەگرت و هێرشی دەکردە سەر خەنیمەکەی. بەسەر و دەست و شان و مل سەمایەکی جانانەی دەکرد و نەك دڵێك، سەد دڵ ئاشقی دەبوو. منداڵێك سەرنجی ڕاکێشام لاسای دارولکی دەکردەوە. بەنێکیان ڕاست و چەپ بە شانی منداڵەدا کردبوو، ڕازاوە بە کوژەکە و زەنگوڵە و مت و موور. پرسیم، ئەوە بۆچی دەبێ؟ وتیان: ئەوە لە سەرێکەوە بۆ جوانییە، لە لایەکی دیکەشەوە ئەگەر ئەو منداڵە لە دایکی ون بوو، بە خڕە و دەنگی زەنگوڵەدا زوو دەیبیننەوە و بۆ بەرگری لە چاوەزاریش باشە! دوای ئەم هەموو بەزم و ڕەزمە خۆر گەیشتە تەشقی ئاسمان و کاوڕێکیان سەربڕی و نیوەڕۆ کەبابمان خوارد. کوڕە جەحێلان خۆیان ئامادە کرد بۆ سواری و جلیتانێ. بەیتار هاتبوو هەر کەسە و ئەسپی خۆی تیمار کرد. ئەسپیان زین کرد و چۆخەیان دانا و خۆیان هەڵدا سەر ماڵی زین. هەلووکێکیان لە زەوی چەقاند و دەسماڵێکیان بەسەردا دا، سوارەکانیش بە هەوای تووشماڵ دەهاتن و دەچوون، وەختێ دەگەیشتنە ئاستی هەلووکەکە بەسەر ئەسپەوە دادەهاتنەوە و دەسماڵەکەیان دەڕفاند. ژنەکانیش بۆ ئەو کەسانەی براوە بوون، هەلهەلەیان دەکێشا. ئەمەش یارییەکی تەواو دۆستانە بوو. عەیوەزخان و فەرامەرز نۆرەی کەسیان نەدەدا، بتەوێی و نەتەوێ کوڕەلاو تا بڵێی سوارچاك بوون، ئافرەتەکانیش زۆرتر هانیان دەدان و دڵگەرمیان دەکردن. وێنەیەکی زۆرمان هەڵگرتبوو فیلمەکانمان تەواو

بوون. چراغعەلی سوارچاکێکی هۆزی بامدی چوو لە چادری فەرامەرز فیلممان بۆ بێنێ. قەول وابوو لە ماڵی عەیوەزخان یەکدی ببینینەوە، بۆ شێوخواردن بانگێشتن کرابووین.

تووشماڵەکان دەهۆڵ و زوڕنایان دانا و ملیان نا لە چایی خواردنەوە. سوارەکانیش بۆ خاوکردنەوەی ئەسپەکان کەوتنە وێرغەکردن. ژنەکانیش کەوتنە شووشتن و ڕاپەڕاندنی کارەکانی خۆیان. پشوویەکمان دا و ئەسپەکانیان ئامادە کرد، سواربووین و ڕوو بە ڕۆژهەڵات تێمان تەقاند. ئێستەش ناوی ئەم شوێنە «چاڵ دۆڵەچنار»، «بیرگون»ە. نێزیکەی دەمژمێرێك بە ڕێوە بووین جا گەیشتینە ماڵی عەیوەزخان. پیاوەکان بەرەو پیرمان هاتن و هەوساری ئەسپەکانیان لێ وەرگرتین و ئێمەش دابەزین. ڕەشماڵێکی گەورە بە دوو ئەستوونەوە هەڵدرابوو. فەرمویان کردین، وەژوورکەوتین و پاڵمان دا بە دەستە نوێنەکانەوە. ئەوەندەی من بینیوومە ئەستێوڵك ئامادە لەسەر کوانوو دانراوە بۆ کتری لەسەردانان و چایی سازکردن. زۆرجار ئەو کوتە ئاسنە دوودانەن بە زنجیرێکی باریك لە یەکدی مارە کراون. دەستوبرد کتریان وەسەر نا، دوای قەننەکێشێك چایی ئامادە بوو. لێرە بە پێچەوانەی عەشیرەتی بابادی ژنەکان دێنە ژووری و میوان بەخێرهاتن دەکەن. ئەوانە لە تیرەی کەشکۆڵین. چەند خێوەتێکی بێهداروەندی نێزیکی ئەوانە. ئەوانیش بەشە لەوەڕیان هەیە، هەر بۆیە هۆبەیان لێرە هەڵداوە. ئەوانە ڕەشماڵەکانیان بە شێوەی بازنەیی بە دەوری یەکیدا هەڵداوە. ئەوەی لە هەموو جێیەك دیتوومانە ئەوەیە ئافرەتەکان لە پێشەسەریانەوە مووی سەریان بە دوولادا بەش دەکەن. ئەم دوو بەشەش دەگرنەوە و دەیکەنە پەلکە و لەژێر چەنەدا گرێی دەدەن. کەمتر ئافرەتیان هەیە ئەگریجە دانەنێت.

چەند تێڕ و توربێنی جوان سەرنجی ڕفاندین، لە سووچێك لەسەر یەك هەڵیانچنیبوون. ئێمە پرسیارمان کرد و ژنەکانیش وەڵامیان داینەوە. ئەوانە کر و دەستکاری خۆیان بوو. بەختیارییەکان، پێی دەڵێن «هورجین، هوڕ، گامەسیسە».

تەنیشت لاشانی ئەم تێڕ و توربێنانە بە شێوەیەك چندراوە ئەگەر لە شاخ و بەرد گیرا زوو نەدڕێ. هەر هەمووی ئەوانە بە نەخش و ڕەنگی تایبەت ڕازاوەیەو و جێی تێڕامانە. ئەو بەشەی لە چەشنی فەڕش چندراوە خۆیان پێی دەڵێن قاڵیچن. هۆڕیش ئارد، یان گەنمی تێ دەکەن، دەرگا و زارکی تایبەتی نییە و تەنیا کونێکی بۆ دەهێڵنەوە، دەستی پێدابکەن و ئەو شتەی تێیدایە دەری بێنن.

چۆخه و جل و پەلاس، به «سادەچن» بەناوبانگە، هەروەها تەختە ڕەشماڵەکانیش. بەڕەکانیش به «لێی» ناودێرن، پێیان دەڵێن «بتەشاهی». جگه له «نوفتوربێن» دوو کوتە پەڕۆ نێزیکەی دە سانتی مەتر لە٦٠ سانتی مەتر، به دووگمه دەیڕازێننەوه، به دوو گوڵێنگەوه. داوێنی تێڕ و توربێنەکان به گوڵینگ ڕازاوەتەوه، ئەو گویلگانەش وەختێ دەدرێن بەسەر یەکسمەکاندا بەرگری دەکات له پێوەدانی مێش و مەگەز به لاق و قوولی چارەوێکانەوه. بۆ دابەسنتی ڕەشماڵەکان جگه له گوریس دەسکەوسارێکی دیکە به دوو ڕەنگ دەهۆننەوه به ناوی «ڕەشمەی گوڵدارچین» دەرفەتێکی باش بوو لەمەڕ ئەم بەن و گوریسانەوه بپرسین، بەلام پرسیاری ئێمه و وەلامی ژنەکان پیاوەکانی ماندوو کردبوو. لێرەدا ژنەکان به ڕادەیەك خاوەن دەسەلات بوون. فەرامەرز لەگەڵ ئێمه ڕوودەربایسی نەبوو وتی جارێ تەواوی بکەن، دواتر بینووسنەوه، ئێمەش ڕازی بووین.

ئێره وەك ماڵی تالبی نەبوو، نه تووشماڵی لێیه و نه دەنگی گۆرانی دێت. لێره بێدەنگی و خواردن هەبوو. بەم پرسیاره دەرگەی باسەکەمان کردەوه، ئەم دۆڵە گەورەیە هەمووی موڵکی بامدییەکانە و تایبەت به عەشیرەتەکەیە؟ فەرامەرز گوتی: لێره شوێنی هەر تیره و تایەفەیەك نیشانە کراوه، بۆ نموونە سنووری منداڵی «برام» له تیرەی سیراجەدین، تایەفەی بامدی له دورکی باب بەم جۆرەیە، هەر بەم شێوەی کە خۆی ئاگەدار بوو بۆی باس کردین، گۆیا بەنچاق کۆنە موڵکی ئەوانه:

کەوشەنی یەکەم «دۆڵی ئاشان» ئاوه و ئاو وەره خوارێ تاکو دەگەیە «کانی گەنجاو» سەرکەوه بۆ «گڵەزڕاب» ڕووبەڕوو وەره بۆ «قەنبەرگوشنه» ڕێگەی قەنبەرگوشنه سەرەوخوار دەبێتەوه، بۆ «سەر کوری ئاوباریکە» ڕاست ڕوو بکه «بەرزایی لەیله» ڕاست دەچێته «چاڵی گرەسپی» ئاوی «بیرگان» دەگرێتەوه، چۆما و چۆم دەچێتەوه سەر سنووری «دۆڵی ئاشان».

دیگار فەرمووی، کەریمی بەو خەتە جوانەت ئەو شتانە له تێنووسەکەی مندا یاداشت بکه، منیش بێ دڵیم نەکرد. ئەمڕۆ زۆر ماندوو بووین، چاوەڕێ بووم دیگار بڵێ با بخەوین، باش بوو فەرمووی کرد.

## دووشەمە ١٩ی جۆزەردان

لەگەڵ تیشکی خۆر لە خەو هەستاین، وەختێ فەرامەرز لەگەڵمانە چ خەممانە، باشمان بۆ دەگوزەرێ. بۆ هەموو لایەکمان دەبات. ئەم بەیانییەش هەر بە دابی خۆیان خواردنمان نان و ماست بوو. ئەسپیان بۆ زین کردین و وەڕێ کەوتین. لە پاش سێ دەمژمێر بەسەر پشتی یەکسمەوە گەیشتینە ئاوایی «مۆرەدێل». ئەم گوندە نێزیکەی یازدە بنەماڵەی لە خۆ گرتووە. بەرلە تەختەقاپۆ، واتە چل ساڵ لەمەوبەر لێرە داسەکناون. پێنج ماڵی مول مولیل و شەش بنەماڵەی بەختیارەوەند، هەر دوو لا لە تیرە و تایەفەی مەزنی «بێهداروەند»ن. هەر وەك خۆیان باسیان کرد، بێهداروەندان، لە بابەت ژمارەی دانیشتووانەوە، یەك لە سێی حەوت لەنگ پێك دەهێنن. بە ئەنگوست حیسابیان کرد نێزیکەی ٤٠٠٠ بنەماڵەن. بە هۆی ئەوەی ڕێژەیان زۆرە خاوەنی ٦ سەرۆك هۆزن. ئەو سەرۆك هۆزانە ئێلخانین و بریتین لە: ئەمیرحوسێن خان ئەسعەد، سوڵتان مرادخان مەحموودی و فەرەجولاخان بەختیارەوەند، لەگەڵ ئەو سەرۆك هۆزانەی وا حاجی ئێلخانین هەر وەك: سمایلخانی بەختیارەوەند، پەرویزخانی عەجەمی و حەیات قوولیخانی ئەمیری. هەروەها ئەو سێ برایەی وا حاکمی هۆزەکە بوون: حوسێن قوولیخانی ئێلخانی، ئەمیرقوولیخانی حاجی ئێلخانی و ڕەزاقوولیخانی ئێلبەگی. هەروەك لە جێیەکی دیکەشدا باسم کردووە، حوسێن قوولیخان لەگەڵ یەکدی تەساڵحە دەکەن و ڕەزاقوولیخان لەنێو دەبەن. ئینجا خۆیان لە دژی یەکتر ڕاست دەبنەوە و سەرەنجام ئێلەکە لە نێوان خۆیاندا بەش بەش دەکەن. ئیتر مەسەلەی ئێلخانی و حاجی ئێلخانی لەنێو ئێلدا ساز دەبێ. سەرۆك هۆزیش لەو نێوەدا دەبێتە پارێزەری قازانجەکانی خان.

لەبەردووکانێك لە ئەسپەکان دابەزین. دووکاندار خەڵکی فارسان بوو. گوندێك لەو بەرمانەوە دەرکەوت، فەرامەرز گوتی ئەمە «گوندی شەهریارە» سەردانێکی ئەوێش دەکەین. کوێخای گوندەکەش لەو دووکانە دانیشتبوو، خوسرەو بەختیارەوەند. بە هەر لایەکدا ئاوڕمان دەدایەوە کێڵگە و ئاو و ئاوەدانی بوو. خانووبەرەی بە بەرد و قوڕسازکراو، لە پشت ماڵانش دەوە و تەپاڵە و سووتەمەنی لێ بوو. سەبارەت بە ئاوایی پرسیارم کرد و دەمی کوێخام هەڵپچڕی، گوتی: سەرەتا گوندەکە شەشدانگ موڵکی

خۆیان بووە. وردەوردە براکانی بەشی خۆیان فرۆشتووە و ئێستە تەنیا دانگێك بۆ کوێخا ماوەتەوە. زۆرتر وەرزێڕن نەك ئاژەڵدار.

زۆر لەم دێیە مەحتەل نەبووین، دووچاییمان خواردەوە و چوارناڵ بەجێمان هێشتن. شەهریارمان لە دەستی ڕاست بەجیٚ هێشت، لە ماڵێك نێزیك بووینەوە ئاڵایەك بەسەر سەربانەکەیەوە دەشەکایەوە. ئەمەش یان قوتابخانە بوو یان ژاندارمری. قوتابخانەی دەوڵەتی بیرجان بوو، واتە بیرگان. دەرگە و پەنجەرەی بە بیٚ شووشە. بەنێو کۆڵانە پڕلە دارو درەختەکاندا سەرکەوتین، دەستەیەك بەرە و پیرمان هاتن. هەوساری وڵاخەکانیان لیٚوەرگرتین و تەوقەمان لەگەڵ کردن. دەروازەیەك ئامێزی بۆ کردینەوە و چووینە ژووریٚ پیرەمێردێك پێشوازیی لیٚ کردین. فەرامەرز گوتی ئەوە یاوەر مرادیە. ڕیش چەرمووی ئاوایی و لە بنەماڵەی «مول مولیل»ە. لە ساڵی ١٣١١-وە لەو ناوچەیە گیرساوەتەوە. ئەم گوندەش هەر بە ناوی ئەو ناونراوە. پێشتر گوندەکە ناوی «قەڵاچەپ» بووە. ئێستەش زۆر کەس ناوە کۆنەکەی دێنن، بەڵام باش وایە هەر یاوەرئاوا بێت. تێکڕا ڕوومان کردە ژوورێك، پڕلە فەرش و خاوێن. قسە و باسمان دامەزراند و کەوتینە پرسیارکردن. بۆمان دەرکەوت ئەم یاوەرئاوایە نێزیکەی سی بنەماڵەیە. کانییەکی هەیە پێی دەڵێن «کانی مرواری» بیست و یەك ئاشی لەبەردایە. لەم گوندەوە تا دەگاتە فارسان هەر هەموویان «مول مولیل»ن. لە ساڵدا چوار مانگ خەڵکی ئەم دێیە ڕێیان لیٚدەگیریت. تەنیا دەستەیەك دەتوانن بە کەڵکوەرگرتن لە «درگ» ئەمەش لە شاخی بەران دروستی دەکەن بەسەر بەفردا بڕۆن، تا دەگەنە فارسان. هەموو پێداویستیی خۆیان لە فارسان دەست دەخەن. کاروباری ئیدارییان لە فارسانە. وا دیار بوو خەریك بوون ڕێگەیان بۆ بکێشن، لە شاریکوردەوە بۆ خوزستان، ڕێگەکەیان ٢٠٠ فرسەخ بۆ نێزیك دەکاتەوە. ئەم ڕێگەیە تەواوی ناوچەی بازفت دەگرێتەوە. بەر لەوەی بگاتە بازفت وا دیارە بە یاوەرئاوادا تیٚ دەپەڕێت. هەموو چاویان لەم ڕێگەیە بڕیوە، ئەگەر بۆیان ساز بکرێت. دەنگی دەهۆڵ و زوڕنای تووشماڵ دەهاتە گویٚ. بە ئاماژەی فەرامەرز تێگەیشتین چ باسە؟ قەول وا بوو سبەی نا ئەدووی شایی و زەماوەند بێت. ئەوان هەرلە ئێستەوە بەرەو پیری ئەم شاییە چووبوون. فەرامەرز زۆر حەزی لە قسەکردن نەبوو، پێی خۆش بوو لە جەژن و شادیدا بێت. لەگەڵ خۆی بردینی بۆ دەریٚ. تووشماڵەکان لە بەرهەیوانی

فێرگە کۆمەڵێك گەنجیان هێنابووە هەڵەکەسەما. کوڕگەلیش خەریکی یاری دارولك بوون. لێرە لە باتی شووڵ لاستیك و شیلانکیان بە دەستەوە بوو. زۆریش بێ بەزەییانە لە یەکدیان دەسرەواند. کەسیش نێوچاوانی تێك نەدەنا. هەرکەسێکیش ئامادەی ئەو سەمایە دەبوو داری وەردەگرت و دەچووە مەیدان. تووشماڵەکانیش دەهۆڵیان دەکوتا و لە زوورنایان دەتووراند. بەزمەکە تەواو ڕەزمی بوو. هەر لەوێ ژنەڤتمان ٣٦ ئاوایی لەو ناوچەیەدا هەیە، هەموویان بەختیاری تەختە قاپۆی دەورەی ڕەزاشان. بە تەواوی ئەو ٣٦ گوندە، ئەو قوتابخانەیان هەیە. کانی و ئاو لەو ناوچەیە تا بڵێی زۆرە و گشتی سەرقاڵی کشتوکاڵن، هەر وەك دەڵێن «دان و ئاویان لە پاڵ خۆیاندایە». کەمتر خەریکی مەڕدارین. دەبێ ئەمەش نەشارینەوە لەم سەفەرەدا، زۆرتر سەروکارمان لەگەڵ سەرۆك هۆز و پیاوماقووڵانە. زۆریشمان حەز بەم ڕەوتە نەدەکرد. لە ڕاستیدا پێمان خۆش بوو تێکەڵ بە خەڵکی ئاسایی ببین، بەڵام بۆی دەست نەداین. ئەگەر بمانویستبا ئەم کارەش بکەین ئەوانە لێمان نەدەبوونەوە. لووڕی بەستەزمانیش لەکن گەورەپیاوان زمانیان لە دەمدا نییە. تەواوی بوو بە میوان و میوانداری. ئەوەی بە دەورو بەری ئێمەوە بوو، تەنیا باسیان لەسەر ڕێگەوبان بوو. حەول و دەولیان ئەوە بوو ڕێگەیان بۆ بکێشرێ و کاربەدەستانی دەوڵەت هاموشۆیان بکەن و بەختیارییەکان بە بێ ترس و دوو دڵی بژین. تایەفەی بابادی، ژیانیان لە هۆزەکانی دیکە تاڵ کردبوو. کەمتاکورتێك لووڕی حاڵی دەبووین و دەمانزانی باسی چی دەکەن. لاماندابووە یاوەرئاوا، دوای نانی نیوەڕو درێژە بە سەفەرەکەمان بدەین، بەڵام نەیانهێشت. بەڕێز داوەری دەیگوت، ئەم ماڵە تایبەتە بە کارمەندانی دەوڵەت. لەبەرئەوەی منی بە پیاوی دەوڵەت حەساو دەکرد، زۆریشی باسی وڵاتپارێزی دەکرد، باسی ڕێگەکەی دەکرد، «تەواوی ڕێگەکان خۆش کراون، تەنیا کەلی کەڵەك ماوە ئەویش دەوڵەت بەڵێنی داوە دایبڕێت، بەڵام دەستی پێ نەکردووە». چاوەڕوانییان لە دیگار نەبوو، مەحتەل بوون من شتێك بڵێم. منیش تەنیا بێدەنگیم پێ مابوو. بە هۆی ئەوەی نەمدەویست قەولی خۆڕایی بدەم. دیگاریش بە تەمای یاریی دەسماڵڕفاندن و ناسینی بەختیاریگەلی لادێنشین مابووەوە. لە نێوان قوتابخانە و ماڵەکەدا بەردەوام لە هاموشۆدا بووین بۆ وێنەهەڵگرتن. لەو هات و چۆیەدا سەردانێکی ئاشەکانمان کرد. لەمەڕ ئاشەکانەوە چەند شیکردنەوەیەکم دا بە دیگار،

ئاگەداریی لەوە پێشم هەبوو. ئێمە پێمان خۆش بوو بە ئاوایدا بگەڕێین، بەڵام هاوڕێیان حەزیان لە گەڕان بەنێو دار و درەخت و بەندەنەکاندا بوو، بچینە سەیرانی کانی و ئاو و قوتابخانە، تووشماڵەکان خەریکی ژەنینی دەهۆڵ و زوڕنا بوون. ئێمەش بە هۆی ئەوەی میوان بووین ناچار دەبوو بە قسەی ئەوان بکەین. لەو لاشەوە کوڕ و کاڵ هەر وەك پێشتر خەریکی یاری و زۆرانبازیی خۆیان بوون، بۆ ڕاهێنانی ئامادەیی جەستەیان.

بەختیارییەکان توندوتۆڵ باوەشیان کردووە بە داب و نەریتی خۆیاندا، تا بڵێی سوارچاك و دەست و تفەنگی باشیان هەیە. وەختێ سێرەیان دەگرت وەك ئەوە وابوو تیروکەوانیان بە دەستەوە بێت. هیچ تیروکەوانێکمان لەنێو خێڵەکەدا نەبینی، نەمانزانی ئەم شێوە دەست و تفەنگە لە کوێوە بۆیان ماوەتەوە. لە بیرمە وەختێ لە جەعفەرقوولیم پرسی، غارە ئەسپێك ناکەی، گوتی سوار بە چەك و فیشەکەوە جوانە، ئاوا بە کاری چی دێت. بەم جۆرە لێت ناکاتلێتەوە. پیاو سواری هێستر بێ باشترە، ئەمەش باوەڕی بەختیاریگەلە. شتێك کە ئێمە لەو ناوچەیە بینیمان، زۆریش سەرنجی ڕاکێشاین، ئەو خەڵکە بوو کە چۆن ڕوویان کردووەتە «کۆیت» ئەوانە لە شوێنێك نیشتەجێ بوون، هۆگریی تەواویان بە کوێت هەیە و بۆ بەدەستهێنانی پووڵ و پارە ڕوویان کردووەتە هەندەران، ئەوەی دەیهێننەوە تەنیا ماڵ و حاڵی پێ دەڕازێننەوە. ئەمەش باری ئابووریی تەواو گۆڕیون. زاوای ئەمڕۆکەمان یەکێ لەو کەسانە بوو تازە لە کوێت گەڕاوەتەوە، جلوبەرگی شاری لە بەردایە و هەرجارەی بە لایەکدا دێت و دەچێت. سەرەتا وامانزانی مامۆستای قوتابخانەیە، بەم بەرگە شیکەوە. ئەوانەی ئاوی کوێتیان خواردووەتەوە نازانن ئەم پارە وشکە چۆن خەرج بکەن، بیرێك ناکەنەوە کارێك بکەن دوارۆژ موحتاجی قون دەرکان نەبن. ئەیدەن بە زەڕق و بەرق و ماڵی پێ دەڕازێننەوە. ماوەیەك بوو تووشماڵ هەوای ڕەزمی بە بەزم گۆڕیبووەوە و پیرەژنی دەهێنا سەماکردن. جەحێڵان ئارەقە لە بەری پێیان دەچۆڕا. ئێمەش لە بەر هەیوانەکەوە پڕ بە چاو سەیرمان دەکردن. چێژمان وەردەگرت بە چایی و جگەرەوە. چەند جارێکیش دەستیان گرتین و پێیەکمان پێ دادا. دەستی داوات بەر بوو، هەڵپەڕکێ و سەما کۆتایی هات. هەستاین و ڕوومان کردە کەژ و کۆساران. لەگەڵ فەرامەرز قەرارمان دانا سبەی نیوە ڕۆ و شێو بچین بۆ جێیەکی دیکە و ڕۆژی بووکگواستنەوە بگەڕێینەوە و لەو شاییەدا بەشداری بکەین، وا دیار بوو

داوەتێکی خۆش دەبێ. کوڕەلاو پارەیەکی باشی لە کوێت هێناوەتەوە. هاتینەوە بۆ ماڵێ. ئەو بەختیارییانە هۆگرییەکی تایبەتیان بە یاریی حوکم هەیە و زۆریش لێی شارەزان. گەنجەکان یارییان دەکرد و پیرەپیاویش زەق زەق سەیریان دەکردن و لە پشتەوە بە قامك ئاماژەیان بە گەلاکان دەکرد. شەوێ دەنگی دەهۆڵ ڕایکێشاین، واتە فەرامەرز زۆرتر کەیفی لە چاوەڕاوی ئەو جێیانە بوو. دیگار بە یارمەتیی زاوا خەریکی تۆمارکردنی دەنگی چەپڵە و زوڕنا بوو. منیش لەگەڵ پیاوەکان کەوتمە ئاخاوتن. زۆری پێ نەچوو هاتینەوە و خۆمان بە ئامێزی خەو سپارد...

## سێشەمە ۲۰ی جۆزەردان

بەیانی دەمژمێر ۷/۳۰ وەئاگا هاتم، دیگار و فەرامەرز هێشتا پرخەیان دەهات. بە چەند پژمینێك لە خەوم هەستاندن. شەوێ حەسارەکە پڕ بوو لە کاوڕەگەل، بەیانی تاقە دانەیەکی لێ نەمابوو. ئاوێکی خاوێن بە حەسارەکەدا دەڕۆیشت. چەند سەرێك مانگا و گوێرەکە لەوێ مابوون. ژنەکان لەو لاوە سەرقاڵی تەشیرێسی و سەوزی چاکردن و ساوەرکوتان بوون. نان و پێخۆرمان ماست و سەوزیی تازە بوو، سەرەڕای ئاژەڵداری هەموو خاوەنی باغ و بێستانن. زۆریان حەز لە خانووبەرەی خۆشە، بەردەوام باسی دەکەن. دوای نانخواردن، فەرامەرز خۆی کرد بە حەسارەکەدا و لێمان ون بوو. زۆری چاوەڕی بووین و نەهاتەوە. لەگەڵ بەڕێز مرادی چووین بۆ باغەکەی. قەیسی و هەڵوژە، گوێز و گێلاس بەرۆکی باخەکەی ڕازاندووەتەوە. لقی دارەکان عەرزیان ڕادەمووسی، بەڵام هیشتا هەر وا کاڵ بوون. سپیدارەکانی نیشان داین، ئاماژەی بۆ چوار داریان کرد و گوتی: ئەم چوار دارە دانەی سێسەد  تمەنم دەدەنێ نایانفرۆشم. وتی ئەگەر ئەوەیان لە نێودابێ دارەکانی دیکەش بە پارەی باش دەکڕن. ئەو دارانەی پایز بڕابوون، وەچەیان هەڵدابووەوە، ئەوانەی بەهارێش وشك و برینگ بوون. مرادی شەپۆلێك  پرسیاری ئاراستەی دیگار کرد، «لەم دارەت هەیە؟ لەو میوەیەت هەیە؟ ئەم سەوزەیەت هەیە؟» زۆری دار و دەرەخت و سەوزە نیشان دا. دیگار گوتی، ئێمەش ئەو دار و درەختەی بەری هەیە و لە کوێستانەکاندا شین دەبن هەمانە. بەراومان نییە، ئەوەی هەمانە دێمەکارە. مرادی ئیشارەتێکی بۆ تەپاڵەکان کرد و بزە گرتی، بە شەرمەوە لێی پرسی ئێوە

ئەوانەشتان هەیە؟ وەڵامەکەی دیگار بۆ ئەو چاوەڕواننەکراو بوو، دیگار گوتی: «لادێی کوێستانییەکان هەیانە، وەك ئەوانەی ئێرە، زۆرتر پشقەڵە و لە جێی وشك بۆ سووتاندنی زستان هەڵیدەگرن. ئەو دێهاتەی لە کوێستانەکاندان، ئاژەڵەکانیان لەکن خۆیان ڕادەگرن. لە زۆر شوێن ماڵەکان دوو نهۆمن، مەڕ لەژێرەوە و خۆیان لە سەرێن، هەشیانە لە هۆڵێکدا مۆڵ دارون، تەنیا دیواریان نێوانە. مرادی زۆری ئەو لێکچوونە پێ سەیر بوو، سەرێکی بۆ لەقاند. چووینە دووکانێك و لەسەر سەکۆکەی دانیشتین. دووکاندار گوتی، یاوەرئاوا ٥ دووکانی تێدایە. یەکێ لە دووکانەکان هەر ئەوە بوو شەوی ڕابردوو لە بەرهەیوانەکەیەوە سەیری زەماوەندەکەمان دەکرد. هەستاین و دەورێکی گوندەکەمان لێدا، زۆرچکۆلە بوو. گەراینەوە و فەرامەرزمان دیتەوە. لەگەڵ ئەویش سووڕێکی دیکەمان بەنێو دێدا لێدا و گەڕاینەوە. ئەوەندەمان زانی قرە و جەنجاڵی دەستی پێکرد. شەوێ ٢٢ سەر مەڕیان لێ دزیبوون. بە گوڕە و هەراکەدا دەرکەوت کە دزەکان بابادی بوون. ڕەنگە شەرمیان لە شوانە منداڵکارەکە نەکردبێ و ڕانەکەیان بردبێت. شوێنی دزییەکەش دەوروبەری چیای بابە حەیدەرە. خەڵکەکە تووڕە و پەرێشان، هەرلە و کات و ساتەدا بوو، هەواڵیان هێنا دەستەیەك مەڕەکانیان لێ سەندوونەتەوە و دزەکانیش هەڵاتوون. بوو بە خۆشی خۆشی و سوپاس بۆ یەزدان.

دیسان دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا دەستی پێکردەوە، نانی نیوەڕۆ میوانی دووکاندار بووین، مامۆستای قوتابخانەی ئاوایی بە ناوی مەحموودی لە بەختیاریی زەرئەسوەند، لەگەڵماندا بوو. وتی دوو ساڵە لێرەیە، فێرگەکەی ٥ پۆلی هەیە و نێزیکەی ٣٦ قوتابی دەرسی لە لا دەخوێنن، لە گوندەکاتنی دەوروبەرەوە دێن. نان خورا و تووشماڵ تێیانتووڕاند و شایی گەرم بوو. بوو بە ڕەشبەڵەك و چۆپیکێشان و چاوەڕاو. لەم بەزمەدا دیگار لەگەڵ ئەوان دەستی کرد بە هەڵپەڕکێ.

داوەت تەواو بوو. چارەوێکان زین کران و سوار بووین بەرە و «شەهریار» تا لە چۆمەکە چووینە ئەوبەر ڕۆح گەیشتە سەر کەپۆم. بۆ ئەوەی بگەینە شەهریار ئەسپی خۆمان لینگ دا، ماڵەکان هەموو پاڵیان بە یەکەوە داوە، لە گوندەکاتنی دیکە گەورەترە. خانەخوێمان ڕەشید خان، مامی بی بی شەوکەت خێزانی فەرامەرزی مەحموودییە لە تایەفەی بەهاروەندە. لەدووکانێك پرسیارمان کرد، نەبوو، دانیشتین

هەتا کوڕەکەی ژوورەکەی ڕێکوپێك کرد. فەرمووی کردین و چووینە ژووری و دانیشتین. تا بلێی ژوورەکە تاریك بوو. مسەبایەکمان گرت و لەگەڵ تاریکی ڕاهاتین. ئەوە یەکەم ماڵێك بوو لە تاقەکانیدا چاومان بە کتێب دەکەوت. ڕەشید خان هاتەوە، دەستوری دا لە حەسارەگەورەکەدا چادرمان بۆ هەڵدەن. ئەمەش نیشانەی ڕێزلێنانی تایبەتە. ئێمە ڕازی بەو ئەزیەتە نەبووین. بە بێ ئەوەی ئاگەداربین دەستووری دابوو کاوڕێکیان بۆ سەربڕیبوون. هەتا ئێستە چووینەتە هەرماڵك کاوڕیان بۆ سەربڕیوین.

ڕەشید پیاوێکی گفتولفت خۆشە، باسی زۆر شوێنی بۆ کردین. باسی ڕێگە و بانی شاریکورد و خوزستانی کرد. دەرکەوتین و سووڕێکی نێو دێمان لێدا. ماڵەکان تەواوی لە بەرد ساز کراون. دەور و بەری ماڵەکان پڕ بوو لە دەوە و تەپاڵە. گەرماوێکی کۆنیش لە بەر پیسی داخرا بوو. نێزیکەی ٣٢ ماڵە و ئەگەر دەور و بەری لەگەڵ بژمێری چل ماڵێك دەبێ. هەمووشیان بەهاروەندن. سەبارەت بە خانووەکان پرسیارمان کرد: «حەماڵ» واتە کاریتە، «شەمەك» واتە کۆڵەکە، «ئیوون» واتە هەیوان، «دەروازە» واتە دەرگە، «تەنبەر» واتە تەندور و، «چەشمە» واتە ژێرڕێسمە. ماڵەکان «تاپۆیا»یان زۆر بوو، بۆ عەمبارکردنی گەنم. زۆر هۆگری هەنگداری بوون، چ زۆر بوو، کەندوو و «تاقچم. ئەوانەشیان لە هەڵۆڵەدار ساز کردبوو. هاتینەوە بۆ ماڵێ. دەمژمێر ٧ی ئێوارە نانی عەسرمان خوارد، ئەویش هیچی لە شێوخواردنێك کەم نەبوو. جەرگ و دڵ و کەبابی مۆغەرە پشت.

ئەو شەوە ڕەشیدخان شانامەی بۆ خوێندینەوە. ئێمەش گوێگر بوون. چەند کەسێك بە زمانی خۆیان شیعرییان خوێندەوە و پیاوێکیش نەی حەوت بەندی لێدا. گوتیان دڵدۆڕاوە، زۆر بەسۆز بوو. فەرامەرز گوتی ڕەشیدخان ٦٠ یان ٦٥ساڵیەتی و بە تەمایە کچێکی چاردە ساڵە بخوازێ. واقم وڕما، لە ڕەشیدخانم پرسی، گوتی بەڵێ، ڕاستە. گوتم ئەوە منداڵە و شتی وا نابێ. دیسان پێکەنی و وتی، تۆ نازانی، سەرەتا زەحمەتە ئەمجا ڕەحمەتە، دوایە خۆی دەپاڕێتەوە. نازانم چۆن بوو لە پڕ ئەو پیاوەم لەبەر چاو کەوت. ئەم جیاوازییانەش لە هەموو جێیەك لەمپەرە بۆ کاروباری کۆمەڵناسان. باسەکەمان گۆڕی و چووینە سەر باسی کۆمەڵایەتیی تایەفەی بێهداروەندان. ئەمەش دەرفەتێکی باش بوو،

دەور و بەرمان ئاوەدان و ئەوانیش قسەی یەکدیان دەسەلماند. بێهداروەندەکان بەرانبەری دورکی باب یان بابادی بابن. لە خشتەکەدا ناویان هاتووە.

هەڵبەت تیرە و تایەفەی «براماڵی، فۆرگنی، گەندایی، زۆرابی، بلیوەند، لووڕی و شێخ برگە» دواتریش «کیارسی» تێکەڵیان دەبێ. بە هۆی ئەوەی هێشتا منداڵی ئەو تیرەیەمان نەدیوەتەوە، ئەوانمان پێ زیاد نەکردوون. وەك ڕوونکردنەوەیەك، تیرەکانی «کاهکش، هەمۆڵە، پیربوێر، باورساد» هەموویان بە «سێ هونی» واتە سێ ماڵە، بەناوبانگن. ئەوانەش تایبەتن بە چوارلەنگ، چوارپەل، دواتریش چوونەتە پاڵ حەوت یەکەوە. کاهکش و پیربوێر و باورساد تێکەڵ بە بێهداروەند بوون. هەمۆڵەش تێکەڵ بە «بابادی باب» بووە. خان و ئاغاکانی بێهداروەند تەواویان لە منداڵی عەلاوەدینوەند تایبەت بە تیرەی بەختیارەوندن. کات درەنگ بوو، چراتۆەڕەکە بە گیانەڵاوە بوو، جەماعەتەکەش وێژنگیان دەدا. هەموو حەزیان دەکرد بچن بخەون. خەڵکەکە ڕوویان کردە دەر و دەشت و چوون بە لای ماڵ و حاڵی خۆیانەوە بۆ ئەوەی دز دەستی خۆی نەوەشێنێ. ئێمەش خۆمان خزاندە جێوبانی نەرم و گەرمەوە. فەرامەرز زۆر پەرێشانی ماڵ و زیندە ماڵەکەی بوو، نەکا برسییان ببێ. واتە ئەو سێ ئەسپەی ئێمە پێی هاتبووین، خێرا خێرا دەیگوت ئاگاتان لە وڵاخەکانی ئێمە بێ.

## چوارشەمە ٢١ی جۆزەردان

بەیانی دەمژمێر ٥ لە خەویان هەستاندین، بووك دەهات و دەبوو زووخۆیان حازر بکەن. خواردنی بەیانی کەبابی گەرم بوو. ئەسپان زین کران و لغاویان لە دەم کوتان، ئێمەش سوار بووین و بەرەو ئاوایی «مۆرەدل» ئاوزەنگمان لێدا. دوای ماوەیەك هەڵگەڕان بە لێژ و گەوەدا، لە تیرەگەشانی باسکێك ئەسپسوار دەرکەوتن. تووشماڵەکان بەسەر گوێرێژ و هێسترەوە خەریکی ژەنینی دەهۆڵ و زوڕنای خۆیان بوون. سوارانیش سەرقاڵی غارغارێن. دەستەیەکیش ژن بە سواری هێستر دەهاتن و شیعریان دەخوێندەوە. سوارانیش بەسەر تەپکەکانەوە غاریان دەدا و پێشبڕکێیان دەکرد. لەگەڵ سوارەکان گەیشتینە ئاوایی شاعەبولعەزیم. چوار خێوەتی گەورەیان هەڵدابوو، ڕەشماڵێکی شازدە ئەستوونیان هەڵدابوو. هەموویان بە فەڕش پڕ کردبووەوە. هەر ئەوەندە گەیشتین بەرەوپیرمان هاتن و هەوساری یەکسمەکانیان لە دەست

وەرگرتین. دەستە نوێنیان بۆ هێناین، من و دیگار زۆر خۆشەویستین. وەرەق و پەڕی یارییان هێنا و چوارچوار دەستیان پێکرد. لە دەرەوەی چادرەکان یاری دار و لك و سەما کردن و دەسرە هەڵسووڕاندن. دەستەیەك کیژۆڵەی ناسك و نازدار بە زمانی لووڕی و بەختیاری گۆارنیان دەگوت. لەسەر ئیزنی پیاوەکان دەنگەکەمان تۆمارکردن. بوو بە نیوەڕۆ و مجۆعمە و خوان هات. کاری تۆمارکردنیش کۆتایی هات و هاتینەوە نێو چادر و ڕەشماڵان، جێی دانیشتن نەبوو. لە گۆشەیەك جێی خۆمان کردەوە. کەس دەستی نەدەوەستا، لە دەرو ژوور هەموویان چەپڵەیان لێدەدا. ئێمەیان بردە ماڵێك و لەوێ نانمان خوارد. من زووتر خواردنی خۆم تەواو کرد. سەرقاڵی داگیرساندنی جگەرە بووم چەپڵە دەستی پێکرد. لەوانەی پەنای خۆم پرسی ئەو چەپڵەیە بۆچی بوو؟ وتیان، وەختێ سفرە وخوان کۆ کرایەوە لە کاتی ئاوادا چەپڵە لێدەدەن. ئەگەر ڕدێنسپییەك گوتی، پیرۆز بێ ئەو سفرە و خوانە، تازە کەس بۆی نییە پاروویەکی دیکە بنێتە دەمی، کێ تێری نەخواردووە کەیفی خۆیەتی. کەسێك خۆی کردبوو بە کۆستە، بە ڕیش و پەشمەوە، جلوبەرگی دڕاوی کردبووە بەری و بە سواری قالۆرێك. هەر تاوەی بە لایەکدا غاری دەدا و دەکەوت و هەڵدەستاوە، خەڵکەکەش پێی پێدەکەنین. تووشماڵ زووڕنای دەژەنی و تا دەهات کوڕەکە گەرم دەبوو. دوای ئەوەش کڵاوێکی لەسەر بەری دەستی دانا و بەنێو خەڵکەکەدا گەڕا، هەر کەسە و لەبەرخۆیەوە پارەیەکی بۆ تێهاویشت. بەم پیاوەیان دەگوت، «تیلیم جولی» یان «تیلیم کوکی». بەختیاریگەل مەزن و زارۆك قاقا پێدەکەنین و شاد و سەرخۆش بوون. وەختی ئەوە هات بووك لە ماڵ بێتە دەرێ، هەموو لە جێی خۆیان هەستانە سەرپێ. بابی بووکێ هاتە بەردەم خەڵکەکە و داوای کرد بێدەنگی بپارێزن. بە دەنگێکی پیاوانەوە وتی، کور و کاڵان تکاتان لێ دەکەم، هیچ کەس تۆڕی سەری بووك نەڕفێنێ. ئەو شتە بۆ من زۆر سەیر بوو، مامۆستای قوتابخانە لە تەنیشتم دانیشتبوو، تێی گەیاندم ئەمەش لێرە داب و نەریتێکە. جەحێڵی ئەو گوندەی بووکی بۆ دەچێ ڕێگە لەو کارە دەگرن. هەڵبەت ئەو کارە شۆخی و دڵخۆشییە، زۆرجاریش دەبێتە ڕکابەری و شەڕ و دڵمەندی لەنێو تایەفەدا. هەر بۆ ئەوە بوو بابی بووك ڕیشی لەبەر خەڵکەکە دەگرت. بۆ ئەوەی هەموو شت جوان ببینین، خۆمان خستە سەر ماڵی زین، لەسەر تەپۆڵکەیەك ڕاوەستاین هەموو لایەك دیار بوو. گەورە و بچووك چاوەڕێ بوون بووك لە ماڵ بێتە دەرێ. ئەو دەرگەیەی بووك لێی هاتە دەرێ، لەسەر دیوار و سەربان تەپاڵە لە چین درابوو بۆ سووتاندنی زستانێ. بەم هەموو تەپاڵەیەدا دیاربوو

ماڵەکە دارا و دەوڵەمەندن، مەڕ و ماڵاتیان زۆرە و سووتەمەنی زستانیش زۆر و زەوەند. بووکیان هێنادەرێ و سواری ماینێکیان کرد. بوو بە چەپڵە و گۆرانی. بوو بە شاباشی نوقڵ و مێوژ، غارغارێنی سواران دەستی پێکرد. بووك لە ئێمە نێزیك بووەوە و کوڕێژگەیەکیان لە پاشکۆی سوار کرد. لە بەختیارییەکی تەنیشت خۆم پرسی ئەوە بۆ چییە؟ گوتی بۆ ئەوەی یەکەم زگی کوڕ بێت! ئەو بوخچەیە سەرنجی بردم بووك لەسەر پشنێنەکەی بەستبووی. گوتی: کەمەکێك نان و خوێی تێدایە، بەو واتایەی خێر و بەرەکەت لە ماڵی باوانەوە دەباتە ماڵی مێردی. خەڵکەکە لە پێشەوە دەڕۆیشتن، بووك و پێخەسوو لە دواوە بوون. تووشماڵان دەهۆڵیان دەکوتا و سوارەکانیش باسکە و باسك خەریکی غارغارێن بوون. بەزم و ڕەزمێك بوو هەر نەبێتەوە. بە تاو دەهاتن و دەچوون، ژنان دەستە و دۆعا بۆیان دەپاڕانەوە، دەنگی یائەڵا لە هەموو لایەکەوە بەرز دەبووەوە. کوڕە جەحێڵانیش بە بێ مەترسی خەریکی هەو هەو و غاردان بوون. بە بێ ئەوەی ڕەشمە و هەوساریان بە دەستەوە بێت، دەهاتن و دەچون، دەستیان بەردەدایەوە. لەسەر پشتی ئەسپەکانەوە خۆیان شۆڕ دەکردەوە. لاسای کەواندارانی کەونارایان دەکردەوە. هەر کەسە و بە جۆرێك لە کەیف و سەمادا بوو. زۆرم بەزەیی بە زاوادا هات، کەس کاری بە کاری نەبوو. کەس بە هیچی نەدەزانی، قسەی خۆمان بێ گەمژەپیاوێك بوو. لە شائەبولعەزیمەوە هەتا یاوەرئاوا هەر بەم تەدارەك و مەبارەکە هاتین. بووکیان گەیاندە ماڵی زاوا، خەڵکەکەش تەنیا سەیرکردن و چەپڵەلێدانی پێما، بەڵام جارێ دەنگی زوڕنای تووشماڵ هەردەهات و گەنجان خەریکی چاوەڕاوی خۆیان بوون و هەوهەوی سوارانیش هەر وەکو خۆی بوو. سەرم سووڕمابوو ئێستەش زاوا لەسەر چینی دیوارەکان قیت ڕاوەستابوو، ئیتر شەرمم دەکرد درێژەی چیرۆکەکە بپرسم. ئەویش هەر وەك خەڵکەکە سەیری دەکرد. هەر وای نەدەزانی بووك بۆ ئەو دابەزیوە.

وا دیار بوو ئەم بەزم و شاییە بە کەیفی هاوڕێیان نەبوو، ئەسپیان زین کرد و لێی سوار بووین و وەڕێ کەوتین. کێوەکانمان بەجێ هێشت و ئاوایی «چنار دور زونوب» دەرکەوت. لەوەڕمان دا بە یەکسمەکان و حۆشمان چەند شەربەیەکمان دۆ خواردەوە. ئەم گوندەش موڵکی ئێلی فەرامەرز مەحموودیە. کێوەکان بە وشکەبەرد هەڵچندراون، بە داوێنی کێوەکەوە. ئەو شریتانەی پڕمان کردبووەوە بۆمان گرتن. زۆریان پێ خۆش بوو. وەختێ شەو پەردەی دادایەوە، کێوا و کێو مانگەشەو لەگەڵ خۆی بردین. زەبتەکە

دەیگوت و تا بلێی سەفەرەکەی بۆ خۆش کردین. وەختێ گەیشتینە ماڵی فەرامەرز شەکەت و ماندوو بووین. لە بەیانییەوە تا ئێستە حەوت دەمژمێر، ڕێگەمان بڕیبوو. چەرمی لاقمان بە بە دانەوە چووبوو، بڕستمان لێ بڕابوو. لەگەڵ نەجەف خان تەوقەمان کرد و خەو ئامێزی بۆ گرتینەوە، بەلاّم سەرمای زۆر لێی تێکداین.

## پێنجشەمە ٢٢ی جۆزەردان

هەر وەك هەمیشە بەیانی زوو لە خەو هەستاین. بەرقلیانمان خوارد و دەستمان کرد بە یادداشتکردنی کارەکانمان. خێزانی نەجەف خان دارێکی هێنا و دەستوری دا گرێکانی بۆ ساف بکات. ئەو ژنە سەرەڕای ئەوەی چوار پێنج کوڕی گەورە کردبوو هەر وا قەوی و قۆڵ و هیوای ژیانی بە نەفەخانی ٩٥ ساڵە بوو. ئێستەش هەر وەك دەورانی جەحێڵی یەکدیان خۆش دەوێ. تەشوێی بە بڕەند تیژ کرد و بە دڵی خۆی دارەکەی ساف و لووس کرد. زۆریش وەستایانە ئەو کارەی دەکرد. ماوەیەکی باش تێی ڕامام حەزم دەکرد فیلمەکان تەواو نەبن، چەند وێنەیەکم لێ هەڵگرتبایە. تەواوی فیلمەکانم تەواو ببوو. کامێرەکەی من ڕۆلیفلکس بوو. کامێرەی دیگار کانوون بوو. فیلمەکانیان بۆ یەکدی نەدەبوون. فەرامەرز هاتەوە و بە پەلە زەبتەکەی هەڵگرت، بەگوێیدا چپاندم: «بووك» هەر ئەو کەسەیە گۆرانیمان لێ تۆمار کردبوو. بوو بە ئەزیەت بۆ ئێمە. لە چادرەکەدایە، خستیە سەر گۆرانییەکە. دوای ئەوەی شریتەکە تەواو بوو. لەگەڵ نەجەف خان ملمان نا لە قسەکردن. ئەم پیرەمێردە بۆ پوختکردنی هەر قسەیەك وتەیەکی پێ بوو. وەختێ باس هاتە سەر کۆمەڵگە و خاووخێزان، نەجەف خان گوتی: وەختێ ژنێك مێردەکەی بمرێ و منداڵی پاشمەرگە بێت، ژن هەتا یەك ساڵ ناتوانێ مێرد بکاتەوە. لەو ماوەیەدا ئەگەر مام بتوانێ بەخێوی بکات، ئەوە لەلای ئەو دەمێنێتەوە. ئەگەر نەیتوانی دەچێتەوە بۆ ماڵی باوان. دوای ساڵێك ژنە مێرد بکاتەوە منداڵە دەدەنەوە بە مامی یان هەر لەکن بابی دەمێنێتەوە. ئەگەر ژنە مێردی کردەوە، شیربایی دەدرێ بە بابی یان براکەی. وەختێ ئەو ژنە سامانێکی هەبێ لەگەڵ خۆی دەیبات. هەموومان شەکەت و ماندوو بووین. فەرامەرز نوست. دیگاریش لەو لاوە، منیش شەکەت و ماندوو دەبوو پشوویەك بدەم، بەلاّم نەجەف خان خەوی نەدەهات و منیش لەبەر حورمەتی ئەو دانیشتم. نانی نیوەڕۆیان هێنا و نەجەف خان بیسمیللای کرد و دیگار لەخەو هەستا.

نانمان خوارد و نەجەف خان گوتی، ئاغاکان، سەرۆك هۆزەکانیان دەنارد بۆ ئەستاندنی ماڵیات. لە چوار بەش بەشێك بە سەرۆك هۆز دەبڕێت. ئەگەر کەسێك دزی بکات و بیگرن تەواوی ماڵ و سامانی لێ زەوت دەکەن. چوار بەشی بە خان دەبڕێ و بەشێك بە سەرۆك هۆز. خانەکان خاوەنی زیندان و سیاچاڵ بوون. تاوانبارانیان لەوێدا زیندانی دەکرد. قسەکانی نەجەف خان هەرلە سەربردەیەك دەچوو، دیگار بە هێما پێی گوتم، بچین بگەڕێین. منیش حەزم دەکرد و هەستامە سەر پێ. سەردانێکی خێوەتەکانمان کرد. لە یەکێ لەخێوەتەکاندا خەریکی گوریس هۆنینەوە بوون. ڕەنگا و ڕەنگ و جوان. کات کاتی ڕستن و چنین بوو. یەکێ خەریکی شانەکردن و ئەویدی تەشی ڕێسی و ماشەر هەڵوێزنان و هۆرپە بادان. لە بەردەرگەی چەند چادرێك توێکڵی هەناریان دەکوڵاند و خورییان پێ ڕەنگ دەکرد، بۆ قاڵی و توربێن.

خوری شۆراو و ڕەنگکراویان دابوو بەسەر خێوەتەکاندا، بۆ ئەوەی وشك ببنەوە. لە یەکێ لە خێوەتەکاندا ئافرەتێك دار و تەونی دانابوو، خەریکی توربێنچنین بوو. بەشێکی وەك قاڵی دەچنی و هەندێکی لە چەشنی بەڕە. جوانێکیش شیعری فایزی بۆ خوێندینەوە و دەنگێکی حەزینی هەبوو. سووڕێکمان بە دەور و بەردا لێ دا و چووینە سەر کانی، ژنان بە تاس مەشکۆڵەیان پڕ دەکرد. زارکیان دەنووشتاندەوە و بە بەنێك توند دەیان بەست. دەیانخستە بن باڵیان، یان بە گوریس لە کۆڵییان دەبەست و دەیانبردەوە. مانگایەك هات و لە کانییەکە تێرتێر ئاوی خواردەوە. ئافرەتەکانیش خەریکی ئاوپڕکردن بوون. دیگار ویستی وێنە بگرێ، ئیزنم پێ نەدا، کەوتمە هزرەوە. هەتا کەی ئەوە گوزەرانی ئەم خەڵکە بێت، بۆ دەبێ ئەوە حاڵی ئەم وڵاتە بێت، کامەیە ڕێگەچارە، سەبرکردن بەس نییە؟ دیگار لە فەرامەرزی پرسی، چۆن دەبێ وڵاخیش ئاو بخواتەوە و کوندەشی لێ پڕ بکەن؟ فەرامەرز لە بەر خۆیەوە وەڵامی دایەوە، ئەم ئاوە بە بەر دێدا دەڕوات و بۆ شوشتن بە کاری دەهێنن، بۆ چایی لە کانی خوارێ ئاو دەهێنن. لە سووچێك دانیشتبووم و دەستەملانی خەیاڵ بووم. دیگار دەیزانی پەژارەی چیم لە دڵدایە. هات بۆلام، وتی بیری لێ دەکەیەوە، لە چی نیگەرانی؟ وەڵامم نەدایەوە. ئەو هیچ خەتایەکی نەبوو. بۆ کارهاتووە، هەموو کەس دەزانێ کۆمەڵناسیی چۆنە. باڵیۆزخانە هەر ئەوەندەی ئیزن پێ داوە، دەبێ بارودۆخی کۆمەڵایەتی و خەڵکەکە وەخوێنێت. وێنە بگرێ،

سەنەدی هەبێ. لە ڕاستیدا ئێمە بۆ دەبێ شتەکان دیزە بە دەرخۆنە بکەین؟ ئەوە ژیانی ڕاستەقینەی عەشیرەتیی ئێمەیە. بەسیەتی ئەم باسە با درێژەی نەبێت.

چی وای بۆ زەردەپەڕ نەمابوو، ڕان هاتەوە و مەڕدۆشین دەستی پێکرد. هەر وەك شوێنەکانی دیکە مەڕەکان دەهاتنە نێو دیواری تەنگە بەرەوە، لەو سەریشەوە بی بی شەوکەت و ئافرەتێکی دیکە دەیاندۆشین. فەرامەرز نیشانە و داخی گوێچکەی مەڕەکانی نیشان دەداین. لەسەر لمبۆزی چەپ داخی ٩ دیار بوو. گوتی، ئێمە بەو نیشانەیە دەڵێین «داخ» گوتم ئێوە گوێچکەیان ناقرتێنن؟ گوتی: من ئەو کارە ناکەم، گوناحە. جگە لەم شتەش من ماڵاتی خۆم باش دەناسم. ئەوەتانێ یەکسمەکانیشم نیشانەیان پێوە نییە. شەك و بەرانی خۆم لە هەرجێیەك بێت دەیناسمەوە. مەڕدۆشین تەواو بوو. برسیم بوو، نان و ماستێکم خوارد. ڕانەکەش وەك من برسی ڕووی کردە لەوەڕگە. بەر دەرگەی ڕەشماڵیان ئاوپرژێن کرد و گەسکیان دا. ئاوەرگەیان گڕ دا و هەموو لە دەوری کۆزیلکەمان دا. زەردەپەڕ هەستێکی تایبەت بە من دەبەخشێت. خۆم تاق خستەوە و لەو دەر و دۆڵە ڕامام. کەس سریوەی لێوە نەدەهات، لەو پەڕی کێوەکانەوە دەنگی شمشاڵی شوان دەهات. لە شوێنێکی دیکەش سروە دەنگی بە سۆزی کوڕەلاوێکی دەدا بە گوێماندا. پێم خۆش نەبوو نە پرسیارێك بکەم و نە وەڵامی کەسیش بدەمەوە. خۆشییەکەش لەوەدا بوو، کەس کاری بە من نەبوو. سەروبەندی کۆتاییهاتنی کارەکەمان بوو، لە مێشکی خۆمدا خەریکی کۆکردنەوەی ئەوانە بم و لە گێژاوی خەیاڵاتدا دەسووڕامەوە وەختی خەوتن هات.

## هەینی ٢٣ی جۆزەردان

بەیانی زوو لە خەو هەستام. دەبوو ئەمڕۆ بکەوینە ڕێ. نانی بەیانیمان خوارد و دەستمان کرد بە کۆکردنەوەی شتومەك، ماڵئاواییمان لە ماڵەکان خواست. فەرامەرزیش هەتاکو چلگرد لەگەڵمان دەهات. چارەوێ زین کران و چەند جارێك ماڵئاواییمان لە نەجەف خان کرد و بەرەو چلگرد وەڕێ کەوتین. وامان بە باش زانی سەرەتا بچین تونێڵ و داڵانەکان ببینین، ئەوسا بچینە چلگرد. کەژ و کێوێکی زۆرمان بە جێ هێشت، گەیشتینە ڕێگەیەك داڵانەکە لێدرابوو. لە ناوچەی «کانی بێکەسی و» لە خێوەتێك لامان دا، تایەفەی بامدی و لە تیرەی «برام» بوون. پشوویەکمان دا و چاییمان خواردەوە. فەرامەرز ڕای وابوو بچینە کانی کوهڕەنگ. دیگار زۆری ئەم پێشنیازە پێ

خۆش بوو. سوار بووینەوە و وەڕێ کەوتین. لە بواری چۆمی کوهرەنگ پەڕینەوە، نێزیکەی ٥٠ مەتر بەرین بوو، ئاوەکەی زۆر خوڕ و سارد بوو، بە ترسەوە سەیری ئاوەکەم دەکرد، سەرم لە گێژەوە دەهات، چەند جارێك فەرامەرز دەنگی دام بۆ ئەوەی چاو لە ئاوەکە نەبڕم، لە ئاوەکە چووینە ئەو بەر، لە باسکێك هەڵبووین. ئەمجار گەیشتینە کانییە جوانەکەی کوهرەنگ. کانییەك بە دیمەنێکی جوانەوە، سینگی شاخی دڕیبوو بە باڵای ڕەوەزێکەوە، هەر وەك گۆڕی پادشاکانی هەخامەنەشی، بە ئاوێکی زۆرەوە لە چەشنی تاڤگەیەك سەرەوخوار خۆی هەڵدەداشت بۆ باوەشی دەشتەکە. ئاو دەبوو بە تۆز و ئاوێتە لەگەڵ پرشنگی خۆر پەلکەزێڕینەی بە دەر و دەشتەکە بەخشیبوو. بەختیارییەکان دەیانگوت ئەو ئاوە ئەوەندە ساردە هیچ گیانداری لەوێدا ناژی. بۆ گەیشتن بە کانی لە چنار بیرگانەوە هاتین بۆ «کوچیری» ناوچەی منداڵی کەبود، یان «کئو» لەتیرەی مەنجزی» تایەفەی «بێهداروەند». دواتریش گەیشتینە «سێو» ناوچەی بامدییەکان. دەمژمێر و نیوێك بەسەر پشتی ئەسپەکانەوە بووین، تا گەیشتینە کانی کوهرەنگ، تۆرەمەیەك لە تیرەی سیراجەدین، تایەفەی بامدی لەم بەشەدا دەژین. ئاغای غوەلامحوسێن کەریمی لە منداڵی «برام» تیرەی سیراجەدین، شەوێ نەیهێشت بڕۆین. تەنیا هەر خۆی بوو لە چادرێکدا. گیسکێکی سەربڕی و کردی بە کەباب. شەوێ من لە دەرێ نوستم، خزامە دوو کیسەخەوەوە، کەپەنکێکم بە خۆمدا دا، بەڵام سەرمای بەفری کێوەزەرد سەری کەپۆی گەزیم، لە کیسەکە دەرکەوتبووم.

## شەمە ٢٤ی جۆزەردان

بەیانی دوای نانخواردن ئەسپ زین کرا و پێ لە ئاوزەنگدا ڕوومان کردە چلگرد. زۆرتری بامدی بوون. هەڵبەت لە نێزیك کانی کوهرەنگ چەند بنەماڵەیەکی ئەلیوی هەبوون. ڕیش چەرمووی منداڵی ئەلیوی، محەمەد وەلی قەنبەری ڕەشماڵی هەڵدابوو. ڕێگەیەکی زۆرمان بڕی و نێزیك نیوەڕۆ گەیشتینە چلگرد. لەگەڵ فەرامەرز نانی نیوەڕۆمان لەقاوەخانە خوارد. چاومان بە وشترێکی زۆر کەوت. ئەوە بۆ من جێی سەرسووڕمان بوو. ملم نا لە پرسیارکردن. سەرەتا زانیم وشتروانانی ئەردەکانی یەزد بۆ لەوەڕاندن وشتریان هێناوەتە ئەم ناوچەیە. هەموو ساڵێ سێ مانگەی زستان دێنە ئێرە.

وشتری دابەستە دەبەنەوە و دەیدەن بە قەسابی. ساڵیانێکی زۆرە دێنە ئەم ناوچەیە. دەیانگوت، نێزیکەی ٥٠ ساڵ لەوەپێش سەرەتای ساڵ هەزار کەسێك وشتریان دەهێنا ئێرە، لە هەر وشتر دارێك نێزیکەی ٥٠ قڕان دەگەیشت بە بابائەحمەدی و بابادییەکان. ئەوەیان لە نێوان خۆیاندا دابەش دەکرد. دواتر بڕیاریان دا ئەو وشترەی لە ناوچەکە دەلەوەڕێ، هەقی لەوەڕگەکەی بگات بە خاوەنی زەوی و زارەکە. دەستەیەکی دیکە لە وشتروانانی غولام شیرازی بوون. بەسەر یەکەوە ئاژەڵدار و وشتردار بوون. وردە وردە دەبوو وەڕێ بکەوین. ماشێنێکمان دەست کەوت یەکسەر بۆ چلگرد. گوتی، لە٦٠ پایزەوە تا ٦٠ بەهار ناونیشانی من، دلی محەمەد حوسێن خان پاشکۆی پاسگەی قەلازراس دەوروبەری مزگەوتی سلێمان، لە چلگرد، واتە بەشی کوێستانی، هەمیشە لە چنار بیرگان دادەنیشم، ناونیشان، کوهرەنگ، چلگرد دووکانی مەشەدی خواکەرەمی وەرزێڕ. یەکدیمان لە ئامێز کرد و سواری پیکاب بووین بەرە و شاریکورد. پیکاب دەڕۆیشت و دەوەستا، مسافیری سوار دەکرد و دایدەبەزاندن. لەم ڕۆیشتن و ڕاوەستانەدا جوانووە ماینێکم دیت ئاسنێکی چوار چوکلەیان لەسەر لمبۆزی بەستبوو، شۆفێری پیکابەکە بەختیاری بوو گوتی، بەم کەرەستەیە دەڵێن شیربەس. هەر وەختێ جوانوو لە شیر بگرنەوە ئەم ئاسنەی لە قەپۆزی دەبەستن، هەر وەختێ لووتی کرد بە ژێر زگی دایکیدا لە بەری هەڵدێ و ڕێگەی مژینی پێ نادا.

## سەفەری دووەم

## ٣ی جۆزەردانی ١٣٥١ی هەتاوی

دەمژمێر ٩/٣٠ شەو لەگەڵ دیگار گفتمان دا لە بەر دەرگەی گاراژی (لوان توور) بین. بۆ ئەوەی دووەم سەفەرمان بۆ موڵکی بەختیاری دەست پێ بکەین. لەو سەفەرەدا خانمەکەشی لەگەڵ خۆی هێنابوو. ئەو ئافرەتە ئێرانییە و لەو سەفەرەدا دەتوانێ یارمەتیمان بدات. بەتاڵۆکە کەلوپەلمان کۆ کردەوە و لە کۆڵەپشتیمان ئاخنی. جلوبەرگی سەفەرمان کردە بەرمان و خۆمان لە دەسك نا بۆ سەفەرێکی یەك مانگە. لە بەر دەرگەی گاراژ، دیگار تەوقەی لەگەڵ کردم و خێزانەکەی پێ ناساندم. لەگەڵ شاناز ئەحواڵپرسیمان کرد و هەر لەو کاتەدا دکتۆر ڕۆحل ئەمینی گەیشتە بەردەمان. لە حاڵ و ئەحواڵی یەکدیمان پرسی و گلە و بناشت دەستی پێکرد. قەول وابوو دوای گەڕانەوەم گەڵاڵە و پلانم هەبێ بۆ هاوکاریی ناوەندی کۆمەڵناسیی کۆلێژی زانستە گشتییەکان. هەردووکمان باوەڕمان وا بوو مۆزخانەی کۆمەڵناسیی دەبێ تاقیگەی پشکنینی کۆمەڵناسیی ئێران بێت. کەم کەم دەمژمێر ١٠ی نیشان دا، بە دەم خواحافیزییەوە وەڕێ کەوتین. هەر ئەوەندەی «ئوتوبووس» لە تاران دەرچوو، دیگار دەستی کرد بە قسان: لەو سەفەرەدا دەبێ بزانین بۆچی بەختیاری دوو جۆر نیر و ئامووریان هەیە. لە سەفەری پێشوودا ئەوانەمان دیتبوو. یەکیان یەك دەسکی هەبوو کاکی جوتیار دەستی پێدەگرت و ئەوی دیکەیان بە دوو دەست ئاموورەکەیان دەگرت، لە کاتی جووتکردندا. کە ئەوەیان ئامووری گەرمێنیان پێ دەگوت و تایبەت بە دەڤەری خوزستان بوو. وەك دەیانگوت ئەوە زۆر کەونارایە و لە سۆمێرییەکانەوە ماوەتەوە. نەخشەی ئەو نیر و

ئامووورە ئەمڕۆ سیلندێری لەسەر دروست کراوە. بەردەنووسەکان و بەجێماوەی کۆن دەریدەخەن بەختیارییەکان لە خوزستاندا پێشینەیەکی کەونارایان هەیە و زۆر خاوەن ژیار بوون. لەوە دەچێ ژینگەی کۆنی ئەوان لە بەراییدا هەر ئەو خوزستانە بوویێت. گۆیا ڕەوەندی و خێڵەساتی ئەو قەوم و قیلەیە، لە دەورەی سەرهەڵدانی مەغول و وەرگرتنی فەرهەنگی ئەوان بووە. بەختیارییەکان لە یەکەم کۆچی خۆیاندا لە گەرمێنەوە بۆ کوێستان واتە ناوچەی ئەسفەهان، نیر و ئامووری خۆیان نەهێنابوو، ناچاریش بوون خەریکی کشت و کاڵ بن لەدێمە کارەکاندا. دەبوو کەڵك لە نیر و ئامووری ئەسفەهان وەربگرن. یانی ئامووری دوو دەستەی ئەسفەهانی. هەر بۆیە دەبوو ئەو بەشانە بە خەستی لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت. خالێکی گرینگیش کە دەبوو لەو سەفەرەدا گوێی پێ بدرێ، مەسەلەی خاوەن موڵکی لەسەر دێمەکار و لەوەڕگەکان بێت. واتە نیزامی موڵکی زەوی و زار لە عەشیرەتی بەختیاریدا. منیش پێم وابوو زەوی و لەوەڕگەکان تەواوی موڵکی ئەو تایەفەیەن. واتە خاوەنی دیکەی نییە. بۆچوونی من لە سەفەری ڕابردوودا ئەو گومانەی لە لا دروست کردبووم، مالکییەتی تاکە کەسی بۆ ئەو زەوییانە، لە ڕووبەری لەوەڕگەکان کەم دەکاتەوە و هەر کەسەی بە دڵی خۆی مل دەنێ لە کاروباری کشتوکاڵ و تەنانەت ماڵ دروستکردنیش. ئیتر وردە وردە زەوی و زارەکە وێران دەکەن و بناخەی ئاژەڵداری لەنێو عەشیرەتەکەدا داری بەسەر بەردیەوە نامێنێ. هەر بۆیە قانوونی ئابووری بۆ ئاژەڵداری و بەهرەوەرگرتن لە لەوەڕگەکان دەستووری وایە مالکییەتی تاکە کەسی بۆ لەوەڕگەکان نییە، بەڵام بیستبووم زۆر یەك لە سەرۆك هۆز و دەستڕۆیشتوانی عەشایەر زەوی و زاریان هەیە و ناوی وەرزێڕیان لەسەر خۆیان داناوە. یان خەریکی سازکردنی ماڵ و خانووبەرەن. ئەوە بۆ منیش جێی سەرنج بوو ئەو وردە خاوەندارانە لە کوێوە سەریان هەڵداوە. ئاخۆ بە زۆرداریبوونی خۆیان داسەپاندووە، یاخۆ ئەوەی سیستەمێك پشتی ئەو خاوەندارانەی گرتووە و دەسەڵاتی پێ بەخشیون. زۆر کەسیش باوەڕیان وایە لەبەرئەوەی ئێلاتی ئێران لە دەورەی مەغولدا هێزی پشتیوانی لەشکر و سپا بوون. لە دوای هەر شەڕێك، گەورەکانی مەغول دەستپێشخەری سیاسەتی خێڵەساتی خۆیان لە ئێراندا و هاندانی خەڵك بەرەو ژیانی ڕەوەندی و ئاژەڵداری، لە ناوچە جیاوازەکان کەژ و کێوێکی بەرچاویان بەو سەرۆك هۆزانەی عەشیرەتەکان

بەخشیوە. بۆ ئەوەی مالّیات و مولّکانە بۆ خۆیان وەربگرن. ئاژەڵی خۆشیان هەر لەوێ بلەوەڕێنن. ڕەنگە مالیکی تاکە کەسیش هەر لەو هزرەوە سەری هەڵدا بێ، هەڵبەت ئەمانەش هەمووی گومانەوە و دەبێ داتەقێ. بە دەم ئەو قسانەوە لە شاری ئەسفەهان نێزیك بووینەوە.

## ٤ی جۆزەردان

لە ئەسفەهانەوە ڕوو بە شاریکورد وەڕێ کەوتین. لەوێشەوە دەمژمێر ٩ بە سواری پیکاب ڕۆیشتین بۆ چلگرد. ڕێگەکە بە هۆی بەفر و بارانی زستانەوە تا بڵێی ناخۆش بوو، بە یارمەتیی بەختیارییەکان لە دووچۆمان پەڕینەوە، لە نێزیك چلگرد تەگەری ماشێن تەقی و دوای پەنچەرگیری وەڕێ کەوتینەوە. بە تەمابووین جەعفەرقوولی بەرەو پیرمان بێت، ئەویش ببوو بە چاوساخی سێ وێنەهەڵگری بیانی. لە ماڵی سەرۆکی پاسگە میوان بووین و لەوێ چاومان کەوت بە بەڕێزان فەرامەرزی و ئەنوەری. دیدارمان تازە کردەوە و باسی ڕابردوومان هێنایەوە گۆڕێ. چایچی فارسانی خزمەتێکی باشی کردین. ناوی ئێمەی لە بیر مابوو. ماستاوێکی باشی پێ داین، ئەوە ئەوپەڕی میوانداریکردن بوو. سەردانێکی بازاڕمان کرد، دیگار چەقۆیەکی ١٨٠٠ قڕانیی کڕی، دووکاندارەکە وتی بۆ خۆشم هەر ئەوەندەم پێ داوە. چاومان بە جەعفەرقوولی کەوت، تازە گەڕابووەوە، ناچاربوو لەگەڵ ئەو چەند کەسە بچێ بۆ شاریکورد، لەوێشەوە بچێتە ئەسفەهان، جارێ ژن و منداڵەکانی لەوێ بوون. لەگەڵ بەڕێز پەرویزی سەری قسەمان دامەزراند، بە نیاز بوو مێژووی دووسەد ساڵەی بەختیاری بنووسێتەوە، ماوەیەکی باشیش کاری لەسەر کردووە. چەند پەڕێکی بۆ خوێندینەوە ئێمەش فرە هانمان دا بۆ ئەوەی دەستی لەو کارە شل نەبێتەوە! قەرارمان دانا، بە هاوکاریی ئەو لەگەڵ شارەزایان سنوور و کەوشەنی ئێلی بەختیاری لەسەر نەخشە وەدۆزین. شەوێ لەسەر ویستی سەرۆکی پاسگە میوانی ئەو بووین. لە ورد و درشت چ نەما باسی نەکەین. فەرشێك دەستکردی شاریکورد بە نەخش و نیگاری «خشتی» لە ژوورەکە ڕاخرابوو. باسەکەمان هێنایە سەر تێکەڵی خاوخێزانی و ئاخۆم بەختیارییەکان هەر لەسەر پشتی لانکەوە کوڕ و کچیان لە یەکدی مارە دەکەن و ئەو دوو کەسە وەختێ گەورە بوون بە یەکەوە

زەماوەند دەکەن. ئەگەر هات و ئەوانە لە قسەی گەورەکانیان دەرچوون، دوژمنایەتی و شەڕ و نێوان ناخۆشی بە کویێ دەگات و کەیخودا و ڕیشسپی چۆن مەسەلەکە حەل دەکەن. ئەو خەرج و باجەی دراوە چی بەسەر دێت، بەڵام ڕق و کینە هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە. بۆ دیاریکردنیش هەر وایە، وەختێ تایەفەیەك ئەنگوستیلە بکاتە دەستی کچێك، ماڵی بابی کچە پێیان شەرمە ئەنگوستیلەکە بنێرنەوە. هەر لایەك ئەو خزمایەتییە تێك بداتەوە شەڕ و ناخۆشی لێ ساز دەبێ و ئاڵۆزی دەکەوێتە نێو تایەفەوە. با ئەمەشمان لە بیر نەچێ، شیربایی لەنێو ئێلی بەختیاریدا زۆری هەمیەت پێ دەدرێ. ئەو پارەیە نەغد لە ماڵی بابی زاوا دەستێنن. سەرەتا پووڵەکە دەدرێ بە بابی بووکێ، ئەگەر بابی نەبێ براکەی وەری دەگرێت. ئەگەر هات و براشی نەبوو بە مامی کچە دەگا، خۆ ئەگەر مامی نەبوو چەند کەس ڕیشچەرمگ ئەم ئەرکە دەگرنە ئەستۆ و دەیدەن بە دایکی کچەکە. سەیرە! ناوی شیربابییە، واتە ئەو شیرەی دایکی داویەتی بە بووکەخان، بەڵام لە پاش ئەو هەموو دەستاودەستە دەیدەن بە دایکی!

ئەمڕۆ بە چاوخشاندنێك دیتمان دەوروبەری چلگرد چۆڵە و وزەی باڵی مێش نایات. دەر و دەشت سەوز و بژوێنە و گیا و گوڵ سەری پێوە ناوە. سەحرا چاوەڕێی ڕان و مێگەلە، بەڵام جارێ ڕەوەندان نێزیك نەبوونەتەوە. ئەو کەسانەی بە دەوروبەرمانەوە بوون پێیان وتین، ماوەی دە ڕۆژێکە یەکەم خێڵاتی گەیشتوونەتە زۆزان، ئێلاتی ئەم ساڵ وە درەنگی کەوتوون.

لەو ماوەیەدا من و دیگار چلگردمان بەجێ هێشتوو و ئێستەش گەڕاوینەتەوە، چۆن بووە هەر وەك خۆیەتی. مەهدی خانی فەرامەرزی، سەرۆکی خانەی ئەسناف ئەمڕۆ دەیگوت، ئەو ماڵانەی لە زستاندا لە ٤٢ ماڵەوە بوونەتە ٥٢ ماڵ. زستانێکی ناخۆشیان بەڕێ کردووە و تەواویان هاواریانە. زمهەرِی خۆیان لێکردووە و تفاقی ئاژڵیان لێ بڕاوە. تەنیا ئامرازێك کە توانیویانە هاتوچۆی شاری پێ بکەن ئەو «دەرگەنە بووە، خێشکی سەر بەفر. ئەمەش لە شاخی بزنەکێوی ساز دەکەن. هەڵبەت ئێسکییان هەبوو، لە ئێسکیبازیدا زۆریش شارەزان.

وردە وردە شێویان بۆ هێنایین، کەباب و جەرگ و دڵی مەڕ، ئەو بەختیارییانەی لەوێ بوون بە دابی خۆیان لەگەڵ ئێمە نانیان خوارد و دوای شێوخواردن ماڵئاواییان کرد و دوای

ئەوانیش وەختی نوستنی ئێمە هات. نازانم چۆن بوو بەر لە خەوتن ئەو قسەیەی پەرویزیم وەبیر هاتەوە کە بڕوای وا بوو بەختیارییەکان هەر گاسییەکانن (گووتییەکان). گوندی باسم وەبیر هاتەوە، «گوتوەند»لە گەرمێنی بەختیارییەکان ئەویشم لەسەر نەخشە بینیبوو. بە هیوام سەردانێکی گەرمەسێر بکەم و بنج و بناوانی پرسەکە ڕوون بکەمەوە.

## ٥ی جۆزەردان

بە قووقەی کەڵەباب وەئاگا هاتم، وامزانی زۆر درەنگە، وەختێ سەیری دەمژمێرم کرد شەشی بەیانی بوو. وا دیارە کەڵەبابیش لێی تێك چووە. دیگاریش چاوی کردەوە. نانی بەیانیمان خوارد و دەرکەوتین، شاناز زۆری پێ خۆش بوو تونێڵی کوهڕەنگ ببینێ. بەردەنووسمان خوێندەوە: دەستپێکردن ڕێکەوتی« ١٣٢٧» و لە «١٣٤٤» تەواو بووە. ئەو کارەش بە مەبەستی ڕاکێشانی ئاوی کوهڕەنگە بۆ زایندەڕوود لەسەر دەستووری بنکەی بەشی ئاویاری.

گەڕاینەوە بۆ چلگرد و لە دووکانێك بەڕێز پەرویزمان دیت. سەبارەت بە کاروبارمان پرسیاری کرد و ئێمەش ئەوەی لازم بوو پێمان گوت. دیگاریش وتارەکەی خۆی نیشان دا. لە بەر ئەوەی بۆ نانی نیوەڕۆ لە ڕەشماڵێك میوان بووین بە پێیان وەڕێ کەوتین. لەنێو ڕێدا هێسترێکمان بۆ شاناز گرت و دوای ڕێپێوانێکی زۆر گەیشتینە ماڵی ئەمیر قوولی حەمە حوسێنی ڕووبەڕووی دۆڵی کوهڕەنگ. لە لای سەرووی ڕەشماڵەکە پەتوویان ڕاخستبوو، جگەرەی زەڕ و شەمچەش لەوێ داندرابوو. سەلامان کرد و سەرمان دانەواند و چووینە ژووری. غەریب و میوان بووین و وەلای سەرێیان خستین. پاڵمان وە پشتییەکانەوە دا و ئەحواڵپرسی دەستی پێکرد. بزنێکیان لە بەرپێ سەر بڕین و ئەمەش نەریتی خۆیان بوو بۆ بەخێرهێنانی میوان. مەبەستیان ئەوە بوو میوان بزانێ بزنەکە نەخۆش نییە و ساخە. سەرەتا جەرگی بزنەیان لەسەر ئاورەکە برژاند، دواتر گەدەکەیان ورد کرد و کردیانە گیپە. هەرەسا جەرگی لەسەر ئاورەکە بە شیشە برژاندیان. ئەمەش تێکەڵ بە چەوریەکی تایبەت دەبێ و بەختیارییەکان زۆریان حەز لەو خواردنەیە. خۆلاسە کەبابێکی خانانەیە. ئەم خۆراکەش پێش خواردن بوو، دواتر خواردنی ڕاستی هات. ئەو جەرگبرژاندنەش لە ئەستۆی پیاوانە و کابانی ماڵ نان و چێشتی ئەسڵی چێ

دەكەن. ئەوانیش مەنجەڵە گۆشت و برنجیان وەسەر ئاگر نابوو. دۆی تێكەڵ بە بەفراویش ئامادە بوو. هەر بە دابی خۆیان هەر كەسێك ڕێی كەوتە ئەوێ، هات و دانیشت و تێری خوارد. هەر وەختێ كابرای بەختیاری میوانێك ڕوو بكاتە ماڵەكەی دەبێ خواردنی پازدە كەس لێ بنێت. لە كاتی ئاساییدا دەبێ نان و ماست و دۆ و پیازی ئامادە بێت. خۆ ئەگەر كەسێك لە ڕێوە بێت ناسیاو بێت یاخۆ غەوارە، سەرەتا چایی بۆ دادەنێن، دواتر لێی دەپرسن نانی خواردووە، ئەویش بە بێ ئەوەی شەرم بكات، ئەگەر برسی بێت داوای خواردن دەكات، ئەم نەریتەش لەنێو عەشیرەدا جوانە و لەنێو ڕەوەندان بێگانە واتایەكی نییە و هەر ڕەشماڵێك بچی ماڵی خۆتە. وا دیارە چارەیەكی دیكەش نییە. لە دەڤەرێكی ئاوادا میوانخانە دەست ناكەوێت؟ لە گوندەكاتنیش شتی وا نییە. تێرمان خوارد و قسە و باس هاتە گۆڕێ. ماوەیەك باسی ژن و ژنخوازیمان كرد، وتیان بۆ پەسندكردنی كچ بە هیچ شێوەیەك جوانی گرینگ نییە و تەنیا لە بنەچەكەی دەپرسن. دیارە تیرە و تایەفەش هەمیەتی زۆری پێ دەدرێت. پیرەمێردێك دەیگوت خان و ئاغاكان جێی خۆیان دیار بوو. تووشماڵەكانیش ژنیان لە كەسانێك دەخواست هاولفی ئەوان بوایەن. ناوی تووشماڵی هێنا و هەڵبەزیمەوە، لەبەرئەوەی ئەوان ئەم وشەیان بۆ گۆرانیبێژ و نایەژەنان بەكار دێنن، پرسیارم لێ كرد و پێكەنی و لە وەڵامدا گوتی، نێزیكەی چل ساڵ لەوە پێش بەو كەسانەیان دەگوت تووشماڵ كە پلەیان لە خوار خان و كوێخاكانەوە بوایە. ئەمجار تووشماڵ ئەوەندە زۆر بوون، بوون بە گاڵتەجاڕی خەڵك، بە زوڕناژەن و دەهۆڵچی ناویان دەبردن. ئەم وشەیە لەسەر ئەوان گیرسایەوە، وتم كەلانتەر چییە؟ گوتی: ئەمە بیست ساڵێك دەبێ وەشەی كەلانتەر لەنێو عەشیرەتدا داكەوتووە. پێشتر تەنیا خان و كوێخا هەبوو. قسە و باسەكەمان هێنایە سەر مالیكییەت و لەوەڕگە. دەیانگوت لەوەڕگە بەشی ئێلاتییە. هەر تایەفە و تیرە و بەرەبابێك بەشی خۆی دیاری كردووە و ڕێگەپێدانی لەوەڕگەی وەرگرتووە. دەیانگوت مالیكی تاكە كەسی هەقی بەسەر لەوەڕگەوە نییە. «وا دیار بوو ئەم قسەیەی بە هۆی سیاییگرتنی مەسەلەی بەگشتیكردنی لەوەڕگەوە بوو. هەڵبەت لەنێو قسەكانیدا بۆم دەركەوت، دواتر ڕوون دەبێتەوە». دەیانگوت. وەختێ خاوەنداریچتی تاكە كەسی بوونی هەیە لە باب و باپیرانەوە لەسەر زەوییەكە كاری كردبێ و جووتبەندە بێت. قەباڵەی بە دەستەوە بێ و بە میرات پێی گەیشتووە.

دەیانگوت، کەس ناتوانیّ لەوەڕگەکان بکێڵێ و دایچێنیّ. خاوەنداریّتی لەسەر کێڵگەکان هەر لە دەورانی خانە دەسەڵاتدارەکانی ئێلەوە بەردەوام بووە و خانەکان دەسەڵاتیان بەسەر تەواوی زەوییەکاندا هەبووە. دواتر بەشێك لەو زەویانەیان بە خەتی خۆیان بە کەسانێك بەخشیوە. ئێستەش لەسەر ئەو زەویانەیە خاوەنەکانیان دەتوانن ماڵ ساز بکەن، ئەگەر کەسێك بیهەویّ ماڵێك دروست بکات، بەڵام پارچە زەوییەکی نەبیّ، دەچێتە لای یەکیّ لە خانەکان و بەڵێنی دەداتیّ هەمیشە لەژێر ئەمر و فەرمانی ئەودا بێت بەو مەرجەی زەوی بداتیّ. لەبەرئەوەی تازە خێڵەسات لە ڕێگەوە دەهاتن، لە پاش ئەوەی دادەمەزران میوانداریيان دەکرد و دەچوون بۆ میوانی و سەردانی خزم و کەسیان. بە بۆنەی بەخێرهێنانەوەی یەکدی ڕەشماڵەکان قەرەباڵغ بوون.

ماڵئاواییمان خواست و کەوتینە ڕێ بەرەو چلگرد. تا بڵێی ڕێگە ناخۆش بوو. زۆریش لە ماشێن ئاژووتنەکەی سەرکار ئوستوار تەهماسبی دەترساین، تاکو گەیشتینە چلگرد. لەویّ سەرکار ئوستوارمان بەڕیّ کرد، لەگەڵ سەلام و ئەحواڵپرسی لەلای بەڕێز پەرویزی دانیشتین، هەوڵمان دا سەبارەت بە عەشیرەت و مێژووەکەی شتێك بزانین و لە زانیاریی ئەو پیاوە عەشیرەتییە کە زۆریش شارەزایی هەبوو بەهرە وەربگرین. خوێندەواریی باشی هەبوو، لە سەرەتاوە تاریخی پەیدابوونی هۆزەکانی دەزانی لە دەورەی مەغوولەوە، خانەکانی بەختیارەوەندیش هەر وا. لەسەر مێژووی و لووڕستانی ساکی باسی بۆ کردین و لەبەرئەوەی زانیمان بەڵگە و سەرچاوەی باشی لەبەر دەستایە قسەکانمان کورت کردەوە و نەخشەمان دانا و دابەزین، سەرەتا کەوشەنی بەختیاریمان بە یارمەتی پەرویزی و ئەو بەختیارییانەی لەگەڵمان بوون دیاری بکەین. بۆ هەر حەد و مەرزێکی گوڕەیەك ساز دەبوو. لەگەڵ ئێمە و خۆیان هەموو جاریّ تێك دەگیران و تاکو ئەوەی وای لێهات هەموو پێکهاتن، ئێمەش خەتێکمان بە سەردا هێنا. سنوورەکە تا ڕادەیەك دیاری کرا، دەبیّ دواتر کاری زۆرتری لەسەر بکەین. باکوری ئەو لە «ئەزنا» وە دەست پێدەکات و ڕووباری «دێز» بەشی ڕۆژئاوای دەگرێتەوە و تا نێزیکەی دێزفول و ئاوی سەدەکە. ئەمجار بە قەراغ ڕۆژئاوای گوندی «کوهەنگ» دا تێدەپەڕیّ و بەشی ڕۆژهەڵاتی دزفول دەگرێتەوە. لەوێشەوە ڕوو دەکاتە باشوور و بە کەوشەنی ڕۆژئاوای شارەکانی مەسجدسلێمان و حەوت گوڵدا تێدەپەڕیّ. بە باشووری حەوت گوڵەوە ڕوو بە ڕۆژهەڵات ڕێگە دەبڕێت. لە سەرچاوەی ڕووباری «خەرسان» ەوە باکور دەگرێتەوە و بە شانی

«فاران»دا دەردەچێ و لە «سپی دەشت»ەوە دەچێتە بەشی خۆرنشین و لە بەشی باشووری شاریکوردەوە کەوشەنی خۆرئاوای «مۆرغ مەلەك» دەگرێتەوە و لەوێشەوە ڕوو دەکاتە باکوری ڕۆژهەڵات و بە سنووری باشووری «داران»دا ڕەت دەبێ و یەك ڕاست دەچێتەوە سەر «ئەزنا». ئەم کارەمان لەسەر نەخشەی ئەمەریکاییەکان پەیدا کرد، کە لە ساڵی ۱۹۵۳دا ئامادە کرابوو، لەسەر مەقیاسی یەك بۆ پێنجسەد هەزار. درێژترین مەودای ئەو لە باکوری خۆرئاوا بۆ باشووری خۆرهەڵات ۲٦٥ کیلۆ مەترە و درێژترین مەودای لە باکوری ڕۆژهەڵاتەوە بۆ باشووری ڕۆژئاوا ۱٤۰ کیلۆ مەترە و پانتای ئەو قەڵەمڕەوە نێزیکەی ۳۷۰۰۰ کیلۆمەتری چوار گۆشەیە. دیسان باسی خاوەنداریێتی هاتەوە گۆڕێ، بۆمان ڕوون بووەوە ئەگەر کەسێك لە دەڤەری چلگرد هەرچەندێکی بەراو هەبێ، ئەوندەشی دێمەکار هەبێت، بەو مەرجەی لەوەڕگە نەبێ. لە دوای مردنیش ئەو موڵکە لە نێوان کوڕەکانیدا وەك یەك دابەش دەکرێت. ئەگەر کۆچ کردوو هەر کچی هەبێ، براکانی ئەومالّ و سامانە دەپچڕن. لەم نێوەدا شتێکیش بەر کچە دەکەوێ. وردە وردە شەکەتی دوو لینگانەی خستە سەر شانمان. نەخشە لەبەر دەستماندا دەبوو، پرسیم ئەو چوار لەنگانە کێن و لەکوێ گەرمێن و کوێستان دەکەن؟ گوتی: چوار لەنگ مەحموود ساڵح زۆزانیان لە «فەریدون» و گەرمێنیان لە «سەردەشت»ـە، چوار لەنگ، کیان ئێرسی یان کیومەرسی هاوینەهەواریان نییە و لە یەك شوێن نیشتەجێن و بەردەوام لە «جانکی» گەرمەسێر دەمێننەوە. موگۆئییەکانیش گەرمێنیان نییە و لە کۆنە زۆزانێ دەبن، واتە «بەربرود» لە دەوروبەری «ئەلیگودەرز» و «ئەزنا». میمیوەندەکاتنیش زۆزانیان لە «ئەزنا» و ئارانیان لە «لیوە»یە. شاناز زۆر شەکەت و ماندوو بوو، چووینە ماڵی سەرکار ئوستوار، شەو لەوێ خەوتین.

### ٦ی جۆزەردان

بەیانی بەڕێز مەهدی فەرامەرزی هاتە شوێنمان. دوای خواردنی نانی بەیانی چووین بۆ قاوەخانە و لەوێ قەول وا بوو، فەرامەرزی بۆ حەسانەوەی ڕۆژانە ژووریێکمان بداتێ، ژوورەکەی نیشان داین. گۆشت و زەعفەرانی کڕی و هەر چوارمان «من و دیگار و شاناز و فەرامەرزی» بەرەو ڕەشماڵەکەی ئەو هەنگاومان نا. خێوەتەکەی بە قەدپاڵی چیاکەوە ڕوو لە ڕۆژهەڵات و بەسەر چلگرددا دەیڕوانی. گەیشتین، ڕەشماڵێکی پاك و خاوێن و دیمەنی دەوروبەری دڵی بینەری دەڕفاند. مەهدی خان دوو ژنی هەیە و بە یەکەوە دەژین. سڵاومان لێ کردن و ئەوان چوون بە لای کاری خۆیانەوە. فەرامەرزی دەرگەی شۆخی و جەفەنگی کردەوە و لە تاریفاتی ئازایەتیی خۆی ڕۆچوو. دواتر باسی خێڵاتی بۆ کردین ئەو باسەی خوارەوەش زۆر گرینگ بوو.

لەنێو ڕێدا ڕەوەندان تەنیا دەتوانن لە هەر پشوودانێکدا ٢٤ دەمژمێر وەحەسێن، ئەگەر هات و گرفتێك هاتە پێشێ وەکو تووشهاتنی دز و جەردە، دەتوانن ٤٨ دەمژمێر بوەستن. ئەگەر نەخۆشیان هەبێ هەفتەیەك لە یەك شوێن ڕاوەستن، لەو ماوەیەشدا ڕانەکە لە دەوروبەری خۆیان دەلەوەڕێنن. باسی مەودای ڕێگەی بۆ کردین، ئێلاتی لە زەردە چیاوە دەچنە «چێڕی» لە بەشی باشووری خۆرهەڵاتی زەردە چیا، ڕێگەی «زەردە»، ڕێگەی ئێلوك»، ڕێگەی «پەمووە کاڵ»، ڕێگەی «گەلەگا»، ئەوانە لە یەك کاروانەڕێدان و لە «چێڕی» تا دەگاتە گەلەگا، ڕەنگە ٨ فەرسەخ بێت، ئەم ڕێگەیە زۆریش خۆشە. «چێڕی» ڕێگەی هەموو هۆزەکانە و تەنیا ئێلی بابادین کە بە «پەمووە کاڵ» و «زەردە» و «گەلەگا»دا تێ دەپەڕن. هەڵبەت دەبێ دواتر ئەوانە ببنین و بپرسین و باسی لەسەر بکەین، ڕێگەی هەر یەك لە تایەفەکان دەستنیشان بکرێت. بەو هیوایە.

لە دەمژمێرم ورد دەبمەوە، چارەکێکی ماوە بۆ ٩ی بەیانی. باران و تاوە، تەرزە بە غوڕەم دەبارێ و زرم و کوتی لەسەر ڕەشماڵەکە زۆر دڵنشینە. چەند کەسێك لە بەختیارییەکان لە دەم دەرگەی خێوەتان تەور بە دەست خەریکی موورموورکردنی دار و سووتەمەنین. کەسێکیش لەو لاوە قوڵەنگ بە دەست سەرقاڵی دارقەڵەشاندنە، خانمەکانی فەرامەرزیش چێشتیان وە سەر کوانوو ناوە، شوانەکەشیان کەپەنکی داوە بە شانیدا و

خەریکی ڕاگوێزانی داری قەڵەشکارییە. دوومانگای بەڵەك لەوێ بوون، شوانە چکۆلە بردنی بۆ لەوەڕاندن. باعەی بەرخ و کار دەستی پێکرد و وتیان خەریکی مەڕدۆشینن. دەرفەتێکی باش بوو بۆ پیاسەکردن و سەردانێکی بەرغەلەکە، تەماشامان کرد، شیری بزن و مەڕیان لەیەك سەتڵدا دەدۆشی، ژنێك وتی، شیری مانگاشی تێکەڵ دەکەین. لەگەڵ دیگار لە تایبەتمەندیی مەڕەکانی بەختیاری ورد بووینەوە، دووگیان درێژ و دوو بەشە، لاقیان تووکنە، درێژ و باریکن. ئەو جۆرە حەیوانە لەگەڵ کوێستانی بەختیاری سازگارن. بە هۆی ئەوەی دووگیان لە دووبەش پێك هاتووە ماندوو نابن. منیش زۆر لە مێژ بوو بە تەما بووم لەمەڕ ناونیشانی خزمایەتییەوە شارەزاییەك بەدەست بێنم. دەرفەتی باشم بۆ ڕەخسا بوو، چەند کەسێکی باش بەدەوروبەرمانەوە بوون. هەموویان حەزیان دەکرد زانیاریمان بدەنێ. ئەمەش ڕوونکردنەوەکە:

**باپیرە ـ جەد. باوەگەورە ـ باوە. باب ـ بو. خوشك ـ دێدو. ژن= زینە. خاڵۆ= هالو. مام= تاتە. کوڕی خوشکی باب= خورزێمار. ئامۆزا= کێرتاتە. بابی مێرد= خوسی. دایکی مێرد= خوسی نرە. خوشکی مێرد= ددومیرە. برای مێرد= براشر. هێوەرژن= براشر. برازا= کرگئو. نەوەی کچ = کردود. نەنك = دولو. دایك = دا. برا = گێ ئو. مێرد = مێر. خوشکی باب = خالو. خوشکی دایك = بوتی. کوڕە پوور= کوڕ بوتی. کوڕە خاڵ = کوڕە هالو. بابی مێرد = بوزینە. دایکی ژن = خوسی مرك. خوشکی ژن= ددورینە. برای ژن = کئوزینە. ئاوەڵ زاوا = هوم ڕیش. خوشکەزا = کوڕودو. خوشکەزا = دوددێدو. نەوەی کوڕ = کوڕی کوڕ. پورزا = خورزومار.**

من خێرا خێرا دەمنووسی و هزرم لە لای دیگار نەبوو. دوای ئەوەی تەواو بووم، دیگار فێری کردم کە ئەو وتارانە بە شێوەی تابلۆ بنووسم. واتە پیاو ئاوا بێ و ژن بەم بازنەیە دیاری بکە. تەمەن و زەماوەند بەم {} نیشانەیە دیاری بکە. هەر کام لەو نیشانانە ڕەش بکەیەوە ئەو کەسە «ئیگۆ» یان «من» دێتە ئەژمار. باوەڕی خزمان سەبارەت بەو باش دەبێ و ئەو نیشانانە لەپاڵ یەکدا دەنووسی.

ئەمەش مەبەستەکە دەردەخا، دواتر دەبێ کاری لەسەر بکرێت. ئەوەش هەر ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمە دەمانویست. نەدەبوو بپرسین بە کوڕەمام دەڵێن چی. ئەوان لە وەڵامدا وتیان، «کوڕتاتە» لەوانەیە ئەوان بڵێن «تاتەزا» ئەمەش وشەیەکی دیکەیە.

لە پاش فراوین سەر خەوێکمان شکاند و دواتر شۆڕ بووینەوە بۆ ماڵی سەرکار ئوستوار، پیاوێکی بەختیاری هاتبوو بە شوێنیدا ئوستواریش چاوەڕێی جێگری ناوچەکە بوو، دەیگوت باشە دێم، بەڵام ڕۆژێکی دیکە. زۆریشی شێر و ڕێوی بۆ هێنایەوە، کابرای بەختیاری نیو دەمژمێر گوێی بۆ شل کرد، بەڵام دواتر گوتی، من ئەو قسانە بە گوێمدا ناچێ، هەتا تۆ لەگەڵم نەیەی لێرە نابزووم، دوو سەد تمەنم خەرج کردووە هاتووم بە شوێنتدا، ئەگەر لەگەڵم نەیەی دوو سەد تمەنەت لێ دەستێنمەوە. دەمەتەقە هەر بەردەوام بوو، ڕەیس پاسگە کابرای تاینی لەگەڵ خۆی برد و بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکە چوونە پەسگا. ئێمەش ڕاکشاین.

ڕەوەیەك هەور چڕ بوونەوە و بوو بە شریخ و هۆڕی هەوران، چەخماخە و برووسکەیەك دار و بەردی لەراندەوە، وامزانی بەسەر سەری ئێمەدا تێپەڕی. تاوە تەرزەیەك کوتوپڕ هات و تەواو بوو. هاتینە دەرێ و چووینە چایخانەکە. لەوێ چاوەڕێی مەهدی فەرامەرزی بووین بێت و ژوورەکەمان بداتێ، ئەویش هات. کلیلمان لێ وەرگرت و بە دەم شۆخی و جەفەنگەوە کەلوپەلمان گواستەوە بۆ ماڵی تازە. بەڕێز پەرویزیمان دیت، قەول وا بوو بەیانی بچین لە ماڵی ئەوان خەریکی ڕاستە و پاستەی نەخشەکە بین. لە چایخانەکە شێومان خوارد، دوای نانخواردن سەرکار ئوستوار کەسێکی بە شوێنماندا ناردبوو جەناب سەروان، جێگری ناوچە لە ماڵی ئەوان میوانە و ئێمەش بچین لەگەڵ ئەوان شێو بکەین. بە بێ هیچ قسەیەك قبووڵمان کرد. جەناب سەروان هەوڵی بوو وا نیشان بدات ئاگەداری هەموو شتێکە، زۆری پێ خۆش بوو زمانی فەرەنسایی فێر ببێت. ماڵئاواییمان خواست و هاتینەوە بۆ ماڵێ، سەگێك شالاوی بۆ دێگار برد و زۆریش پێکەنین. بە کەیفی خۆمان یادداشتەکانمان ڕاستە و پاستە کرد و دەمژمێر ١٢ خەوتین. لێفە و دۆشەکی زیادیمان پێ نەبوو، لە کیسەخەوێکی تەنکدا ئەو شەوە سەرمام بوو.

## ٧ی جۆزەردان

دەمژمێر ٦ی بەیانی بە تەقەی دەرگە خەبەرمان بووەوە. کچەکەی بەڕێز ئەسکەندەری بوو، «بەر پرسی ئاویاری و تونێلّی کوهرەنگ» بۆ نانخواردنی بەیانی هات بوو بە دووماندا. ئەوانیشم لە خەو هەستاند و وەدووی کەوتین، بەڕێز ئەسکەندەری ٧ منداڵی هەیە، ئەگەر ئەو سێیەی دیکەی مابان، ئێستە بابی دە منداڵ بوو. زۆر جوان ماوە و تا بڵێی قسەخۆشە، دەیگوت: ساڵێك بە دەوا و دەرمان بەرگریمان کردووە، بەڵام ساڵی دوایە خێزانم دوانەیەکی بوو. وێنەیەکی زۆری نیشان داین، باسی ئیسکی و خێشکی سەر بەفری خەڵکی چلگردی بۆ کردین. دەیگوت، گەورە و بچووکیان خێشکچی باشن. بە شەرمەوە گوتی، خۆی فێریان دەکات و لە تاران دەورەی بینیوە. پێڵاوی خلیسکێنی هێنا و نیشانی داین. لەو ناوچەیە پێی دەڵێن، «دڕگ». ئەگەر بتەوێ ببی بە خاوەنی جووتێك پێڵاوی خلیسکێن، دەبێ دوو نێرییە کێوی شاخدار بکووژی کە شاخەکانیان بۆ خلیسکێن بەکار بێن، لەباری درێژی دانەیەك لە شاخەکان بە مشار دەکەن بە دووان، ئەو شاخەی دیکەش هەر بەو چەشنە لە شێوەی بازنەیی دوو خێشکی سەر بەفری لێ ساز دەبێ، جێی لاقی بۆ دروست دەکەن، بۆ قایمکردنیشی کەڵك لە تەختە و بزمار وەردەگرن. دوو بزماریش لەژێر قاچیاندایە، ئەگەر هات و شوێنێك سەهۆڵ بوو، پێی دەنێن بەسەر ئەم بزمارەدا بۆ ئەوەی خێشك لە حاستی خۆی بچەقێ.

کەسێك ئەم جووتە خێشکەی لە پێدا بێ، دەتوانێ چەند کەس بە شوێن خۆیدا بێنێ، ئەوانەی لە دواوە دێن، پێ دەنێنە جێ پێی خێشکی سەر بەفر، لەبەرئەوەی ئەو شوێنە پتەو بووە ناچەقن. ژنەکەی ئەسکەندەر خەریکی شیردۆشین بوو، ئەنگوستیلەکەی ئەو ژنە سەرنجی ڕاکێشام، پرسیارم کرد؟ ئەسکەندەر گوتی، ئەو ئەنگوستیلەیە لە نووکی شاخی «پازەن» دروست کراوە، ئێمەش باوەڕمان وایە ئەو کەسەی خەریکی شیر دۆشینە، بەتایبەت مانگادۆشین، شیرەکە بەرەکەتی تێ دەکەوێ. دایکی ئەسکەندەر لەسەر چەنە و ئەبرۆکانی خاڵی کوتابوو. زۆر ساکار، برۆکانی خەتێك و چەناگەی خەتێك هەر یەکە و دوو خاڵ لە بانی. گوتم بۆچی خاڵت کوتاوە؟ پێکەنی وەڵامی نەدامەوە. ئەسکەندەر گوتی، بۆ دەفعی نەخۆشیی با.

خواحافیزیمان کرد و دەرکەوتین. سەردانی ماڵی کوێخامان کرد، خۆی لە ماڵ نەبوو. ژن و کچەکەی زۆریان هەوڵ دا میوانیان بین. شاناز لەوێ بەجێ ما و ئێمەش چووین بۆ بازاڕ بۆ ئەوەی لەگەڵ پەروەیزی لەسەر نەخشەکە کار بکەین. جەناب سەروان بە ماشێنەوە لەبەر دەممان قووت بووەوە. چەپکە گوڵێکی بە ڕەگوڕیشەوە هەڵکەندبوو، لە باخچەکەی خۆیدا بیچەقێنێ، نیشانی داین. ترۆمبێلەکەی لە شوێنێك پارك کرد و بە پیاسەکردن چووینە قاوەخانەکە. خەڵکی چلگرد، گاراژی شارە و شاریان نەبوو. بووم بە دەمڕاستیان، جەناب سەروان، بەڵێنی پێ دان ڕێگەپێدانی شەریکەی گواستنەوەیان بۆ وەربگرێ. بەختیارییەکان بە چاو و برۆ بە بێ ئەوەی جەناب سەروان بزانێ حاڵییان کردم، سووتەمەنی کەمە و داوای نەوت بکەم. ئەوەشم پێ گوت، ئەم گوندە نەوتی ڕەش و نەوتی سپی لێ نییە و کارێکیان بۆ بکە. وتی ئەمەشیان بۆ جێبەجی دەکەم. جەناب سەروانم لەگەڵ بەختیارییەکان بەجێ هێشت و چووین بۆ ماڵی پەرویزی. ماڵەکەی جمەی دەهات، بۆ کاروباری ئاوەدانی ئاوایی خەڵك لەوێ کۆ ببوونەوە. عوزرماییمان خواستەوە و ڕوومان کردە ماڵی کوێخا. لەنێو ڕێدا تووشی خانەخوێ هاتین و زۆریش گەرموگوڕ بوو، لەگەڵی ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵێ. مووسای جەهانگیری یەکی لە سەرۆك هۆزەکانی بامدی لەوێ بوو. وا دیار بوو داوای کچی کوێخای دەکرد بۆ کوڕەکەی. کوێخا بە دابی خۆی کردی بە گەرمە و زۆری بەخێر هێناین و شەربەتی نەباتاوی پێ داین. ئەو هەلەمان بە باش زانی و نەخشەم بڵاو کردەوە و زۆریشمان بەهرە لە مووسا خان وەرگرت. لەو کاتەدا سەرکار ئوستوار بە ماشێنەوە لێمان پەیدا بوون. خێزانی لەگەڵ بوو دەچوون بۆ سەر داوات لە تازە دێ. سواری ماشێنی گازی ژاندارمەری بووین و ڕێگەی چاڵ و قووڵی تازەدێمان گرتەبەر. ئەگەر ئەو ترۆمبێلە نەبوایە هیچ ماشێنێکی دیکە لەو ڕێگەیە دەرنەدەچوو. لەو ماڵەش وەژوور کەوتین و بە دابی خۆیان وەلای سەرێیان خستین و لەسەر پەتوو دانیشتین و پاڵمان بە دەستە نوێنەوە دا. بەختیاریگەلی چۆخە لەبەر ڕیز بە ڕیز هاتن و تەوقەیان لەگەڵ کردین و بەخێرهاتنیان کردین. ئافرەتێکیش تێکەڵ بە پیاوەکان بوو. بزنێکیان کوشتەوە و جەرگ و دڵیان بۆ برژاندین و خواردمان. چاوەڕێی دەهۆڵ و زوڕنای تووشماڵ بووین و هیچ هەواڵێك نەبوو. زانیمان زەماوەند و بووك گواستنەوە لە گۆڕێدا نییە و بۆ هاتنی سەرکار ئوستوار بیانوویان ساز

کردووە. بۆ ئەوەی کێشەی زەوی و زار لە گۆڕێدا بوو بۆیان چارەسەر بکات، کەسێك ئەو مولْکەی بە ناوی خۆیەوە سەبت کردبوو. ئوستواریش لەم کارە قەڵس بوو، ئێمەش بۆ دیتنی تازەدێ چووینە دەرێ. زۆرینەی زەوییەکانی ئەو گوندە بەراو بوون. پیاوێکی چۆخەپۆش گوتی: لێرە پێش ئەوەی ڕەزاشا خەڵکەکە بە زۆر جێگیر بکات، خانووی لێ ساز کرابوو. هەر هەموویان تایەفەی بابادی بوون. دوو جۆرمان نیر و ئامورر دیت وێنەمان لێ هەڵگرتن. بەردەکوتکەمان بینی تەواو کەونارا و نیشانەی یەك جێنشینیی هۆزەکە بوو. لە قوولینچکی حەسارەکە چاوم بە بەردێکی زل کەوت، دارێکیان لە کونی بەردەکە بڕیبوو، وتیان گوریسێك لەو دارە دەبەستن و دەیخەنە ملی جوانەگایەك، دەبێ ئەو پانێرە ماوەیەك ئەو بەردە ڕاکێشێت، بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ببێ بە گای بەرنیر. سەربانی ماڵەکانی ئەو گوندە  دار و هەڵاش و قوڕەبان بوو، باگردێنێکی بەردین لەسەر سەربان بوو. زۆرینەی ماڵەکان بەرهەیوانیان هەبوو، هەیوانەکانیش لەسەر دوو کۆڵەکە ڕاوەستابوون. هەموو بەرهەیوانێکیش دوو پێپلیکان لە حەسارەکەی بەرزتر بوو. چەمێکی کەم ئاویش بە تەنیشت تازەدێدا تێ دەپەڕی. تازەدێ لە ڕۆژهەڵاتی چلگرد هەڵکەوتووە و نێزیکەی ١٢ کیلۆمەتر مەودای هەیە. هەر وەکو ڕۆژان دەمژمێر ٣ نانی نیوەڕۆمان خوارد. کەباب و پلاو لەگەڵ شۆرباوی گۆشت. خانەخوێ ڕاوەستان هەتا میوان نانیان خوارد، ئەوان خەریکی خزمەتکردن بوون. هەر کەسێکیش هات دانیشتە سەر سفرە و خوان و خۆی تێر کرد. دوای ئەو گشتە میواندارییە سەرکار ئوستوارمان تێگەیاند، ماڵئاوایی بکات و زۆر بە دژواری هاتینەوە بۆ چلگرد. شەکەت و ماندوو چووینەوە ماڵەکەی خۆمان و تەخت ڕاکشاین، ئەوەندەمان نەزانی فەرامەرزی مەحموودی کەلانتەری هۆزی بامدی لێمان پەیدا بوو، بە دیتنی ئەویش زۆر گەشاینەوە. ئەو وێنانەی لە سەفەری پێشوودا لەومان هەڵگرتبوو، پێمان دا و زۆریشمان تاریف کرد. نەخشەمان بڵاو کردەوە و تاڕادەیەك ئاران و زۆزانی تیرەی سیراجەدین لە تایەفەی بامدیان دیاری کرد، باش بوو توانیمان مەودای گەرمێن و کوێستانی تەواوی بەختیاریگەل نیشان بدەین. وێنەی نیر و ئاموری تازەدێمان نیشان دا. گوتی: نیرو ئاموری یەکدەسك لەنێو بەختیارییەکاندا نییە. وەختێ زۆرتر باسم کرد و نموونەکانم نیشان دا، دەرکەوت ئەوە لەنێو تیرەی سیراجەدینیدا نییە. بەختیارییەکان گەلێکی بەر

بڵاون لەنێو خۆیاندا چەندین تیرەیان لێ بووەتەوە بە فەرهەنگی جیاوازەوە. لە تازەدێ، وتیان نێر و ئامووری خوزستانی زۆر بەهێز نین، هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە زەوی خوزستان پوك و نەرمە. ئامووری ئەوێ لە ناوچەی کوێستانی کاری پێ ناکرێت و خێرا دەشکێ. لە کوێستانێ کەڵك لە نێر و ئامووری بەهێز وەردەگرن و لە زەوی و زاری نەرمتر لە ئامووری ئاسایی. ئامووری خوزستان دوو قۆڵی هەیە و بە ئەسپ و هێستر جووتی پێ دەکەن، بەڵام ئامووری کوێستانی گای بەهێز دەتوانێ بیکێشێت. فەرامەرز بە جێی هێشتین و ئێمەش دیسان بۆ شێوخواردن میوانی سەرکار ئوستوار بووین. ماڵی ئاوەدان بێت. میوانی دیکەشی هەبوو، ئێمە خێرا نانمان خوارد و هاتینەوە بۆ ماڵەکەی خۆمان خەریکی خوێندنەوە و کاری خۆمان بووین، دواتر خەوتین.

### ٨ی جۆزەردان

دەمژمێر ٦ی بەیانی خەبەرمان بووەوە و بۆ نانخواردن دیسان میوانی ئەسکەندەر بووین. ژنان خەریکی مانگادۆشین بوون، مانگای گوێلکمردوو نەیدەهێشت بیدۆشن. کایان دەپێستی بەچکەکەی ئاخنی بوو بگرە بەم نەزمە شیریان بداتێ، بەڵام ڕازی نەدەبوو. وازمان لەو هێنا و شیری تازەیان بۆ کوڵاندین. هاتینە سەر باسی ڕازاندنەوەی ئەسپ و ماینی بووکێ و بی بی خاتوونەکان. ئەمەش کۆتاڵێکە ئەیدەن بەسەر ئەسپەکەدا تاکو نیوەی ملی دەگرێت. تەنیا چاو و گوێی بە دەرەوەیە و لمبۆزی داناپۆشن، ئەم سەرپۆشە بە مت و مووروو دەرازێننەوە و جوانییەکی تایبەت بە ئەسپەکە دەبەخشێ. ئەمەش بە «سەرکەش» ناوی دەر کردووە و هێنایان چاومان لێکرد، پارچەیەکی گەنمڕەنگی ئاماڵ سووره و بەری پێوە ئەدەن. با ئەمەش لێرەدا بزر نەبێ، هاتنی شاناز لەم سەفەرەدا بە قازانجمان تەواو بووە، بۆ هەر ماڵێك بە خاووخێزانەوە میوان دەبین. بۆ هەموو کوڕ و مەجلیسێك بە بۆنەی شانازەوە ژن و کچ دەورمان دەدەن و لێمان ناپرینگێنەوە. ئەمڕۆ خێزانی ئەسکەندەر دەیگوت حەز دەکەن خواردنی تایبەت بە عەشایرتان بۆ لێنێم؟ گوتم، چۆن خواردنێك؟ گوتی «توچڕی» (هەرمێشك)، زۆرم حەز لەو خواردنە چەورە نەبوو، گوتم چی دیکەش؟ گوتی: «گردە چنگاڵ» هەویرەکە دەکەینە کونتکێکی گەورە و کونێکی تێ دەکەین، لەسەر سکڵ

دایدەنێین و بە پۆلوان دایدەپۆشین ڕادەوەستین تەواو ببرژێ، دواتر وردی دەکەین و لەگەڵ پیواز و ڕۆن بە دەست هەڵی دەشێلین و دەیخۆین. بە کوردییەکەی دەبێتە پێنج قامکە. گوتم ماڵتان ئاوابێ بە کرێی ڕەنجەکەی نابێت، دیگار قاقای کێشا.

هاتینە دەرێ و لەگەڵ ئەم خەڵکە کەوتینە قسەکردن. چایخانەکان بۆ ئەو کۆبوونەوانە شوێنێکی باشن. فەرامەرز مەحموودی لەوێ بوو، باسەکەمان هێنایە سەر ژن و مێرد. پیاوی بەختیاری باوەڕیان وابوو پیاوی ژندار دەبێ کار بکات. زۆریش بە غیرەتەوە باسیان دەکرد و قاقایان دەکێشا! دەیانگوت ژن، بە لێدان وەفادارتر دەبێ. کەرتە مەڕێك بە چلگرددا تێ دەپەڕین، تەکانمان لە خۆمان دا وێنەیان بگرین، کامێرە کاری نەکرد، دیگار وتی، دووان دووان وێنەکە بگرە بۆ هەر دووکمان. ڕەوەندان بە پەلە لەگەڵ ڕانەکە دەڕۆیشتن و ئاگەداریان دەکردن. تەواویان مێگەلەکەیان تێکەڵ کردبوو فیکە و هۆهۆی شوانان دۆڵی کوهڕەنگی پڕ کردبوو. پرسیارم لە یەکێ کرد، بۆچی بە پەلە دەڕۆن و پەرۆشن؟ گوتی: ئێرە ناوچەی بابادییە و تایەفەیەکی باش نین. ڕوحم بە ماڵی کەس ناکەن. قەول وابوو سەردانێکی ئەوان بکەین. عەلیاوا لەسەر ڕێگەی چلگردە، لەوێ دەیان بینین. ئەوانیش بابادی بابن. خۆمان کرد بە ماڵی پەرویزیدا، وێنەیەکی ئامووری یەك دەسکیمان گرت. بەڕێز پەرویزی چەند ساڵێکە لە چلگرد ئامووریێکی دوودەسکی خوزستانی داوە بە دروستکردن، زەوی و زارەکەی نەرمە و پێی دەکێڵێ. بۆ ئەو کارەش تەنیا هێسترێکی بەسە. دەڵێن، کارکردن بە ئامووری خوزستانی تا بڵێی هاسانە و زەوییەکەش جوان دەکێڵێ. دوو ژن خەریکی دەوە و تەپاڵەپێژی بوو. ڕیزە تەپاڵە و کۆشکەلانیان لە دوورەوە دیار بوو. ئەو دوو ژنە خزمی بەڕێز پەرویزی بوون و کاریان بۆ دەکرد. لەو ڕۆژەوە بڕینی دارستانەکە پاوەن کراوە، ئەوان ناچارن بۆ سووتەمەنی وەرزی زستان کەمڕە و تەپاڵە بەکار بێنن. پێشتر ئەو کارەیان نەدەکرد. جاران دار و گوێنی سووتەمەنی دێنشینان بوو. ئێستەش لە یەك شوێن نیشتەجێ بوون، پێویستییان بە تەپاڵەسووتاندنە. شوانەکەی بەڕێز پەرویزی لەوێ بوو، بۆ ئەوەی بەراوردێك بکەم، دواندم. گوتی، خاوەنماڵ هەقە بەراتی تەواو بە شوان دەدەن، هەر وەك خۆراك، جلوبەرگ، جێ و ڕێ، بۆ هەر دە سەر مەڕ کاوڕێك، بەم چەشنە ئەگەر لەنێو مێگەلێکدا سەد سەر بەرخ هەبێ. پەنجا سەری بەرخە مێوە، ئەمەش لە ساڵدا بۆ ئاژەڵدار دەبێتە سامانێکی

زیادی. پەنجا سەریشی کاوڕە نێرە. خاوەماڵ دە سەر کاوڕە نێری باش هەڵدەبژێرێ. لەو چل سەرە ئەیاغەکەی ماوەتەوە شوان دە سەری هەڵدەبژێرێ. هەڵبەت ئەو هاوێرکردنەش وەختێ جێبەجێ دەبێ کار و بەرخ لە شیر بگرنەوە. بۆ بزنیش فەرقی نییە. جگە لەمانەش شوانە لە دە کاوڕ هەقی خورییەکی هەیە. بەرخەوان حەوتەی ڕۆژێك شیری مێگەلەکە بۆ خۆی دەدۆشێت وەك هەقە بەرات دەیباتەوە. جگە لەوە هیچی دیکەی نادەنێ. تەنانەت جلوبەرگیش، مەڕێك لە ڕۆژدا کەم و زۆر نیو کیلۆ شیر دەدا. بزنێکیش لە چوار بەش سێ بەش شیری هەیە. ڕۆنی بزن کەمترە لە ڕۆنی مەڕ. بۆ نموونە شەش کیلۆ شیر نیو کیلۆی ڕۆنەکەرە تێ دەکەوێ. شەش کیلۆ شیری مەڕ بەرەمەشکەیەکی یەك کیلۆیی تێ دەکەوێ. شوانە ئەم قسانەی دەکرد و پەرویزی سەری بۆ دەلەقاند. لەو کاتەدا کەسێك بە ناوی بابا وە ژوور کەوت و پەرویزی بە دیتنی زۆر خۆشحاڵ بوو. گوتی لە مێژ بوو بە تەما بووم مەڕە کان ببڕمەوە، ئەوە خوا تۆی بۆ گەیاندم. مەڕبڕینەوە لەنێو بەختیارییەکاندا بە هەرەوەز دەست پێ دەکات و تەواو دەبێ و هیچ کەسێك چاوی لە هەق و بەرات نییە. بەرانێك ٤ کیلۆ خوری و مەڕیش ٢ کیلۆی تەواوی هەیە. لەو کاتەدا کیلۆی خوری ١٣ قڕان دەکات. نێری بەر کاروانیش بابادیگەل پێی دەڵێن، «سەهیس» هیچ وەختێ نایبڕنەوە، بەڵام موی ئەو بزنانە دەبڕنەوە کە ڕەوانەی قەسابی دەکرێن. ئەگەر هەوا خۆش بێ گیسکەگەل دەبڕنەوە بۆ دروستکردنی ڕەشماڵ و بەن و گوریس. ماڵئاواییمان کرد و چووین بۆ ماڵی کوێخا.

لەم سەفەرەدا بە بۆنەی شانازەوە تاڕادەیەك لە کارەکانمان دابڕاوین. لە ڕێگەدا بەستەیەك گەزمان کڕی بۆ کوڕ و کچەکەی کوێخا، کچەکەی دەزگیرانداری کوڕی مووسای جەهانگیرییە. بڕیار وایە تا پازدە ڕۆژی دیکە بیگوێزنەوە. گەنمیان شۆردووەتەوە و لەبەر بەردەرگەی تاوڵەکە هەڵیانخستووە. وێنەمان لێ هەڵگرتن، کوڕی کوێخا گوتی، بۆچی ناچن «ڕەدو» ببینن، مەبەستی ڕەوەندان بوو، لە ڕێوە دەهاتن. پێشتر ئەوانەمان بینی بوو. بەسەر پێوە کاسەیەکمان دۆ بە کەرەوز و شیوت و گوڵەوە خواردەوە. گەرماوچی هات و گوتی، پیتێکم (پووتی) گازۆڵ لە ئاشەوان قەرز کردووە و گەرماو گەرمە. گوتم بەسەر چاو وەڕێ کەوتین، پەرویزی بە لۆنگ و خاولییەوە لە گەرماو هاتە دەرێ و گوتی، کوێوە دەچن؟ بە یەکەوە دەچین بۆ میوانی. ئێمە حەزمان

نەکرد و ئەویش مەرزەم نەبوو. چوونە میوانی لەگەڵ بەگ و خاندا بۆ ئێمەواتان زۆر خۆش نییە. شاناز لەگەڵ کچی کوێخا سەریان کردبوو بەنێو یەکدا، لە ئاخریدا وتی، ژن و کچی بەختیاری زۆر بێ شەرمن، شۆخی سەیر و سەمەرە دەکەن، نەمزانی مەبەستی کام شۆخی و جەفەنگ بوو، بەڵام دەزانم زۆر شت شارنشینان بە شەرمی دەزانن، لێرە کەس ئەمەی پێ ئیراد نییە. دەمژمێر دوازدە و چارەکە، لە ژوورەکەدا ڕاکشاوین چاوەڕێی سەرۆك پاسگە و خێزانی ئەوین لەگەڵ مەهدی فەرامەرزی بێن بۆ لامان بچین بۆ میوانی لە گوندی خەسرەوی. لەگەڵ دیگار قەرارمان داناوە نەچین بۆ ئەو میوانییە و سەردانێکی ماڵە هەژارەکان بکەین. بە ڕاستی لەو خانخانییە جاڕز بووین. هەرچۆنێك بوو خۆمان لە دەست میوانی خەڵاس کرد، خەبەرمان زانی گەرماو گەرم کراوە. ئەو هەواڵەش بە کەیفی ئێمە بوو، بێ ماتڵکردن وە ژوور کەوتین. گەرماوەکە تازەیە و سێ دووشی هەیە. ژن دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ، ئەسپێی دیتبوو. زۆرم پێ ناخۆش بوو بەڵام من هیچم نەدی.

خۆشۆردن چارەکە دەمژمێرێکی تەواو نەکرد هاتینەوە ماڵێ و دیگار ملی نا لە شیو و کوڵ و جلەکانی هەڵخست. ئەسکەندەر وەژوور کەوت و بە شوێن ئەویشدا دەستەیەك بەختیاری و دیسان نەخشەمان هێنایەوە گۆڕێ و سنوور و کەوشەنی زۆریەك لە تایەفەی چوار لەنگ و حەوت لەنگمان دیاری کرد. گەرمێنی زەڕئەسوەندەکاتن لە لایەکەوە دەچێتەوە سەر چیای منارە و لە لایەکی دیکەشەوە دەچێتەوە سەر کەوشەنی خاکی چوارلەنگی کیان ئێرسی. بەشێکی ئەو «تەمبی» و لەو سەریشەوە چۆمی کاروون دەگرێتەوە لە نێزیك مەسجد سولێمان، لە سەرحەدی «ماڵی ئەمیر خان» دیناروەندەکان لەو ناوە جێگیرن. کەوشەنی زەڕئەسوەندەکان دەچێتەوە سەر بواری بەردە قەیچی. سنووری گەندەلییەکان بەنێو زەڕئەسوەندەکاندا گەرمەسێر دەگرێتەوە. دێی دژی ئەمیرخان تایبەتە بە دیناران. ئەو شتانەی لە دەفتەری خۆیدا نووسیبووەوە. چرا نەوتی لێ بڕا و ئێمەش چاومان نەیدەدیت و دەستمان لە کار کێشایەوە. دەمژمێر شەشی ئێوارەیە، هەور و هەڵا و بارانە. شاناز و دیگارم بەجێ هێشت، لەسەر زۆر مانەوەی لە گەرماوەکەدا دەمەقاڵەیان بوو. وا دیار بوو زۆر مابووەوە و پیاوانی لە نۆرەدا ڕاگرتبوو. شاناز تووڕە و بێواز بوو، منیش بێ خەم و خەیاڵ لە چایخانەکە دانیشتووم و گوێم

داوەتە گۆرانی، « خەفەت لە بیر بکە » لە دەنگی ڕادیۆ تاران. دوو چایی گەرمم بەسەر یەکدا خواردەوە، ئاسمان ئەسرینی هەوران بەسەر کەژ و کۆدا دەبارێنیٚ و مژێکی خەستیش لووتکەی لە ئامێز گرتووە. منیش هەڵامەتم گرتووە و پژمین هەراسانی کردووم، بەڵام لە چاو تاران زۆر باشترم. جارجارەش بە بۆنەی کارکردنەوە شەکەت دەبم. لەگەڵ دیگار وەك یەك ماندوو نەناسین. تەنیا تێکچوونی کامێرەی وێنەگرتن زۆری تووڕە کردووم، بەهیوام دیگار تۆڵە بکاتەوە کە دەشیکاتەوە.

## ٩ی جۆزەردان

بەیانی شەکەت و نەخۆش لە خەو هەستام، ئازای گیانم دەڵێی کفتەی کوتراوە. ڤیتامین سێی، پێشکەشیی دیگار هیچی پێ نەکردم. قەول وا بوو بەیانی بچین بۆ خێوەتەکەی فەرامەرزی نەچووین و دیسانیش لە ماڵی ئەسکەندەر خواردنمان بوو بە شیر و ڕۆنەکەرە. ئەمەش بۆ ئێمە جێی دڵخۆشییە و ڕوو لە هەر ماڵێك دەکەین، حەوت هەشت بەختیاری لەگەڵمان وەژوور دەکەون. پیاوەکان بێکارن و لە جێیەك دەگەڕێن لێی کۆ ببنەوە و کاتی پێ بەرنە سەر. لە پاش ٤٥ ڕۆژ بەهارەکۆچ، حەسانەوە و پشوودان ڕۆژانێکی خۆشە بۆ بەختیارییەکان. هەر ماڵێك دەگاتە هەوارگە بار و بنەی خۆی دەخات و ڕەشماڵ هەڵدەدات. هەرجێیەك دەبینی جێی خێوەت و چادرە. هەر کەسە و شوێنی ڕەشماڵی خۆی دیاری کردووە. هەر وەختێك چادرەکان هەڵدران ڕەنگی هەوار دەگرێتە خۆی. کەسێکی دیکە هەقی نییە لە جێ هەواری ئەوی دیکە ڕەشماڵ هەڵدات.

بەختیاریگەل هاتن و دەوریان داین، قسە و باس دەستی پێکرد. بابادیگەل زۆر بە تایەفەی خۆیان دەنازن. دەیانگوت: هیچ وەختێ ئاغاکانی بەختیاری دەروەستی بابادییەکان نەهاتوون. بابادی هەمیشە ئەوانیان لە بەشی خۆیان وەدەر ناوە و چادر و خێوەتیان لێ تێك داون. هەتا وای لێهات کەوتنە فرتوفێڵ و پێنج کچیان دا بە پێنج کوڕی سەرۆك هۆزی تایەفەی بابادی و بەو خزمایەتییە دەستی غیرەتی بابادییان کورت کردەوە. هەڵبەت ئاغاکانیش ژنیان لە بابادی خواستووە. ئەو خزمایەتییە لەبەر جوانیی کچانی لووڕ بووە و مەسەلەی ڕامیاری لە گۆڕێدا بووە، عەشایەرەکان دەیانگوت، تا بڵێی ئەو کچانە جوان بوون، سەردار ئەسعەد و سەردار زەفەر هەر بۆیە خواستوویانن.

بەختیاریگەل دەیانگوت هەروەختێ خانان کیژێکی جوان دەبینن زوو ئاشق دەبن، نەشیاندەتوانی بە زۆر داگیری بکەن، دەهاتنە خوازبێنی و مارەیان دەکردن. تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بووبێت. ئەم شتانە بوو بۆیان باس دەکردین. لە پڕ سمێڵی پیاوەکان سەرنجی ڕاکێشام، ئەوەندەی سەرنجم داوە لەنێو ئێلەکەدا هیچ پیاوێکم نەدیوە بە بێ سمێڵ بێت. هەر کەسە و شێوەی سمێڵی مەعلووم بوو: سمێڵی خان و سەرۆك هۆزان تەخت و ڕاست، پیرەمێردی لووڕ چەند چڵێك لەژێر کەپۆدا، لە چل بۆ سەرێ نەختێ زیاتر، گەنجەکان چەنگیزی و شۆڕ. ڕدێن لە بن نەرمەی گوێچکەوە دادەماڵن" ئەوانەی تەمەنیان هەیە لەسەر ئێسقانی لاجانگەوە دەیتاشن. کەمتر کەسیان ڕیش دادەنێ.

من خەریکی وێنەکێشانی ڕیش و سمێڵ بووم، یەکێ لە بەختیاریگەل سەری کرد بەنێو دەفتەرەکەمدا، ئەوانی دیکەی حاڵی کرد و بوو بە قاقاکێشان. دیگار خێرا نەخشەی دانا و باسی سنوور و حەد و مەرزی گەرمێن و کوێستانی بێهداروەندی کرد و لەسەر نەخشەکە نیشانە و خاڵی دانا. بۆمان ڕوون بووەوە بێهداروەندان نێزیکەی ٥٠٠٠ بنەماڵەن. کوێستانی «بیرگون»، «خاکی» ،شەهان کەردەن» و «کێوە سپی». گەرمێنی دەوروبەری «ئەندیکا» ، (مەسجد سولێمان)، «حەوت شەهیدان» (مەسجد سولێمان» و جلکان. دوو سێ کەسی مۆری لەوێ بوون گوتیان، بەر لەوەی مەلا فەیزوولای سادقی (کەلانتەرێکی خوێندەواری شارەزای تایەفەی مۆری) ببینی، ئێمە مۆرییەکان هیچ وەختێ بە کێوە زەردا تێ ناپەڕین، بۆ ئەوەی بچین بۆ هاوینەهەواری کوهڕەنگ و ئەسفەهان. کوێستانی ئێمە لە ناوچەی بازفتە، واتە لە نێوان چیای تاراز و کێوە زەردی بازفت. گەرمێنمان لە چیای منارەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە چیای تاراز، لە داوێنیشەوە (شیمبار) شیرینبەهار دەگرێتەوە. جارێ نیشانەمان کردووە با بزانین دەبێ بەچی. لەگەڵ ماڵئاواییدا بەجێمان هێشتن تاکو ئەو خەڵکەش بە کاروباری خۆیان ڕابگەن.

دیگار لەنێو ڕێدا دەیگوت: «سەیرت کردووە ئەو ئێلی بەختیارییە بەسەر دوو بەشی هاوسەنگدا دابەش بوون، ئێلخانی و حاجی ئێلخانی، بەسەر دوو برادا، گوتم مەبەستت چییە؟ وتی لەنێو ئێلاتی دنیادا یەك دانە هەیە و ئەویش لەنێو بەختیاریگەلی ئێراندا. یەکی دیکەش لە توونس دیتراوە. لەوێ دوو برا ئێلەکەیان کردووەتە دوو بەش.» سوپاس بۆ ئەو ڕوونکردنەوەیە. بەڕێز پەرویزیمان بینی ئەو هاوکارە ماندوونەناسە. چووینە ماڵی

ئەوان و دەرگەی قسە و باسمان خستە سەر پشت. لەوێش بەختیاری لە هەر خێڵ و هۆزێك دەوریان داین. یەكێك بەردەوام چایی دەگێڕا، باسی ژن و ژنخوازی هاتە گۆڕێ، دەیانگوت، لە بەختیارییەكاندا ژن و ژنخوازی زۆر ئاساییە و تایەفەكان كچ بە یەكدی دەدەن، بەڵام خان و ئاغا حەز ناكەن كچ  بە دەرەوەی خۆیان بدەن. لووڕەكانیش هەر وان. ژنهێنانیش خەرجی زۆرە، ئەگەر پیاوێك لەنێو « منداڵ» (لەسەر تەقسیماتی ڕێكخراوەی جڤاتیی ئێل) ژن بهێنێ، شیربایی كەمتری دەچێ، ئەگەر لە «منداڵ»ی دیكە هەر لەو تیرەیە ژن بخوازێ، شیربایی زۆرتری لێ دەستێنن. یان ئەگەر لە تایەفەیەكی دیكە جگە لە تایەفەی خۆی ژن بێنێ نرخی شیربایی دەچێتە سەرێ. ڕەنگە هۆی ئەم خزمایەتییە هەر ئەوە بێ، لەنێو تیرە و تایەفە و منداڵی خۆیان ژن و ژنخوازی دەكەن. زۆر جاریش لەسەر ئەم بابەتە ژنەڤتوومە ئەگەر كوڕێك كچە مامی بخوازێ، شیربایی كەمتری لێ دەستێنن. ئەگەر خان یان كوێخا و سەرۆك هۆز ژنێكی لووڕی هەبێ و ژنێكی «بی بی» (كچی سەرۆك هۆز یان خان) ئەو منداڵەی لە بی بی دێتە سەر دنیا لە چاو منداڵی ژنە لووڕە بانتری حیساب دەكەن و دەسەڵاتی زۆرتری دەدەنێ و هەر ئەویشە دەبێتە جێنشینی بابی. لە مقامی كەلانتەری و كوێخایی و ڕیشسپیدا، كەسەكانی هیچ تایەفەیەك دەستیان لە هەڵبژاردنەكاندا نییە و خان تووشماڵ (كەلانتەر) هەڵدەبژێرێ و كەلانتەر كوێخا و تیرەكان و «كوێخاكان» ڕیشسپی و منداڵ هەڵدەبژێرن. ئەو زنجیرەیە دەسەڵاتی خان نیشان دەدا لەنێو ئێلەكەدا. بەڕێز پەرویزی داوای لێبووردنی لە كۆڕەكە كرد و چوو سەری ئەو جۆگەیەی دا كە هەزار تمەنی لێ خەرج كردبوو، شەوی ڕابردوو باران تێكی دابووەوە. ئێمەش هاتینە دەرێ بچین بە دووی شانازدا لە ماڵی سەركار ئوستوار. ئەمەش بیانوو بوو، نانی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد. بۆ خەوی دوانیوەڕۆ هاتینەوە بۆ مزڵەكەی خۆمان، نەمانتوانی بخەوین و سەردانی بازاڕی چلگردمان كرد. گیوەچی و كڵاشكەرمان دیت و وێنەكانی سەفەری پێشوومان پێ دا. دواتر چووینە دووكانەكانی دیكە و نەختێك مت و موورمان كڕی، شاناز لەچكەی بە دروستكردن دابوو، ئەویش حەزی لە جلوبەرگی بەختیارییە. چراكەمان لە تەنەكەساز وەرگرتەوە و دە تمەنی هەقدەست لێ وەرگرتین. هاتینەوە چایخانە و پلانی سەردانی كوهرەنگ و سەیرانگای ئەوێمان دانا، بۆ ئەوەی شاناز چاوی پێی بكەوێ. كوێخا سێ هێستری بۆ

پەیدا کردین، ڕۆژی ٢٥ تمەن کرێی ئەو یەکسمانە بوو. لەبەر زۆریی کرێکە پەشیمان بووینەوە. پێشنیازم دا بەیانی بچین بۆ فانیاوا، سەردانی ماڵی ڕۆستەم خانی برای جەعفەرقوولیخان بکەین. دیگار پێی خۆش نەبوو گوتی، ماڵی ڕۆستەم خان بۆ شاناز خۆش نییە و حەزم لێ نییە. بڕیارمان دا مسەبایەك بگرین هەتا جەعفەرقوولی دێ بە شوێنماندا، ئەوسا لەگەڵی بچین. ئەمجار لەبەر شۆقی چراتۆڕ ملم نا لە کارکردن لەسەر پرسیارنامەکان. شانم حەجمانی لێ بڕیبووم هەستم دەکرد دەستێکم خەریکە لە کار دەکەوێ. دەمژمێر ١٠ خزاینە کیسەخەوەکانەوە و ماوەیەکی باش ئەمدیوادیوم کرد.

## ١٠ی جۆزەردان

دەمژمێر ٥ی بەیانی بە ئێش و ژانی شان و قۆڵم وەئاگا هاتم، پێم وابوو بە هیچ جۆرێك ناتوانم لە جێی خۆم ببزووم، دووجار وەخەبەر هاتم و دیگار و شاناز لە خەو هەستان و منیش خۆم کردە خەو. ئەوان چوون بە لای نانخواردنی بەیانییەوە و منیش دەمژمێر ٨ چووم بۆ کن ئەوان. ئەو سەروبەندەی پێشتر باسم کرد، تایبەتی بووك و بی بی بوو، لەگەی پاڵووی گوڵێنگدار، هێنایان و ئەسپیان ڕازاندەوە و ژنی ئەسکەندەر سوار بوو، وێنەمان هەڵگرت و ماڵئاواییمان کرد و هاتینەوە بۆ ماڵێ.

هەوا ساماڵە، نەختێکیش گەرمە. نەختۆکەیەك لەسەر پرسیارنامەکان کارم کرد، ئەمڕۆ هیچ سەرخۆش نیم لە کارەکان و باش وایە بیکەین بە ڕۆژی حەسانەوە. دیگار و شاناز خەویان لێ کەوتووە و پلانێکیشمان بە دەستەوە نییە. یاداشت و هەڵبژاردەکانم ڕێکوپێك کرد و لە ژوورەکە هاتمە دەرێ. جۆگەلە ئاوێك بە بەر ژوورەکەدا دەڕوا، منیش هەر وەك منداڵان چیلکەیەکم بە دەستەوەیە و خەریکی خۆخافڵاندنم. دیگاریش لە خەو هەستا و هات لە تەنیشت منەوە خۆی سەرقاڵ کرد. دەبوو بکەوینە ڕێ، بەڵام نەکرا. ڕوومان کردە چایخانەکە، بەختیاریگەل مەجلیسیان گەرم بوو، ئێمەش تێکەڵیان بووین.

لەو کاتەدا ترۆمبێلی ئیدارەی ژینگەپارێز لە بەردەرگەی قاوەخانە ڕایگرت، پیرەمێردێکی چاویلکە لە چاو دابەزی و بە موهەندیس قاویان دەکرد. قرچەپێ هەموو لەبەری هەستان.ئەویش لە ئێمە ڕامابوو، دەمزانی خۆی بۆ ڕاناگیرێ و دەپرسێ ئێمە کێین، ڕاست هەر وابوو. ڕووی کردە بەرێز پەرویزی: «ئەم غەریبانە کێن؟» ئەویش

وەڵامی دایەوە. دواتر جەنابی موهەندیس سەبارەت بە ژینگە و ژینگەپارێزی چەند وتەیەکی فەرموو. پەرویزی بە تووڕەیییەوە پەڕییە نێو قسەکانی و گوتی: ئێوە تەنیا قسەتان هەیە و هیچ کارێکیش جێبەجێ ناکەن. بۆچی یارمەتیمان نادەن؟ ئەو قسانەی لە نێوان ئەواندا دەکرێ، زانیم ناوەندی ژینگەپارێز ئەو کابرا بەختیارییە پشتاوپشتی لەو خاکەدایە، خاوەنی زەوی و زاری بەراوە و هەزار سەری مەڕ هەیە و تەنیا پارەی لەوەڕی ١٥٠ سەر حەیوان دەدا. فرتوفێڵی زۆرە و ڕێگەپێدانی لەوەڕی ١٥٠ سەر مەڕی بۆ کوڕەکەی وەرگرتووە و تەنیا دەتوانێ ٣٠٠ سەر بکاتە نێو لەوەڕگەی بەختیاری. ئەو ٧٠٠ سەرەی بە بێ لەوەڕ ماوەتەوە، ڕەوانەی قەساوخانەی بکات، بەڵام ئەو ئاژەڵدارە دەوڵەمەندەی کە نابێ بچێتە سەر لەوەڕگەی بەختیاری و تەنیا هەبووە پێشتر پارەی داوە بە ئاغاکان و جارجارە ڕانەکەی تێ کردووە. هەقە لەوەڕی هەزار سەری وەرگرتووە و مێگەلی کردووەتە لەوڕی بەختیارییەوە. هەر بۆیە خەڵکەکە لە موهەندیس تووڕەن. ڕێگەپێدانی چەنسەد سەر مەڕی داوە بە خەڵکی و کردوویەتە سەر زگی ئێمە! خۆشمان ناچارین وردە وردە حەیوانەکانمان بفرۆشین. ئەگەر بێت و عیلاتی مەڕدار لەوەڕگەی نەمێنێ، خێڵەسات و هۆبە و هەواریش تەواو دەبێ و لە ناو دەچێ. ڕەوەندیش ئەگەر ئاژەڵی بە دەستەوە نەمێنێ، ماڵ و ژیانی دەبێ بە هیچ. ئەگەر بێت و بەرگری بکەن لە چوونە هەوار و دارستان و لەوەڕگەکان پاوەن بکەن، باری ئابووریی وڵات دەشێوێ و ئاژەڵداری نامێنێ و دابینکردنی پرۆتێن نەگونجاو دەبێ. لە لایەکی دیکەوە بۆ ئەوەی جەنجاڵی و قرە و هەرای ئەو خەڵکە بخەوێ، یارمەتی دەدەن ئەویش چ یاریدەدانێك! قەباڵی کارێك لە کۆمپانی نەوت، یان سەدی ئاو. بە ماوەی ٣ تا ٦ مانگ بە ٦٠ کرێکارەوە. شەریکەی نەوت ڕۆژی ٢٤ تمەن بۆ کرێکارەکان حیساب دەکات. قەباڵچی لەو برە پارەیە ڕۆژی ١٢ تمەن دەکاتە دەستی کرێکارەکانەوە. لە هەر کرێکارێك ڕۆژی ١٢٠ قڕان دەگێڕێتەوە، بۆ شەست کرێکار ڕۆژی ٧٢٠ تمەن وەردەگرێت و لە پاش تەواوبوونی قونتەراتەکە، ٦٤٨٠٠ تمەن دەچێتە گیرفانییەوە. ئەگەر وردە حیسابی لێ دەرباوێژین لەو ماوەیەدا شەست هەزار تمەنی بۆ دەمێنێتەوە. ئەمەش جێی زیانی ئاژەڵداری پڕ دەکاتەوە، بۆ ئەو پیاوە خاپینۆکە.

ئەوەش قرە و هەرای بەختیاریگەل بوو لەگەڵ جەنابی ژینگەپارێز، بەڵام بەرێزی لەوێ نەمابوو، منیش هەر وا هزرم دەکردەوە، بەختیارییەك لە تایەفەی بابادی تیرەی سیراجەدینی وتی: زۆزانی ئێمەش لەسەر نەخشەکە دیاری بکە. لێم پرسی لە کوێیە؟ لە هاوینە هەواری نێزیك (سەدی شاهەباس)، «مارمەلەکی»، «کانی کوهرەنگ»، «لاسەوزە»، «بەردە خێوەت» ئەمانەش هەموویان لە دەوروبەری کوهرەنگن و «سێو و چنار بیرگون» لە گەرمەسێری لای ئێمەش برێتین: لە «دێلیێ محەمەدحوسێن خان» «دۆڵی بابا ئەحمەد» «بنوار» «هارکەلە» «ئاورەزك» «دژ» «چاڵی ئاو» «دین کەلو» ئەم شوێنانەم دیاری کرد و ئەویش زۆری سوپاس کردم. ئەمەش کاری ئەمڕۆمان لە بریی پشوودان.

## ١١ی جۆزەردان

دەمژمێر حەوت و نیو لەنێو پێخەفی شەو هاتینە دەرێ. خێزانی فەرامەرزی لەگەڵ کورەکانی فەرغون بەدەست هاتن بۆ گواستنەوەی شیاکە لەبن دیوارەکە، بۆ ئەوەی لەولاوەترەوە بیکەن بە تەپاڵە و دەوە. کاسەیەکیان ماست بۆئێمە هێنابوو، بۆ نانخواردنی بەیانی چووینە قاوەخانەکە. لە پاڵ نانخواردندا، بەهرەیەکی زۆرمان لە قسە و باسی بەختیارییەکانی ئەوێ وەرگرت و ئەوانەی بە کارمان دەهات نووسیمانەوە.

دەر و ژووری چایخانە جمەی دەهات و خەڵکەکە وەك هەنگ لە دەورەمان پوورەیان دابوو. بە بیانووی دیتنی ڕەوەندانەوە کۆتاییمان بە ئەم دانیشتنە هێنا و هاتینە دەرێ. لەسەر ڕێگەی هەواچیان چووینە بان تەپۆڵکەیەك و لە ڕەوەندان ڕاماین. سەرەتا ژن و منداڵ بە سواری چەند ئەسپێك هاتن و جوانوو لە دوو، بە دوای ئەوانیشدا چارەوێ بە کۆڵ و بارەوە دەرکەوتن. بە دوای ئەوانیشدا بزنەگەل و گوێرێژ و ڕەشەوڵاخ هاتن. سەرباریش مریشك و کەڵەشێر، لەگەڵ خێوەت و ئەستووندەك. بەختیارییەك لە تەنیشتمان دانیشتبوو، گوتی: هەمیشە ژنەکان بە پێی ڕەشەوڵاخ و بارەبەران دێن، چونکە ئەوان لە ڕێدا بە سەبر دەڕۆن و گرفتێك ساز ناکەن. لە شوێن ئەوان هێستر دێن بە بارەوە، ئەوان لاسارن، هەر بۆیە پیاوەکان لێیان دەخورن، لە دەر و دەشت غار دەدەن. لە دوای هەموویاندا ڕانەمەڕەکە دێت. ئەوانە تایەفەی هەمووڵە و لە دوورکیباب بوون. بە بێ ڕاوەستان بە خاکی بابادیدا تێ دەپەڕن. لە نێزیك «دێمە» ڕەشماڵ هەڵدەدەن.

هەوڵیان ئەوە بوو لەنێو ڕێدا نەمێننەوە و بابادی بە سەریاندا نەدەن و تالآنیان نەکەن. بە تالۆوکە بە چلگرددا تێدەپەڕین، کەوتینە شوێنیان، لەولای چلگردەوە ڕانەکەیان ڕاگرت و سەرحیسابی دەوڵەتی خۆیان بوونەوە. نەکا حەیوانێکیان لێ هەڵبڕابێت، یان تێکەڵ بە مێگەلێکی دیکە بووبێت.

گەڕاینەوە چلگرد، لە دوورەوە جەنابی ئەنوەری قاوی کردین، زانیم فراوین میوانی ئەوین. ئەسپی ئەنوەری کوڕەکەی سواری ببوو، دیگار لێی وەرگرت و سوار بوو، چەرخوخولێکی لێدا و بۆی هێنایەوە. هەسپێکی لەڕ بوو، سەیری ددانی کرد بزانێ ١٢ و ١٣ ساڵییەتی. قەولمان دا بە ئەنوەری دەمژمێر ١١/٥ لە ماڵی ئەو بین. لە دووکانێك لەگەڵ چەند بەختیارییەك دانیشتین، سەبارەت بە ئەسپ قسەیان دەکرد. گوێمان بۆ شل کردن، دیسان لەسەر تەمەنی ئەسپ قسەیان دەکرد، تێگەیشتین کەڵپەی ئەسپ یەکەم جار لە تەمەنی پێنج ساڵیدا دێتە دەرێ. گەورە و سپییە، لە پاڵ ددانەکانی دیکەیدا قامکی ئاماژەی نێوانە. ئەو کەڵپەیە لە٧ ساڵیدا دەچێتە خوارێ و لە ٩ ساڵیدا دێتە دەرێ. باریکترە و مەودای لەگەڵ ددانەکانی پێشەوە و کلپەدا بلآوترە. ئەوەی هەبوو پێشتر باسمان کردووە. لە تەمەنی سێ ساڵییەوە دەست دەکەن بە ڕاهێنان و عاملاندنی جوانوو. خۆیان بە ڕاهێنەری جوانووەکە دەڵێن «راجز» ئەو کەسە سەرەتا دەست بە یاڵ و شان و ملی جوانووەکەدا دەهێنێ و شەوانە لە کێڵگەیەکی نەرمدا دەیگێڕێ، بۆ ئەوەی فێر بێ لە شەودا ڕێگەی خۆی وەدۆزێ و دەست و لاقی پتەو و قایم بێت و ڕا نەکا. وردە وردە لبادێکی لێ دەکەن و منداڵێك سواری دەبێ و دەیگێڕێ. لێرەدا کوڕێژگە دەبێتە ئەسپسوار و جوانووەکەش ئامادە دەبێ. لە چوار ساڵیدا زینی لێ دەکەن و لغاوی عارەبی لە دەم دەکوتن. هەڵبەت ئێمە ئەو واژەیەمان هێنا، ئەوان دەڵێن «لگۆم» وێنەی چەند لغاو و ئاوزەنگمان بۆ کێشانەوە، گوتمان کامیان دەناسن؟ ئەوان لغاوی عارەبانیان نیشان داین. حەزیان بە لغاوی مەغولی نەدەکرد. ئەوەیان بە ئاوخۆری دەناسی. هەتا ساڵێك ئەوە کاریانە لەگەڵ ئەسپەکە، ئیتر لە پێنج ساڵیدا حازر و ئامادەیە بۆ سواری و غارغارێن. ئەسپی بەختیاری فێر نین پاشەوپاش بکشێنەوە، بەڵام لاشان دەرۆن. بەختیاریگەل ئەسپی کلك قیت و گەردن کەڵەبابییان خۆش دەوێ. مەودای نێوان سمت و مل کەم بێت، سمی گەورە و ڕەق بە ئاسانی بزمار کاری لێ

نەکات. بەختیاریگەل قیت و قۆز لەسەر زین دادەنیشن. هەوساری ئەسپەکەش بە دەستی چەپ دەگرن. دەستی ڕاست ئازادە. تەنیا بە دەستی چەپ هەموو فەرمانێك بە ولاغە بەرزە دەدرێت. دەیانگوت دەستی ڕاست بۆ لێخوڕین و قەمچی لێدان و تفەنگهەڵگرتن ئازادە و دەبێ ئامادە بێت. چاومان بە زینێکی بەختیاری کەوت سەر لەبەر لە تەختە ساز کرابوو، ئێستە هەرنییە و هەموو کەڵك لە زینی ئینگلیزی وەردەگرن. ئاوزەنگیان لە شێوەی ئاوزەنگی عارەبی هەیە و جارێ ئاوزەنگی ئینگلیزی بەکار دەهێنن. ئاوزەنگ و لغاوی موغولی زۆر باش دەناسن، بەڵام پەسندی ناکەن. ئێستەش لغاوی موغولی هەیە و پێی دەڵێن لغاوی ئاوخۆری. دەڵێن ئەسپ ئەو لغاوەی لەدەمدا بێ دەتوانێ ئاوبخواتەوە. وێنەی زینەدارینەم بە قەڵەم کێشایەوە، حەیف نەمتوانی بە کامێرە وێنەی بگرم. ڕەنگە ئەوە نموونەی هەبێ لە مۆزەی کۆمەڵناسیدا.

بەختیاریگەل دەیانگوت، ئێستە ئەسپی باش لە ناوچەی بەختیاریدا دەست ناکەوێت. واتە پێویستمان نییە. ئەسپ خەرجی هەیە. خانانیش لە تەواوبووندایە. نازانم لە کوێدا خوێندوومەتەوە، ئەسپسواری بە لغاو و زینەوە لە ۱۱۰۰ ساڵ لەمەوبەرەوە دەستی پێکردووە، پێشتر، لە ئێرانی کۆندا بۆ سووڕاندنی بەردی ئاش کەڵکیان لە ئەسپ وەرگرتووە. ئاوزەنگ دەستکردی موغلەکانە.ماڵئاواییمان کرد و فراوینمان لە ماڵی مەهدی خان خوارد و چووین بۆ ماڵی بەڕێز پەرویزی (سوڵتان عەلی پەرویزی) لە هەموو بارێکەوە زۆری یاریدە داوین.

شتێکی دیکە سەرنجی ڕاکێشاین، ئەویش گوانی بزن و مەڕەکان بوو، توورەکەیان تێ کردبوون. پرسیمان بۆ ئەو کارەتان کردووە؟ گوتی: بۆ ئەوەی کار و بەرخەکان دایکیان نەمژن. ئەو توورەکانە دەکەنە گوانی مەڕ و بزن، لەسەر پشتیان گرێی ئەدەن.

پێشتر دیتبوومان بەرغەلەکە دەکەنە کۆزێکەوە. پەرویزی کارژیلەیەکی هێنا و نیشانی داین، بە قەڵەمەیەك کارژیلەی بەستەزمانیان قەمتەر کردبوو تاکو نەتوانێ دایکی بمژێ. بەنێك دەخەنە هەر دوو سەری قەڵەکە و لە پشت سەری قایمی دەکەن و لقەدارەکەش لە دەمی کارەکەدا دەمێنێ. کارژیلە بەم دارەوە دەتوانێ بلەوەڕێ و ئاو بخواتەوە، بەڵام ناتوانێ دایکی بمژێ. پەرویزی بە پەلە ڕۆیشت و گەڕایەوە، کوتە ئاسنێکی چوار چوکڵەی بە دەستەوە بوو. گوتی، بۆ ئەوەی جوانوو لە شیر بگرینەوە،

ئەو ئاسنە لەسەر لمبۆزی جوانوو دەبەستین. ئەو کاتەی جوانوو بۆ شیرمژین سەر دەکات بە بن زگی ماینەکەدا، لە ترسی ئەو ئاسنە چوار چوکڵەیە ماین دەردەپەڕێ و ڕێگەی مژینی پێ نادا. ئەو کوتە ئاسنەش پێی دەڵێین جوانووبڕ. چووینە ژووری و ماوەیەکی باش لەسەر نەخشەکە کارمان کرد و سنوور و کەوشەنی خاکی بەختیاریمان دیاری کرد.

لەگەڵ پەرویزی هاتینە دەرێ و تەماشامان کرد مەهدی خان دەهات بە دووماندا. بە یەکەوە ڕوومان کردە قاوەخانە و لەوێ شێومان کرد و خۆمان گەیاندە ماڵی سەرکار ئوستوار. دوو کەسی بەختیاری لە تازە دێوە هاتبوون، ناسیاوی خۆمان بوون، ماڵیان دزرابوو. مەهدی خان زۆری شۆخی لەگەڵ کردن و زۆریش پێکەنین. هاتینەوە بۆ ماڵێ و خزاینە کۆشی خەو، بەیانی زوو دەبوو بۆ نانخواردن بچینە خێوەتی مەهدی خانی فەرامەرزی.

## هەینی ١٢ی جۆزەردان

بەیانی دەمژمێر ٦ وەڕێ کەوتین بۆ تاوڵی فەرامەرزی، پێچ و گەوەیەکی زۆرمان بڕی و شەکەت و ماندوو گەیشتینە ماڵی خانەخوێ. بەرقلیانمان نانی گەرمەتەندوور و شیر و ماست بوو. «ئەسکەندەر» وەژوور کەوت و گوتی، کاری توونێلەکە وردە وردە دەستی پێکردووە، خەریکی ڕێك و لووسیی ڕێگەکەن، بیست کرێکارمان گرتووە. بەرە و چلگرد شۆڕ بووینەوە، لەنێو ڕێدا تووشی پیاوێکی مۆریی بووین سەر قالّی خەرەك و لانکە و بێشکە سازکردن بوو. مۆریگەل، چونکە لەنێو دارستانی ناوچەی بازفتدا دەژین هۆگریی تەواویان بە دار و چێو هەیە و زۆریش دەستنەخشینن. وەبیرم هاتەوە بەڕێز پەرویزی لە دارتاشێکی باش دەگەڕا، ئامووری گەرمێنی دوو قۆڵی بۆ ساز بکات. داوام لێ کرد سەرێك لە جەنابی پەرویزی هەڵبێنێ. چووینە ماڵی پەرویزی، تازە خەریکی قسەوباسی خۆمان بووین، پیاوێك وەژوور کەوت. بەڕێز پەرویزی گوتی، ئەو پیاوە لە منداڵی «کیسیدی» تیرەی «ئارپەنایی» تایەفەی بابادییە. گوتی ئەو کیسیدیانە منداڵی خوێندەواری ئێلەکەن. لەنێو ئێلدا وانەبێژی دەکەن. ئەوانە زۆر زوو خوێندەوار دەبن. شوانەکانی ئەو منداڵانە بە دووی مەڕ و ماڵاتەوە لەسەر تاتەبەردەکاتن بە خەڵووز خەریکی نووسین دەبن و لەسەر ئەوەی فێری بوون کار دەکەن. هەر لە کۆنەوە ئەوانە لەنێو

ئێلدا وانەیان گوتووەتەوە و بەختیاریگەلیان خوێندەوار کردووە و فێرکاریان ڕەوانەی دەوروبەر کردووە. کیسیدی بەختیاری هەر هەموویان خوێندەوارن و نێزیکەی ٧٠ بنەماڵەن، لە ئەستێرەناسیدا شارەزان. ئەو منداڵانە لە ناوەندی تیرەی ئارپەناییدا جێیان هەیە و بە «کیسید» ناودێرن. بەختیارییەکانیش نازانن ئەوانە چۆن خوێندەوار بوون.

لەنێو ئێلی بەختیاریدا کۆمەڵێك لە وەجاغزادە هەیە، ئەوانە لە ساداتی شای خۆراسانن لە تایەفەی بابادی. نێزیکەی ٥٠ خێزانن. ساداتی شازادە عەبدوڵا لە چیاکاندا مەحموود ساڵحی چوارلەنگ، ١٠٠ خێزانن، ساداتی بوێر لە چیا بە حەوت لەنگ، چل خێزان، ساداتی سوڵتان برایم لە نێوان چیای نێزیك ئیزە لەوبەری ئاوەکەوە نێزیکەی ١٠٠ ماڵن، ساداتی سەید ئەحمەدی گەورە، لە نێزیك چیای ئێزە لە بەشی حەوت لەنگ نێزیکەی ٣٠ خێزانن. ساداتی سەید عیسا (سەعید) لە فەریدەن و بەروبرد تایبەت بە چوارلەنگ نێزیکەی ٢٠٠ خێزانن. ئەو ساداتەش ئاژەڵدارن. زەوی و زاری کشتوکاڵیان هەیە و لە هەموو ئێلەکەش باجی سەیدایەتی دەستێنن. چەند بەختیارییەك لە تەنیشت ئێمە بوون، باوەڕیان وابوو ساداتگەل بەختیاری نین، پەرویزیش قسەکەی ئەوانی قبووڵ بوو. تورك و لەك و عارەب لەنێو بەختیاریدا هەیە. تورکان بە تورکی «چەهرازی» بە ناوبانگن، تایەفەی «لەك» لەکی لووڕستانن تێکەڵی بەختیاریگەل بوون. عارەبی بەختیاریش سێ تیرەن، منداڵی عەلی بەگ، حاجی گەل، منداڵی کەنگرپەز، ئەوانە هەموویان خوزستانین. چوارلەنگیش عارەبیان هەیە و لە دەوروبەری مۆرغا و ئیزە دادەنیشن.

ماڵئاواییمان کرد و هاتینە بازاڕی چلگرد. غوڵام خواستی بە ٩ کەسەوە وشتریان پێ بوو، هاتبوون بۆ چلگرد، بە ڕواڵەت لەگەڵ بەختیاری جیاوازییان نەبوو. وەختێ سەرنجت دەدا پاتۆڵی پێیان نەختۆکەیەك تەنگتر و قوڵە لەسەر گوێزینگی لاق. کڵاویشیان بچووکتر بوو، لە باتی چارەوێ وشتردارن. لێمان پرسین، شیری وشتر دەخۆن؟ وتیان نا. ئەوان لە ڕابردوودا بۆ وشتر لەوەڕاندن هاتوونەتە ئەو ناوچەیە و بە ماوەی ٧ ڕۆژ ماونەتەوە و بۆ هەر وشترێك ١٠ قڕانیان داوە بە خان و سەرۆك هۆزان. دواتر ئەو٦٠ قڕانە زیادی کردووە و ماوەی ١٢ ساڵە پارەی لەوەڕ نادەن. لە ساڵی ١٣٤١ ڕێگەپێدانیان لە بەشی ژینگەپارێزی وەرگرتووە و لەچاو جاران ئەوانەی دێنە ناوچەکە

کەمترن. لە بازاڕی چلگرد لە پیاوێکی تایەفەی مۆری دەگەڕاین، وەڵامی چەند پرسیارێکمان بداتەوە. ئاخری وەدەستمان کەوت، سەبارەت بە نێر و ئاموور لێمان پرسی، هێندەی جیاوازی نەبوو. باسی جۆڵاییمان کرد، ئەویش هەر وا. لغاوی مەغۆلیمان لە دووکانێك دیت بە ئاوخۆری ناویان دەبردن. لە شوێن «پەلکە سەوز» وێڵ بووین، ژنانی بەختیاری جلوبەرگی خۆیانی پێ دەڕازێننەوە، لە پشت سەریان شۆڕی دەکەنەوە. دەستمان نەکەوت، گوتیان لە ئەسفەهان زۆرە و ئاڵتوون فرۆشان هەیانە.

برسیمان بوو ٧٥ گەرەم پەنیرمان کڕی بە ٦ قڕان، هاتینەوە بۆ قاوەخانەی سیاوەش فازلی، هەر ئەو چایخانەیەی هەردەم بووە بە هێلانەمان. نان و چاییمان لەوێ خوارد. سێ بەختیاری سەبارەت بە دارستان و ژینگەپارێزی قسەیان دەکرد: گوێنی قازانجی زۆرە و مخابن ئەگەر بیسووتێنن، لەسەر بەرووداری لێڕەواری بازفت بیر و باوەڕی خۆیان هەبوو، مۆرییەکان لەوێ زۆر بەختەوەرن، بەڵام قەدری نازانن بە هیچ و خۆڕایی ئەو دار و درەختە دەبڕن و دەیکەن بە زەویی کشتوکاڵ. وا دیار بوو عەشایر پێیان خۆشە وەرزێڕ بن و لە شوێنیکدا وەحەسێن، یان لەوە دەترسان لەوەڕگەکان بەشی دەوڵەتە و کێڵگەکانیش هی خۆیانە.

وردە وردە ئێلاتی هەموو ڕۆژی بە زەردە و بازفتدا تێدەپەڕن و بەشێکی زۆریان لە چگردەوە دەچنە دەرێ. سێ ڕۆژە تەنیا تایەفەی حەمۆلە ڕادەبرن. جارێ تایەفەی بابادی دیار نین، بەڵام ئەوانیش دێن. ئەوانە بە ڕێگەی ماشێندا هاتوون. ڕەوەندان لە کەژ و کۆ ڕەشماڵیان هەڵداوە و هەر لە خاڵ و می دەچن بە ڕوومەتی چیاوە. کە شەو دادێ هەر سۆڵە و گڕی ئاگردانە لە بەردەرگەی هەوارچییان سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت. فیکەی شوان و باڕەی مێگەل ئەوپەڕی جوانیی سرووشت دەردەخات. دووکان و بازاڕی چلگرد شۆقی تێ کەوتووە و ڕۆژ نییە پیکاب و لۆری کەلوپەل بۆ دووکاندار نەهێنێ و لە چلگرد بەتاڵی نەکا. بەختیاریگەل پێداویستیی خۆیان لە بنەو پاڵەوە دەست دەکەوت. وەختێ ئێلاتی دەگەنە سەر کۆنەهەواری خۆیان چییان گەرەك بێت لێرە دەیکڕن. هەر ئەوەندەی چادر و ڕەشماڵ و کولێن ئەستووندەکی وەبەر درا چوونە میوانی و میوانداری دەست پێ دەکات و بەسەرکردنەوەی خزمان تازە دەبێتەوە لەنێو عەشیرەتدا. ئەمجار قڕە و هەرا و دڵمەندی دەست پێ دەکات و ڕۆژ نییە دەستە دەستە ڕوو نەکەنە پاسگە بۆ گلە و گازەندە و

شکایەت، لە دەست دزینی مەڕ و ماڵات. ڕۆژێك لەسەر دۆسییە و پەروەندەی گەرمێن و کوێستان. ئەوڕۆ بە قسەی بەختیاریگەلدا بۆمان دەرکەوت، شاڵ و مەرەزچنینی «کیارسی» یان کیومێرسی بەناوبانگە. ئەمیش لە گوندێکی دزفول لە نێزیك سەدی دژ، ٨ فرسەخ دوورە بە ناوی «لیوێس» زۆرتر لەو گوندە چۆخەیان دەچنی و ڕەوانەی دەوروبەریان دەکرد. بە چۆخەی لیوێسی ناوبانگی دەرکردبوو. پێشتر ئەوەی بە لۆکە دروست دەکرا، وەرزێڕ و کرێکاری لووڕی عەشیرەتی دەیانکردە بەریان، نێزیکەی ٦٠ ساڵ لەمەوبەر ژنێکی لیوێسی چۆخەیەکی خۆماڵی دەچنێ و بە دیاری دەێنێرێ بۆ سالارشوجاعی ئێلخانی چولەنگ، یەکێ لە خانەکانی تایەفەی مەحموود ساڵحی، کوڕە مامی عەیمرادخانی چوارلەنگ. لەوە بە دوواوە بە ناوی چۆخەی سالاری نێوبانگی دەڕوا و تەواوی خان و ئاغاکانی بەختیاری چۆخەی سالاری دەکەنە بەریان و هەموو هۆز و تایەفەیەك دەگرێتەوە. تیڕ و توربێنی تایەفەی بابائەحمەدی یان «بامدی » زۆر بەنامیەن. باشترین بەرەی ئەوان تان و پۆی بە لۆکە و خوری دەچنن، دەستکردی بامدییە. توربێنی «گەندەلی» یان «قەندعەلی» زۆر بەناوبانگە. تەختە گیوەی چوار لەنگ تاریفی دەکەن و ئەمەش قسەی حەوت لەنگانە. ڕاست و درۆ وەباڵ بە ئەستۆی ئەوان. دارتاشی و چێوکاری تایەفەی مۆری لە هەموو جێیەك تاریفی هەیە. پێشتریش باسم کردووە. دەستەیەك چوارلەنگ هەن، لە دارتاشیدا زۆر بەنامیەن لە ناوچەی «لێبێد» لەسەر کەوشەنی ئاران و زۆزان. ئەوسا تێگەیشتین مۆریگەل ئامووری یەك قۆڵیان نییە و ئەو هێڵە سنوورەی بۆ نموونە دامان ناوە بۆ جوداکردنەوەی گەرمێن و کوێستانی بەختیاری کەوشەنی نێوان ئامووری گەرمێن و کوێستان نییە و ئەو مۆریانەی لە ماوەی ڕۆژێکدا دەگەنە گەرمێنێ، لە بازفتەوە تێدەپەڕن و بە چیای تارازدا دەڕۆن، لەو گەرمەسێرەدا ئامووری کوێستانی بەکار دێنن، بەڵام ئەو مۆریانەی دەگەنە ئەندیکا، لەوێ کەڵك لە ئامووری دووقۆڵی گەرمێنی وەردەگرن. وردە وردە ئەم پرسین و پشکنینە ماندووی کردین. لەگەڵ زەردە پەڕ هاتینەوە بۆ ماڵێ ، هیلاك و ماندوو خێرا خەوتین. هەڵبەت ڕیخۆڵەکوێرەم ژانی دەکرد و زۆریش نیگەرانی کردبووم. دڵم لە خێڵەوە دەهات.

## شەمە ١٣ی جۆزەردان

هەر وەك هەمیشە بەر لە گزنگی بەیان وەئاگا هاتم، بە دوای كارگەلی پێویستدا هەوڵم دا بخەومەوە نەكرا، چەند جگەرەیەكم كێشا، ئەوسا هاوڕێیان لە پاڵ بووكی خەو هاتنە دەرێ. خاوخێزانی بەڕێز فەرامەرزی بە ورد و درشتەوە خەریكی دابینكردنی تەپاڵە و ئاوردووی زستان بوون. نان و ماستیان بۆ ئێمەش هێنابوو. چووینە دەرێ، تایەفەی حەمۆلە بەرەو هەوار دەڕۆیشتن. هەتا ئەوان بە مەڕ و ماڵاتەوە كۆتاییان نەهات لە شوێنی خۆمان جووڵەمان نەكرد. لە بازاڕی چلگرد تووشی غوەڵاخواستیگەل هاتین وشترەكانیان ییخ دابوو، ئەو كەلوپەلەی كڕیبوویان خەریكی باركردنی بوون. قەند و چایی و ئارد و... خێوەتەكانیش لە وشتر بار كرابوون. تەواوی غوەڵاخواستی باڵاپۆشیان لە بەردا بوو، بە فارسی قسەیان دەكرد و شێوەزاری خۆیانی پێوە دیاربوو. ١٣ حوشتری باركراو. دەیانگوت وشتر بە ییخدراوی دەتوانی ٧٠ مەنی لێ بار بكەی، بەسەر پێوە ١٠٠ مەن. غوەڵاخواستی لە داوێنی كێوەزەرد بوون، خێزانەكەیان لە ئەسفەهانەوە هاتبوونە غوەڵاخواست و لەوێشەوە گەیبوونە چلگرد. غوەڵاخواستییش لە كێوە زەردەوە هاتبوونە چلگرد، جگە لەوەی پێداویستیی ماڵ بكڕن، ژن و منداڵیشیان لەگەڵ خۆیاندا ببەنەوە.

لە دووكانێكی چلگردی لە تەك چەند بەختیاریدا دانیشتین. ئەوانە ئاژەڵدارێكی بەناوبانگی بەختیاری بوون. تەواوی پێداویستیی ژیانی خۆیان لەو دووكانە دەكڕن و حەساوكتاویان لەگەڵ ئەم دووكاندارەیە. لەگەڵیاندا كەوتینە گفتولفت و سەبارەت بە ئاژەڵداری و باری ئابووری دوواندمانن. بۆ ئەوەی لەگەڵ نووسراوەكانی پێشوودا پێكیان بگرین. ئەوان پەنیریان دەگرت و، گوتیان لە ١٠ كیلۆ شیری مەڕ چوار كیلۆ پەنیر دەگرن. ئەگەر شیری مەڕ و مانگا تێكەڵ بكرێت دەتوانن پێنج كیلۆ پەنیر بگرن، بەڵام ئەگەر تەنیا شیری مانگا بێت، لە دە كیلۆ شیر چوار كیلۆ پەنیر بەرهەم دێت. لە دە كیلۆ شیری بزن چوار كیلۆ پەنیر دەست دەكەوێ. لە دە كیلۆ ماستی مەڕ و مانگا دوو كیلۆ ڕۆنەكەرە بەرهەم دێت. بۆ دە كیلۆ ماست دوو كیلۆ ئاو دەكەنە مەشكەوە. دە كیلۆ دۆ و دوو كیلۆ كەرە، ئەو دە كیلۆ دۆیەش دەكوڵێنن نێزیكەی دوو مەن كەشكی لێ بەرهەم دێت. دواتر

تیژاوەکەش هێندە دەکولێنن تا ڕەش هەڵدەگەڕێ، پێی دەڵێن قەرەقرووت. لەو قەرەقرووتە دەکەنە خواردنەوە بۆ مەزەی ترشی و لابردنی سەفرا و تواندنەوەی چەوریی لەش، هەروەك گوتیان بۆ ڕەنگرێسی خوری و بەرگن کەڵکی لێ وەردەگرن. ـــــ دەبێ بزانین چۆن ئەو کارە دەکەن ـــــ مەڕدارەکان بەختیاری نین، لۆرکاوەکەش تێکەڵ بە ئاردەتوو دەکەن و شەکری لێ دەدەن، بەمەش خواردنێکی خۆش دروست دەکەن و پێی دەڵێن «قارابشکەن» مەڕدارەکان بۆ ۳۰ سەر مەڕ بەرانێك ڕادەگرن. لە سەد سەر مەڕ ڕەنگە کەم و زۆر دە سەریان دووانەی ببێت. لەم کەرتە مەڕەدا هەیە ئەگەر دە سەریش بەرانی بەر نەکەوێ و قسر دەربچن. بە پێی ئەم ئەژمارەیە لە سەد سەر مەڕ سەد بەرخۆلە لە دایك دەبن، ڕەنگە ٥٠ بەرخیان مێو بن. شوانەش بۆ لەوەڕاندنی ئەو سەد سەرە مەڕە دە بەرخی نێر وەردەگرێت. لەو سەت سەرە مەڕەش دە سەر دادەنێن بۆ مردن و گورگ و نەخۆشی و ۹۰ سەر دەمێنێتەوە. شەکە مێوەکانیش دەمێننەوە و کاوڕی ٥ مانگەش دەفرۆشن. واتە لە پاش زەرەد و زیان، چل سەر کاوڕی نێر بۆ مەڕدار دەمێنێتەوە نرخی سەرێك کاوڕە نێر دەبێتە ۱۲۰۰ قڕان، لە دوای فرۆشتن بۆ هەر بەرخێك ۱٥۰ بەراتی شوان وەلادەنێن. مەڕێك لەساڵدا نێزیکەی ٦۰ قڕان هەقی دەوا و دەرمانییەتی. ئەگەر ساڵەکەی ناخۆش و کەم لەوەڕ بێت بۆ هەر سەرێك مەڕ ۳۰ قڕان خەرج لە بەرچاو دەگرن. نابێ ئەمەش لە بیر بکەین لەو سەد سەرە مەڕە، دە سەری وە بەر شوان کەوتووە و دە سەری مردووە و ۸۰ سەر ماوەتەوە. ئەگەر بێت و هەر مەڕێك ۱/٥ خوری ببێ، لەو ڕێکەوتەدا نرخی یەك کیلۆ خوری ۷۰ قڕان مەزندە دەکرێت، بۆ مەڕێك نێزیکەی ۱۰۰ قڕان لە بەرچاو گیراوە. ئەو ۸۰ سەر مەڕە دەکاتە ۸۰۰۰ قڕان. ئەگەر کاوڕی قەڵەو بە قیمەتی ۱۲۰۰ قڕان بفرۆشن، ئەوا ئازادی دەکەن زۆرتر شیری دایکی بمژێت. لە پاش ماوەی ئەو شیرەش بۆ هەر مەڕێك نێزیکەی ٥۰ قڕان دەچێتە سەر داهاتی ساڵیانە. بەرخەکانیش لە ۱۳ی جۆزەردانەوە لەشیر دەگرنەوە و هاوێریان دەکەن. نرخی بزنێك نیوەی کاوڕێکە. بەهرەیەکی زۆریش لە شیری بزن وەردەگرن. هەر لە سەرەتاوە ئەوان ئەدۆشن. کاژیلە بەبێ شیریش دەحاوێتەوە. بزنێك نێزیکەی نیو کیلۆ مووی هەیە. ئەویش کیلۆی ۹۰ قڕانە. سەد سەر بزن نێزیکەی ٥۰ کیلۆ مووی هەیە. ئەویش ئەگەر لازم بوو دەیبڕنەوە. وتیان ئەگەر ماڵێکی ٥ کەسی، ژن و مێرد لەگەڵ سێ منداڵ، سەد سەر مەڕ و ٥۰ سەر بزنیان هەبێ

دەکەونە ژیانێکی تێروتەسەلەوە. ٢٥ سەر مەڕ لەگەڵ ٢٥ سەر بزنماڵێکی هەژار کۆ دەکاتەوە. لەوەش کەمتر دەبێ بە هیچ. ئەگەر ماڵێك خودان ٥ مانگا و جوانەگایەك بێت و ٣٠ مەن زەوی (بەرانبەر بەرەجووتێکە) لە خوزستان و ٥٠ مەن زەوی لە کوێستان (ئەویش بەرانبەری بەرە جووتێکە)، بە بێ ئەوەی ئاژەڵی وردەی هەبێ ژیانی باش بەڕێوە دەچێت. ئەگەر کەسێك بەرە جووتێکی لە گەرمێن و هەر ئەوندەشی لە کوێستانێ هەبێ و ٨٠ مەن تۆوی پێوە بکات، بەمەرجێ ئەو دوو شوێنە بیگرێ زۆر باش پێی بەڕێ دەچێت، ئەگەر هەر یەکیان بیگرێت ژیانی دەگوزەرێ. هەر ساڵێك کشتوکاڵ باش بێ، لە گەرمێن یەك بە دە دەیگرێت، لە کوێستانیش یەك و پێنج. هەر ئەوەندەمان زانی بەختیارییەکان لە دەورەمان کۆزیلکەیان بەستووە، حەز دەکەن باسی وەرزێڕی و کشتوکاڵیان بۆ بکەین. ئێمەش بۆ زانیاریمان حەزمان بەم جڤات و کۆڕانە هەبوو. ئیتر ئەوەی وتیان، ئێمەش نووسیمانەوە. بەرەجووتێکی گەرمێن، دێم بێت نەك بەراو نێزیکەی ٩ هێکتارە، ئەگەر تۆوەکە تەنك بچێنن دەبێتە ١٠ هێکتار. لە کوێستانێ، زۆرتر لە چلگرد دە هێکتار زەوی دێمی سەد مەن گەنمی پێوە دەکەن، بەڵام لە زەوی بەراو لە هەردوو هێکتاردا سەد مەن تۆو دەچێنن. یەکەی تاقیکاری بۆ بەراو، دانگ دێتە ئەژمار. هەر سەرچاوەیەك سەربەخۆ بێت، شەش دانگە، هەر شەش دانگێکیش بە ٩٦ جۆ دابەش دەکرێت. زەوی هاوینەهەوار زۆرتر بە دانگ و جۆ ئەژمار دەکەن، زەوی گەرمێنی بە بەرەجووت. لە چلگرد، بۆ هەر «جۆ»یەك زەوی، نێزیکەی ٢٥ مەنی ئەژمار دەکەن و هەڵبەت زەوی تا زەوی جیاوازیان هەیە. مەنی گەرمێنێ ٧ کیلۆیە و مەنی کوێستانێ ٦ کیلۆیە. مەنێك گەنم لە خوزستان، دەیکەن بە هەزار مەتری چوار گۆشەوە، ئەوەندە گەنمە لە شوێنە ساردەکان بە ٩٠٠ مەتر زەوییەوە. دەشتیان بۆ ڕاگرتنی گەنم لە کۆیی ئەو بۆ هەر ٥٠ مەن، دە مەن وەردەگرێ. وەرزێڕ لە پێنج بەش بەشێك و خەرجییەکەشی جگە لە قەند و چایی و ڕۆن و بەرگ، نێزیکەی ٣٠ مەن دەکەوێت. ئەو وەرزێڕە دەبێ زەوییەکە بدوورێتەوە، گێرە و کێشەی بکات، لەپاش شەن و کەوکردن بەشێك بۆ خۆی، چوار بەش بۆ خاوەن موڵك دادەنێت. لە خوزستان بەهەر بەرەجووتێك دوو وەرزێڕ دەگرن، لە ماوەی ٢٥ ڕۆژدا ٥٠ مەن زەوی دەکێڵن و دای دەچێنن، ١٠٠ تمەن کرێ وەردەگرن لەگەڵ خواردنی خۆیان. ئەگەر وەرزێڕ نان لە خودان زەوی نەستێنێ بۆ مانگێك ٧/٥ تەنەکە ئارد

وەردەگرێت. لە تایەفەی بابادی ئەگەر کەسێك پێویستیی بە زەوی و زاری پتر هەبێ، ئەگەر کەسێك ڕوویی لێ بنێ و داوای زەوی لێ بکات، خاوەن موڵك زەوی دەداتێ و هیچی لێ وەرناگرێت. چەند نموونەیەکی ئاوامان دیتووە. کەچی بامدییەکان بۆ کارێکی ئاوا لە خوزستان مەنی ٢ تمەن وەردەگرن. لە خوزستان زۆرینەی زەوییەکانیان دێمە، ئەگەر جووتیارێك گاجووتی خۆی بدا بە خاوەن موڵك، بۆ کاروباری کێڵان، جگە لە یەك بەش لە پێنج بەشەکە ئەوەی دەمێنێتەوە لە نێوەڕاستەوە بەشی دەکات و بەشێك لە و چواربەشەی ماوەتەوە لەبری هەقی گاجووتەکەی وەری دەگرێت. ئەو بەشە وەبەر ئەوکەسە دەکەوێت گاجووتەکەی ناوەتە ئیختیاری خاوەن موڵك. ئەگەر هەردوو گاجووتەکە هی کەسێکی دیکەبێت، گەنمەکە لە دوای خەرمانە سووران لە پێنج بەش بەشێکی وەبەر جووتیار دەکەوێت و بەشێکیش لە و چوار بەشەی ماوەتەوە خاوەنی گاکان دەیبات. ئیتر وەڕەز بووم لە ژمێرەیی گاگەل و بڕستم لێبرا. برسێتی هەرئەندەی مابوو بەلامدا بخات. وردە وردە کۆتاییمان بە کارهێنا. دیگار بەسەر لەقاندنێك وتی خراپ نەبوو، بەڕاستی زۆر باش بوو زانیاریمان چووەسەرێ و ئیتر نازانم دوای ئەوهەمووزەحمەتە چیمان دەست دەکەوێت؟ نانی نیوەڕۆمان لەماڵی پەرویزی ماست و برنج بوو. هاتینەوە بۆماڵەکەی خۆمان بگرەو بتوانین کەمەکێك کارەکانمان ڕاستە و پاستە بکەین. بە دیگارم وت ئەگەر خێزانێکی پێنج کەسی ببێنین، بزانین خەرج و داهاتیان چەندەیە، زۆر باش دەبێت. ئەم هزرەی پێ خراپ نەبوو، دوای نیوەڕۆ سەردانی خێوەتی ڕەوەندێکمان کرد پێشتر دەمان ناسین.

خێزانێك ٥ کەسن. ژن و پیاوێك و سێ منداڵ، دوویان دەچنە قوتابخانەی عەشایری. ١٠٠ سەر مەڕیان هەیە و ٥٠ مەن زەوی. دەیانگوت لە ڕۆژدا کەموزۆر ٤٠ قڕان دەدەن بە قەند و چایی، ڕۆژی نێزیکەی ١٥ قران پارەی پیاز و سێوە بن عەرزیلە ئەدەن. لەساڵدا خەرجی جلوبەرگ لەبەرئەوەی ژن زۆرتری دەوێ و پیاو کەمتر منداڵیش هەروا، ئەوان نەفەری ٢٠٠ قڕان و جلی ئەو ٥ کەسە لە ساڵدا ١٠٠٠ تمەن. پارەی دکتۆر و دەرمان بۆ ساڵێك ٣٠٠ تمەن. خەرجی خوێندنی دوو منداڵەکە بۆ ساڵێك ٦٠٠ تمەن. ساڵی ٤٠٠ تمەن بۆ خەرجی ئەملاو ئەولا، وەکو نۆژەنکردنەوەی نیر و ئاموور، هەڵبڕینەوەی مشار، دەمەزەردکردنەوەی تەور و تەشوێ، ساز کردنەوەی لەنتەر و چراتۆڕ. مزەی لێکردنی گەنم لە ئاشی بۆ مەنێك گەنم ٢/٥ قڕان لە ڕۆژدا ئەو خێزانە

نێزیکەی ٦ کیلۆ نان دەخۆن. لە ساڵدا ڕەنگە ١٥ سەر ئاژەڵ بۆ خواردنی خۆیان سەر ببڕن. (هەڵبەت ئەوە جگە لە میوانداری، ئەو ئاژەڵانەش زۆرتر نەخۆشن، لەڕ و پیرن). لەوە زۆرترمان دەست نەکەوت. لەبەرئەوەی هەردەم پرسینەکانمان ناڕاستەوخۆیە و لەنێو وتەکانی ئەواندا دەگەین بە ئامانجی خۆمان، بۆ ئەوەی بە وردی هەموو شت بنووسینەوە کاتێکی زۆری دەوێ.

لەگەڵ دیگار پیاسەمان دەکرد و گفت و لفتمان گەرم بوو. دیگار دەیگوت وەرزێڕی لە مەڵبەندی بەختیاریدا تەنیا تایبەتە بە لادێکان، ئەویش هەر یەکە و خاوەنی خۆی هەیە. دەبێ هۆی ئەمەش بزانین. دەکرێ بێژین سەبارەت بە خاوەنی تاکی لەسەر زەوییەکان و چۆن سازبوونی گوندەکان لە ناوچەی کوێستانی بەختیاری جارێ ئاگەداری ئەوتۆمان نییە. بەدەم ڕاوێچکە کردنەوە گەیشتینە جێیەك ١٦١ سەر کاوڕیان دەبرد بۆ شاریکورد. بەرە و چلگرد دەهاتینەوە دیمەنێك سەرنجی بردین، پیرێژنێك خەریکی تەشی ڕستن بوو، بەڵام بەشێوەیەکی تایبەت. نینۆکی قامکی ئاماژەی دەستی چەپی کون کردبوو بەوێدا هەوداکەی بردبووە دەرێ و تەشییەکەی دەخولاندەوە، بەنەکەش بەهاوسەنگی بادەدرا. تا بڵێی ناسك و زەریف. گوتمان ئەو هەودا باریکە بۆچی دەبێ؟ گوتی: بۆ چۆخە چنین. ئەمە پۆیی تێوەدانە. تارەکانیشی بەدەزووی لۆکە ڕایەڵ دەکەن و چۆخەی ئەم مەرەزە زۆر بەنامیە. کێشی ئەوە ناگاتە کیلۆ و نیوێك، بەڵام نرخی زۆرە، نێزیکەی ٣٥٠ تمەن پارەی پێ دەدرێت. خوا حافیزیمان لە داپیرە کرد، هەروا بەدەم ڕێگەوە بووین بەرێز پەرویزی بانگی کردین. لەگەڵ تووشماڵێك خەریکی قسەکردن بوو. پەرویزی گوتی ئەو تووشماڵانە لە تیرەی بەختیارین و دەچنەوە سەر تایەفەی بابا ئەحمەدی (بامدی). «بابا ئەحمەد» وەجاخ زادەیە قسنەکەی لە خوزستانە، لە شەش فرسەخی لالی و لەدۆڵی بابا ئەحمەد دایە. بنەچەکی ئەو تووشماڵانە کەڕەناچی ئەو ئیمام زادەیەبوون و تایەفەی بابا ئەحمەدی دەڵێن بابا ئەحمەد باپیرە گەورەی ئەوان بووە. ئێستەش تیرەیەکی بچووك لە تایەفەی بابائەحمەد بەناوی «دەروێش ئادەمی» لە ناوچەی بازفت ماون، منداڵی ڕاستەقینەی بابا ئەحمەدن. ئەو تووشماڵانە هەر لە سەرەتاوە بەخشراون و ماڵاتیان بەکەس نەداوە. بەختیاریگەل نە ژنیان پێ دەدەن، نە ژنیان لێ دەخوازن. بە گشتیی پێشتر هەموو کار و کەسپێکیان پێ شوورەیی بوو، لەگەڵ هیچ کاسێك

خزمایەتیان نەدەکرد. هەربۆیە لەگەڵ گیوەچن و کڵاوچی و ئاسنگەران تێکەڵ نابن. پەرویزی گوتی نانی نیوەڕۆتان خواردووە؟ هێندە سەرقاڵ بووین لەبیرمان چووبوو نانی نیوەڕۆ بخۆین.

نان و پەنیرمان خوارد و لە بازاڕی چلگردەوە کەوتینە ڕێ، گێلاسمان کڕی و لەگەڵ پەرویزی خۆمان گەیاندە گۆڕستان لە سەروی ئاوایی. پەیکەرەی شێرێکی بەردین لەسەر گۆڕێك بوو، لەشانێکی وێنەی شمشێر و حەوت تیر و مەتاڵ و خەنجەرێك، لەو شانی دیکەی وێنەی ئەسپ و زین و بەرگ، جوانووە کەشی لەگەڵ بوو. لەسەر گۆڕەکە مێژووی جەمادی دووەمی ساڵی ١٣٢٥ نووسرابوو. بەرەو ژوورتر هەڵکشاین لەسەر گۆڕێك دانیشتین، ملمان نا لە گێلاس خواردن و قسەکردن. هەر وەك دیگار وتی باسێکی تێئۆریکی. دیگار دەیگوت کۆچی بەختیارییەکان لە ٧٠٠ ساڵ لەمەوبەر دەستی پێکردووە، واتە لە دەورەی مەغولەکانەوە دەستی پێکردووە. لە مونتەخەب و مێژووەکانی موعەینیدا هاتووە کە لە سەردەمی مەغۆلدا نووسراوە و باس کراوە، لووڕی گەورە بەهۆی هێرشی مەغۆلانەوە پەرەوازەی کەژ و کێو بوون، باس کراوە تەواوی چادرنشینانی دەشتی وشتریان هەیە. لە دەورەی عومەرەوە، وەختێ هەڵمەتی هێنا و ئەوانی گرت، ئەو وڵاتانەی پێملی فەرمانی عومەر بوون بەدەستووری ئەو لە دەشت و سەحرا وشتریان ڕاگرت و خێوەتیان لە دەشتەکاندا هەڵدا. بەهۆی ئەوەی وشتر ناتوانێ بە چیادا بڕوات ئەو تایەفانەی کەوتبوونە بەر پەلاماری مەغۆلان، مەغۆلیش ئەسپسوار بوون و لە چیاکان هیچ باکیان نەبوو، ئەوسا ئەوانەی ڕادەستی مەغۆلان بوون، لە چیاکاندا چادریان هەڵدا. پەرویزی وەك فەیلەسووفێك سەری بۆ دەلەقاندین. گوتی ڕەنگە هەروا بووبێت. باسکرا لە دەورەی نادر شای هەوشاردا، ئەو شایە دووجار تایەفەی بەختیاری لەگەڵ خۆی بردووە بۆ ئەفغانستان و کشمیر، ئێستەش دەستەیەك هەر لەوێ ماون. تاقمێکیش لە باکوری ڕۆژهەڵات دەژین. پرسیار و وەڵامی جۆراوجۆر دەهاتە گۆڕێ، بۆ نموونە ئا خۆم بەختیاریگەل لەمانگی موحەڕەمدا خەریکی تازیەباری دەبن؟ پەرویزی گوتی نا، جگە لەوەی تازیەبار نابن نەوحەخوێنی نازانن. سەردانێکی بیناکانی ژینگەپارێزیمان کرد، خانوویەکی گەورەبوو. خەرجێکی زۆری لێکراوە و گەرماو و وان و ئاوی گەرم ئامادەیە، بیناکە دیمەنێکی جوانی هەیە و وەك ئاوێنەی بووکێ هێشتا غەوری نەگرتووە، بەڵام سەرمای کوهڕەنگ هەرەسی پێ هێناوە.

بەرەو خوار شۆڕ بووینەوە و ماڵئاواییمان لە پەرویزی کرد. لەگەڵ ئاسنگەری غەوارە تەوقەمان کرد و پێکەوە دانیشتین. چەندێك دەستمان لە دەست کردەکانی وەردا و بەڵێنمان پێدا ڕۆژێکی دیکە بچینەوە بۆ لایی. دیسان بە دووکانەکانی چلگرد داگەڕاین، چاومان کەوت بە «دوودەستبەند» ئەمەش بۆبەستنەوەی هەردوودستی هێستر بەکاری دەهێنن. دوو دەستە وانەیان لە زنجیرێك خستووە، دەستەوانەکان هەریەکەی دەکەنە دەستێکی یەك سمەکەوە و قفلی دەکەن. وەختێ هێستر ئەم پێوەندەی بە دەستەوە بێت لە سەرەخۆ دەڕواو دەلەوەڕێت، بەکەیفی خۆی دەلەوەڕێت، نەدەتوانێ غار بدا، نەدزیش دەیڕفێنێ.

ورده ورده بەرەو ماڵ بووینەوە پشوویەك بدەین، دواتر هاتینەوە بۆ چایخانە و کاتی شێوخواردن، دەمژمێر ٨/٥ شێومان کرد و گوێمان بۆ دەنگوباسی ڕادیۆ هەڵخست. دواتر گەڕاینەوە بۆماڵێ و لەگەڵ دیگار تا درەگانێك سەبارەت بە کارەکەمان گەلێك ڕاوێژمان کرد. بۆ من مامۆستایەکی دڵسۆز و سەیدایەکی وانەبێژە.

## یەکشەمە ١٤ی جۆزەردان

بەیانی لەسەر داب و نەریتی خۆم بە گزنگی خۆر لەخەو هەستام. دەوروبەری دەمژمێر شەشی بەیانی ژن و منداڵی فەرامەرزی خەریکی تەپاڵە پێژان بوون. دەمژمێر ٨ بۆ نان و چایی بەیانی چووینە قاوە خانەکە. غولام خواستی وشترەکانیان لەپشت چایخانە یخدابوو. هەر یەکە و کندرێکیان لە چۆك کردبوون، بۆ ئەوەی نەتوانن بەم لاو ئەولادا بڕۆن. بەم کندرەیان دەگوت «عەگاڵ» تیۆریەکەی دیگارم وەبیر کەوتەوە، عارەب و وشتر پێکەوە هاتوونەتە نێو ژیانی ڕەوەندی ئێرانییانەوە. سەبارەت بە واژەی ڕەشمە و هەوسار پرسیارمان کرد، وێدەچێ دواتر بەکارمان بێت.

بە جەهازی وشتریان دەگوت «جائاز» و بە کۆپارە و دووگی سەرپشتی «گوش» بە هەردوو داری لاگیرەی وشتریان دەگوت «بەغەڵ جەهاز» لەشوێنی خۆمان ئارامان گرت تاکو غولام خواستی گەل کەلوپەلی خۆیان بەتایبەت ئەو مەنجەڵە گەورانە، لە وشترەکان بارکرد. ئەوانەیان بۆ شیر تێدا کولاندن دەویست. باریان بارکرد، وەڕێ کەوتن. ئێمەش خۆمان گەیاندە تاوڵی ئاسنگەر. زۆریان بەخێر هێنایین، ویستمان وێنەیان بگرین،

ڕێگەیان پێ نەداین، بەڵام پیاوێك وتی: چونکە زۆر دۆستین ڕێگە دەدەم وێنەم بگریت. تا ئێستە زۆر کەس ویستوویانە وێنەمان بگرن، نەمان هێشتووە. خێوەتەکەیان بە تەلیس و گوونی ساز کردبوو. کەلوپەلی ئاسنگەری لەدەم دەرگەکە بوو، هەر وەکو سندان و کورە و کوتك و ئاسنەواڵە. کورەی ئاسنگەری دوو ساڵ پێشتر بە هەمبانە و دەماندن کاری دەکرد، ئێستە باوەشێنی بۆ داناوە ، بەدەست دەیخولێنێتەوە و خەڵووزەکە دەگەشێتەوە. جاران ژنەکەی کورە دەمێن بوو. سندانێکی کورتی هەبوو، بنی لەسەر کۆتەرە دارێك دابەستبوو. لە تەنیشتی ڕاستی کورەکەبوو. ئامرازی دەستی برێتی بوون لە: مقاشێکی بەردەست، مقاشی نووك خوار، مقاشی ئاودانەوە، چەکووش و چەند قەڵەمێکی ئاسن. بەو شتانە، مقاش و گاسنی جووت، شیشی گڵ تێك وەردان، داس و قوولاپی ساز دەکرد. بەختیاریگەل تەواوی ئەم شتانەیان پێویستە، خێزانەکەی خەڵکی مەزگەوتی سولێمان بوو خۆیشی خەڵکی مالمیر، بەڵام دەیگوت ئێمە لە شیرازەوە هاتووین. تایەفەیەکی ناوبەدەرەوەین و لە خوزستان گیرساوینەتەوە. تەنیا هاوینان لەگەڵ هەوار چیان دێینە ئێرە. سەرەڕای کارکردن سەیر و گەشتیاری دەکەین. لە گەرمێنەوە تێکەڵ بە ڕەوەندان دەبین و لە گەڕانەوەشدا بەسواری ترۆمبێل دەگەڕێینەوە. جگە لەچایی قاوتیان بۆ داناین. دوو منداڵیان هەبوو، یەکیان پێنج ساڵە و ئەوی دیکەیان چوار مانگانە، زەردەڵ و داڵ گۆشت! گوتی: شەوی ڕابردوو گۆڕمان بۆ هەڵکەندووە، لە ئان و ساتدا بوو، دکتۆر دەرزی لێدا و چاك بۆوە. خێزانی شیری نییە بیداتێ، دەیگوت شیرەکەم منداڵە گەورەکەم دەیخوات. کابرا بە شانازییەوە دەیگوت: ئێمەی غەوارە تا ئێستە چەند ژنمان لە بەختیاریگەل خواستووە، بەڵام ژنمان پێنەداون. ژنە هەر بۆڵە بۆڵی بوو«ئێستە کە وێنەتان گرتووە دەست خۆشانەمان بدەنێ» پیاوەکەی لێی تووڕە بوو گوتی، شۆخی دەکات. ژنە بێدەنگ بوو. لەو حەلەدا چاومان بە گوێرێژێك کەوت خوێیان لێ بار کردبوو. لە کابرای کەردارمان پرسی لە کوێوە دێی؟ گوتی: لە خوار دێوە، لەسەر ڕێگەی فارسان، بەم بەردە خوێیەیان دەگوت «ئارا» بۆ هەر ئارایەك ١٢ قڕانیان لە دووکاندار وەردەگرت، ئەوانیش بە ١٤ قڕان بە کڕیارەکان دەیان فرۆشتەوە. کەردار پەلەی بوو ڕانەوەستا. جاری کارێکمان بە ئاسنگەر نەمابوو.

چووینە سەر تەپکەکە و لەو سەرەوە تەماشای چلگردمان کرد. زۆر بچووك. چەند بینایەکی دەوڵەتی، بەشی پۆست و تەلەگراف، (تەنیا کاری نامە وەرگرتنە) و دەرمانگە، (دکتۆر سوڵتانی لەوێیە، دوو ساڵ لەوە پێش لە چادرەکەی جەعفەرقوولی چاوم پێی کەوت) قوتابخانەکەش زووتر باسم کردووە، بینای ئاویاری لەپشت دار و درەختەکە خۆی شاردۆتەوە. ئەوانی دیکەش خانووی خشت و قوڕن سەربانیان دار و هەڵاشە. هەشیانە لە بەردی نەتاشراو سازکراون. دوو شەقامی پێدا کێشراوە. زۆریش ڕێك و لەبار نین، شەقامێکیان هەردوو بەری دووکان و بازاڕە و ئەوی دیکەش بەڕێکی دووکانە و بەڕێکیشی دەچێتەوە سەر گاراژی مووسافیری شاریکورد و شێخ عەلیخان و ئاشی ئاوری و دوو چایخانەکە. هاتینەوە خوارێ و بەبێ ئەوەی ئیشتیامان لێ بێت نانی نیوەڕۆمان خوارد و چووینەوە بۆماڵێ. هاوڕێکانم خەوتن و منیش چووم بەلای شیو و کوڵەوە. زۆر ماندووبووم ڕاکشام. هێشتا دەنگی زەنگ و زەنگوڵەی نێری و بەران دەهاتە بەرگوێ و لە قەدپاڵ و سەر تەپۆڵکەکان دەلەوەڕان. دەنگی گۆرانی شوانێك تێکەڵ بە شنۆی کەژ و کێو دڵی دەلاواندەوە و زاخاوی مێشکی دەدا. دەستم کرد بەخوێندنەوە. شاناز چوو بوو بۆ لای ژنانی بەختیاریی کاتێك گەڕایەوە زۆر بێزار بوو. زریکاندی: بەراستی ژنانی بەختیاریی قوڕ بەسەرن، ئەو پیاوانە تەنیا ژنیان بۆ لێدان و پێدادان هێناوە. ژنێك بە شانازی گوتبوو: «١٤ ساڵان بووم، مێردم کرد بە پیاوێکی ٣٠ ساڵە، وەختی مارەبڕین لەبەرئەوەی تەمەنم کەم بوو بە بەرتیل کارەکە سەری گرت. کە گوتمە ماڵێك حەوت هێوەرژنم هەبوو. خەسووی بێ ڕووحم بەبێ ئەوەی پشوو بدەین شەو و ڕۆژ کاری پێدەکردین. شەوێك بە کوندەوە لە کانی دەگەڕامەوە لاقم خزی و لە کێوەکەوە بەربوومەوە. کە گوتم بە گابەردێکدا و منداڵی پێنج مانگانەم لەبارچوو. ڕۆژێك بەدەستووری خەسووم خەریکی گوێنی هێنان بووین، ئەمجاریش منداڵی چوار مانگەم لەسەر توونێلی کوهرەنگ لەبارچوو. بۆ سێیەم کەڕەت زگم پڕ بوو، ڕۆژێك نەخۆش و بێ واز مێردەکەم بیانووی پێگرتم و لێی دام، دیسان منداڵم لەبارچوو. لەسەر چوارەم زگم ژنی خزم و کەسوکار کۆبوونەوە و هەڕەشەیان لە پیاوەکەم کرد: ئەگەر ئەو ژنە ئەمجارە منداڵی لەبار بچێت شکایەتت لێ دەکەین. شووەکەم ناچار بوو بۆ ماوەیەك لە نەخۆشخانەی ئەسفەهان بمخەوێنێت، دواتر چوومە کن شێخ و نووشتەی بەرگری لە

منداڵ خستنی پێدام، هەر ئەوە بووە هۆی ئەوەی منداڵەکەم بە سلامەت بێتە دنیا. ئێستەش زگم پڕە و لەگەڵ خێزان نەماوین و ماڵی جویمان هەیە». ماڵەکەیان لەپشت ماڵی خۆمانە و هەموو رۆژی مێردەکەی دەبینم درەنگانێك لە کرێکاری دەگەڕێتەوە.

دڵخۆشی شانازم داوە و وەڕێ کەوتین بۆ قاوەخانە لەوێ شێو بخۆین. هەوا زۆر سارد بووە، پێش ئەوەی شێو ئامادەبێت، بەڕێز ناوچەداری ئامادە بوو. نەختێك قسەمان کرد، بەستەزمانە گێرەی لە هەولێر دەگەڕا. دوای نان خواردن ئەسکەندەر وەژوور کەوت، نەختۆکەیەك باسی ڕابردووی بۆ کردین. دەیگوت: «لە رابودوودا زۆرجار شەڕە کەڵەباب و شەڕە بەران و شەڕە کەڵمان ساز دەکرد. ناوی خاوەنەکانیان لەسەر دادەنان. ڕامان دەهێنان بۆ شەڕکردن. (زۆر کەس گیسك و کاوڕی دەدۆڕاند). ئەو ئاژەڵەی دەبەزی واتای ئەوە بوو خاوەنەکەی بەزیوە. تۆرەمە و تایەفە بە دۆڕاو ناویان دەزڕا، تەنانەت ناخۆشی لێ دەکەوتەوە ئیتر ئەم شەڕە ئاژەڵەمان هەڵوەشاندەوە» باسی زەماوەند لە ئێلاتیدا هاتە گۆڕی و ڕفاندنی «تارای بووکی» بەدەستی جوانانی خزمی زاوا. نێزیکەی دوازدە سوار لە کەسوکاری بووك تا ماڵی زاوا هاوڕێیان دەکرد. وەختێ بووك دەگەیشتە سنووری زاوا، کوڕە لاوانی برازاوا هەوڵیان دەدا بەدەم تەقڵە و لینگدانەوە تارای سەری بووکێ بڕفێنن. سوارانی بنەماڵەی بووکیش بەرگریان لەم کارە دەکرد. لە ئاخریدا برا زاوایەك تۆڕی دەڕفاند و بە نیشانەی سەرکەوتن لەیاڵی ئەسپەکەی دەبەست. ئەوەش هێزی ورە و زیرەکی و مەردازایی ئەو کەسە دەردەخات کە ئەو کارەی کردووە، ئێستەش تا ڕادەیەك ماوە و کوێر نەبۆتەوە. ئەگەر کوڕە جەحێڵەیەك ئەوەندە ئازا بووایە تارای بووکێی لە مەودای نێوان ماڵی بابی بووکەوە تا ئەو شوێنەی دیاری دەکرا بڕفاندبایە ئەوە سووکایەتی کردن بوو بەبابی بووکێ. هەر بۆیە خزمانی بووك هەوڵیان دەدا هەر چۆنێك بێت دەستی خۆیان بوەشێنن و بیکوژن. ئەوسا لەنێوان ئەو دوو تایەفەدا دوژمنایەتی ساز دەبوو. شتی وا ڕوویی داوە و ئەو کەسەی ئەو کارەی کردووە هەڵاتووە و نەگەڕاوەتەوە. بۆ بەر گریکردن لەو کارە، زۆرجار وا بووە بابی بووکێ تاراکەی داوە بەبووك دوای ئەوەی لەو خەت و مەرزە چووە دەرێ تاراکەی بدا بەسەریدا، ئەوسا بەزمی سواران دەست پێبکات. ساڵی ٤٩ لەنێو بەختیاریگەلدا بووین، هەر بەو شێوەی نووسیومە لەنێو تایەفەی مول مولیل زەماوەند بوو. هەر

ئەوەندەمان زانی خەزووری زاوا، ڕوویی کردە سواران و بە دەنگێکی بەرز ڕایگەیاند، زۆر باش گوێتان لێ بێ، لەو کەوشەنەی دیاری کراوە یان ئەوبەری سنوور، کەس بۆی نییە تارای سەری بووك هەڵبگرێ. پیاو ماقووڵانی هۆزەکەش ئەو بڕیارەیان پەسند کرد و جاحێڵان کردیان بە گوڕە و هەرا، دواتر هەر هەموو لایەنێك پێملی ئەو دەستوورە بوون، بەڵام ئەوەی باسمان کرد ئێمە بەچاوی خۆمان نەمان بینی. وا دیارە ئەم نەریتە هەر لە کۆنەوە ئاوا هاتووە، بۆ سەردەمانێك دەگەڕێتەوە کە ژن لەنێو کۆمەڵگەدا چ لە بواری ئابووری، چ لە بارەی مەعنەوی، زۆری گرینگی پێدراوە و پارێزگاری باشیان لێکردووە. یان تایەفەیەکی دیکە هەوڵی ڕفاندنیان بۆد اوە. تا وردە وردە وەك نمادێك ئەم تارایە بۆ ڕفاندن و بەرگریکردن دانراوە. هەروەك لەنێو ئێلاتی کوردیش دیتوومە زاوا لەنێو سواراندا هەوڵ دەدا بووك لەسەر زین هەڵبگرێ و لە پاش کۆیی خۆی دانێ و بیڕفێنێ بۆ ماڵی خۆی. لە زۆر شوێنی کوردستان دیتوومە زاوا شووڵێك بەدەستەوە دەگرێت بەنێو سوارانی تایەفەی بووکێدا دێت و لە دەلیڤەیەکدا دەیکێشێ بە سەری بووکێدا، بەڵام سوارانی خزمی بووك بەرگری لەو کارە دەکەن. یان لە زۆر جێی ئێران بینیومە سوارانی ماڵی بووك هەوڵ دەدەن کڵاوی زاوا بڕفێنن، زاوا بەوریایی خۆی ڕێگەیان ناداتێ. ئەگەر بەبێ کڵاو بگەڕێتەوە ئەوا بۆ هەمیشە لەنێو خەڵکدا سەر نەوی دەبێ. شتێکی دیکەش کە بە چاوی خۆم دیتوومە کەڵەبابێك بەسەر بووکدا هەڵدەدەن، برا زاوا هەوڵ دەدا بەحەواوە بیگرنەوە لەو نێوەدا کەڵەبابی چارەڕەش هەر بە زیندوویی بەدەستیانەوە پچڕ پچڕ دەبێت. لە زۆر شوێنیش زاوا دەچێتە سەر دیوار یان سەربانێك سێو یان هەنار دەدا بەسەری بووکێدا. منیش ئەوانەم بۆ بەختیاریگەلی چایخانەکە باس دەکرد، ئەوانیش زۆریان حەز لێ بوو. کەم کەم کات وەدرەنگی کەوت و هاتینەوە بۆ ماڵێ و زوو خەومان لێ کەوت.

## دووشەمە ١٥ی جۆزەردان

هەروەك هەمیشە پێش ئەوەی بسکی زێڕینی کچی هەتاو بکەوێتە سەر شانی چیا و بەندەنان لەخەو هەستام. لە کاروباری خۆم بوومەوە و دەستم کرد بە ڕاستە و پاستەی یاداشتەکانم. چەند خولەکێك خۆم بە خوێندنەوە خەریك کرد، دواتر وەرەزی ڕووی تێکردم ملمنا لە گوڕە و هەرا، دیگار و شانازم لە خەو ڕاست کردەوە. وەڕێ کەوتین بۆ چایخانە و خواردنی بەیانیمان بوو بە هێلکە و ڕۆن. هەوالّمان زانی بەڕێز جەعفەرقوولی چووەتە فانیاوا. بەڕێز پەرویزی هات و گوتی «بنچاق»م هەیە و هی ١٦٠ سالّ لەوە پێشە، ئەمەش تایبەتە بە «کانی خانی» بۆ ئەوەی شارەزایی لەسەر تێکەلّی خزمایەتی ئەوان وەدەست بێنین، دیگار دەستی کرد بە کۆکردنەوەی شەجەرەی بنەمالّەی پەرویزی. ئەمەش کارێکی ئالّۆز بوو، هەتا بوو بە ١٢ی نیوەڕۆ وەختی گرتین. زۆرینەی پیاوەکان ژنێك تا حەوت ژنیان هێناوە. ئەو ژنانەی مێردیان کردووە و پیاوەکانیان بەختیاریی نەبووە. پەرویزی گوتی مندالّی ئەوانە نابێتە بەختیاری. هەر بۆیە ئەوەی ئێمە بینیمان ئامۆزا و خالّۆزا و پوورزا و...هتد، لەگەلّ یەکدی زەماوەندیان کردووە. بەهەر لایەکی شەجەرەکەدا دەچووینەوە دەچووەوە سەر ئەو قەومەوقیلەیە.

نانی نیوەڕۆمان خوارد و تاکو دەمژمێر ٥/٣٠ ئێمە سەرقالّی نووسین و یاداشتی پسوولّەکان بووین. دیسان ئەمجاریش سەردانێکی بازاڕمان کردەوە. لووتمان بە لووتی پیاوێکی مۆریدا تەقیەوە، قوولە پیاوێکی ڕاوێژ خۆشی زیرەك و خوێندەوار. زانیمان ناوی مەلا فەیزوڵا سادقییە. سەرۆك هۆزێکی بە ناوبانگی ئێلی مۆرییە. مەلا فەیزوڵا دەیگوت مەودای نێوان گەرمێن و کوێستان هەشت ڕۆژە. دەیگوت ئێمەش دوو جۆرە ئاموورمان هەیە، ئەو کەسەی ئەگەر تەنیا ڕۆژێك لە گەرمێنەوە دوور بێت دوو ئامووری هەیە. وتی مۆرییەکان سەرەڕای ئەو پرژ و بڵاوییەی هەیانە لە بازفت، بەسەر یەکەوە نێزیکەی ٦٠٠٠ بنەمالّەن. کێوە سپی مەودای نێوان گەرمێن و کوێستانی ئەوانە. هەر ئەو کوێستانەش هۆکارە، کە ئامووریيان لەوێ نەگەڕێت. دەیگوت، خانەکان لە مولّکی مۆریدا هیچ وەختێ زەوی و زاریان نەبووە. تەنیا بەشێکی بچووکیان هەبووە برنجیان لێ داچەندووە. مۆریگەل یازدە تیرەن. (ئەوەندەی مەلا فەزوڵا باسی

دەکات دەبێ لەگەڵ زانیاری پێشوو پێکی بگرین) هەرهەموویان لەسەر موڵکی بازفت دەژین، بەڵام تیرەکانی «کیارسی» وا لە بێهدار وەندن و «شێخ ڕبات» بەشێکن لە بابادی، «زولقی» بەشێکن لە «مەمی وەند» و «منجزی» و «دێهناش و فەرگونی» ئەوانیش بێهدار وەندن و «شەهنی» بابادین، بەهۆیی ئەوەی زەوی و زاریان کەوتۆتە بازفت، بوونەتە بەشێك لە بازفتی. ئەو موڵکانەش یان کڕیویانن یان بەمیرات پێیان گەیشتووە. لە یازدە تیرەی تایەفەی مۆری تیرەکانی «حەسەن وەند» ، «عەیدی وەند» «غێری وەند» و «ئور وەند» حاجی ئێلخانین. تیرەکانی «کەریم وەند» «عەبدە وەند» و قاسم عەلی وەند» ئێلخانین و تیرەکانی «عەلیجان وەند» «بوری» «گورداگونی» «کەمەر زێڕین» نیوەیان ئێلخانی و نیوەشیان حاجی ئێلخانین. تەواوی ڕەوەندانی هۆز و تایەفەی بەختیاریی بە ناوچەی مۆریدا ڕادەبرن. هیچ وەختێ تایەفەی مۆری بە کێوە زەرددا ناڕۆن. هاوینە هەواری مۆریەکان ناوچەی «راکە» «تلوەرد» «دێهناش» «تەبە ڕۆك» و «مۆرشا»یە گەرمێنیان زۆرتر لە «شیمبار» ، (شیرن بەهار) «چاڵ منار» تا «قەڵای زرڕاس» «سەرتەنگ دووڵاب» تا دەگاتە مزگەوتی سلێمان پرژو بڵاون. ئێستەش مۆریکان خاوەنی سێ کەڵانتەر یان سەرۆك هۆزن. یەکیان حاجی ئێلخانی و دووئێلخانی و نێزیکەی ٨٢٠ کوێخایان هەیە. مەلا فەیزوڵا دەیگوت ئەو سەرۆکانە دەیان توانی جێی خۆیان لەنێو ئێلدا بگۆڕنەوە. واتە ئەوانەی ئێلخانی بوون ببنە حاجی ئێخانی و لەبەرانبەردا سەرۆکێکی حاجی ئێلخانی ببێ بە ئێلخانی. وەختێ سەبارەت بە بنەچەکی خانەکان پرسیارم لە مەلافەیزوڵا کرد، گوتی: سەرەتا بابادی باب و دورکی باب بەیەکەوە بوون. بێهدار وەند و چوار لەنگ تێکەڵ بوون. لە بەرا دورکی گەل (ئاستەرکی) خانی بەختیاری بوون لەبەرئەوەی ئەو دەستەیە نێوان ناخۆشیان لە نێودا بوو، چوارلەنگان خانیان لە دورکی سەندەوە و بوون بەخان. دواتر بێهدار وەندەکاتن بوون بە خان. بە دوای ئەوانیشدا دسان دورکیان بوونەوە بە خان. منیش هەر ئەوەی ئەوان گوتوویانە نووسیمەوە. تاکو بزانین دواتر چی باشترمان دەست دەکەوێت. پرسیم: لێرە زەوی و زاری لەوەڕگە و کێڵگە چۆنە؟ ئاخۆم مالیك دەسەڵاتی بەسەر هەردوو بەشدا هەیە؟ گوتی: بۆ وێنە ڕۆڵەکانی سادقی کە دەبنە منداڵی ئێمە ئەو موڵکەی

پێیانە بنجاقی هەیە واتە قەباڵە و مۆری ئیمام قوولی خانی بەختیاریی (حاجی ئێلخانی). ئەو خانەش موڵکی بە سادق فرۆشتووە.

«بەشی یەکەم، ڕێژاوی ساچمەکان، تیرەگ بەتیرەگ تا دەگاتە تیرەگی بەفران بۆسەر (خێوەتی زران) لەویشەوە لابدا بۆ ڕێگەی تیژە، تیرەگ بە تیرەگ تا دەگاتە بەرزایی پەموە کاڵ و بەردە گەپی ڕۆژهەلات، تیرەگ بەتیرەگ بێتە سەر بەرزایی چاڵی مێشانە زەردە، تیرەگ بەتیرەگ بێتەوە بۆ دووشۆرانی ساچمە کان لە بەشی یەك. بۆلەوەڕی ئاژەڵان داماننا بە ٣٠ تمەن، دەتوانێ بیفرۆشێت، ماڵێك خۆی موختارە.

مۆری ئیمام قوولی خان بەختیاری - حاجی ئێلخانی ساڵی ١٢٧٩

ئەو زەوییە هەر ئێستە بۆ وەرگرتنی ڕێگەپێدانی لەوەڕ لە دەوڵەت لە نێوان ٦٠ بنەماڵەدا بەش کراوە. مەلا فەیزولاّ گوتی بنجاقی دیکەش لەنێوان منداڵی سادقیدا هەیە. ئوروەندەکانیش لەوەدا بەشیان هەیە. ئەم ڕووپەڕەش بەم شێوەیە هاتووە کەدەیخوێننەوە بۆ زەوی و زاری کێڵگە نووسراوە.

بەشی یەکەم لە ڕێگەی منارەوە سەر بکەوێ و بۆ تیرەگە شانی منارە، تیرەگ بەتیرەگ تادەگاتە قەڵای منارە بەناوی دلاّ، تیرەگ بە تیرەگ دەبێ بێتەوە بۆ پردی نگین شیرین بەهار، بێتەوە بۆ پەڕەی خان برنجەك، بگاتەوە سەر تیرەگە شانی یاوەر محەمەد، تیرەگ بەتیرەگ بێتە ڕێگەی سەرهونی، بچێتەوە سەر ڕێگەی خوارێ، لە حەوت دانگ، شەش دانگ، لە چیا، کێو لەوەڕ، ئابادە، خراپە، ناریاب، ئاشان، بەقیمەتی ٤٥ تمەن و ٢٠ مەن گەنم.

مۆری عەیمرادخانی چوار لینگ (عەلیمراد خانی گەورە) ١٢ مۆری دیکەش کە تایبەت بوون بە خانەکانی ئێل بەرێکەوتی ساڵی ١٠١١

ئەم بەشەش «میم زائی»گەلی چوارلەنگ لە ساداتی پیرشا، (ساداتی ئیمام ڕەزا) کڕیویانە و خانەکانیش لە بری خوێنی جەعفەرقوولی خان ئەو موڵکەیان بە زۆر لە میم زائییەکان سەندووە و دواتر بە مۆرییەکانیان فرۆشتووە. ئەم زەوییەش لە ناوچەی

بازفته. کاتمان زۆر وه پشت سەر خستبوو لەگەڵ مەلافەیزوڵا ئەوەی مابوو داماننا بۆ بەیانی. ماڵئاواییمان کرد و هاتینەوە ماڵێ و بە بێ مەحتەلبوون خەوتین.

## سێشەمە ١٦ی جۆزەردان

بەیانی لە پاش تەواوبوونی کاروباری تایبەت بە خۆمان، چووینەوە قاوەخانە. مەلا فەیزوڵا چاوەڕێی ئێمە بوو. دیسان هاتینەوە سەر خەت و بەرنامەی خۆمان. سەرەتا باس لەسەر نێر و ئامووری هاتە ئاراوە. زانیم مۆرییەکان لە «نێوان کێو»دا ئامووری یەکدەسکیان هەیە. ئامووری گەرمێنی مۆرییەکان «دارپازنی»یە و، بابادی پێی دەڵێن، ئامووری «بائی» یان بازوویی. مۆرییەکان بە گاسنی جووتی دەڵێن، «لەپەك» و بە گاسنی نووشتاوە دەڵێن، بۆشە. بە چەڵەمەی ملی گاجووتیش دەڵێن، «لەگون». لەمەڕ مالیکی زەوییەوە، مەلافەیزوڵا وتی، ئەگەر تەواوی خزمان بیانەوێ دەتوانن تەواوی لەوەڕگەکە بەپێی ئەو بنجاقەی هەیانە بیفرۆشن بە کەسێکی دیکە، بەڵام ئەگەر بێت و یەك کەس بیهەوێ ئەم کارە بکات دەبێ بیدا بە کەسەکانی خاوەن بەش. لە مەلافەیزوڵام پرسی، غوەڵامخواستی چۆنە دەتوانن مێگەلی خۆیان بکەنە لەوەڕگەی ئێوەوە؟ وتی: ئەوان لە دەورەی دەسەڵاتی خان و کەلانتەرانەوە بە پشتیوانی ئەوان ڕان و وشتری خۆیان لێرە بەخێو کردووە و بڕیارنامەیان لەگەڵ مۆر کردوون، بۆ وشترێك ٥٢ قڕان، بۆ سەرێك مەڕ ٢٥ قڕان کرێی لەوەڕ وەرگیراوە. لەو کاتەوە لەوەڕگەکان دەوڵەت پاوەنی کردوون، غوەڵام خواستیگەل بەپێی ئەو قەباڵەیەی پێشتر لە خانەکانیان وەرگرتووە، بۆیان بووە بە پێشینەیەکی باش ڕێگەپێدانی لەوەڕگەیان لە دەوڵەت وەرگرتووە. لە کاتی پاوەنکرانەکەدا بنجاقی ئەوانەی ئاژەڵیان نەبووە هەڵوەشاوەتەوە و بووە بە هێچ. ئەم ڕێگەپێدانەش دراوە بەو کەسانەی ئاژەڵداربوون و پێشتریش حەیوانی خۆیان تێدا بەخێو کردووە و ئێستەش بە دەست ئەوانەوەیە. ئێستەش لەوەڕ بۆ بزن و مەڕ هەر بەو ڕادەیە بەش دەکرێت کە پێشتر بۆ ئاژەڵیان دادەنا. واتە هەر بەو ئەندازەی لە بنجاقەکاندا هەبوو. ئەگەر کەسێك جاڕەکەی بەشی ١٥٠ سەر حەیوان بێت (لەسەر پێوانەی ئێستە بۆ حاوانەوەی لەوەڕگە) هەر ١٥٠کەی پێشووی دەدەنێ. ئەگەر زۆرتریشی هەبێ دەبێ بیفرۆشێ و نەیکاتە لەوەڕگەوە. ئاژەڵداران ئەمڕۆ ناچارن

بۆحاوانەوەی ڕانی خۆیان لەوەڕگە بە قەرز وەرگرن. دیگار خەریکی نووسین بوو سەبارەت بە خزمایەتی و منیش لەگەڵ پەرویزی ملمان نا لە قسەکردن. پەرویزی باسی چۆنییەتی باسەکەی من و مەلافیزولاّی کرد و گوتی: بنجاقی یەکەم وەختێ نووسیتەوە، تایبەتە بە مۆرییەکان، ئەوە شتێکی جیاوازە. لەبەرئەوەی مۆریگەل لەوەڕگەی کەمتریان بووە. چونکە منداڵی سادقی، برنجیان کێڵاوە و بەشە لەوەڕی ئاژەڵیان نەبووە. ئەو بەرەجووتەش تاق کەوتووەتەوە، وەك دەڵێن، بەشی کەسێك بووە بە ناوی حاجی قوولی محەمەد ئیبراهیم. بە قەولێکیش دەڵێن، بەشی حاجی خەسرەو هەمۆڵە بووە لە بەشی چوارلەنگ، خانەکانیش ئەو بەشە زەوییەیان بەو منداڵە بەخشیوە یان فرۆشتوویانە. منیش هەر ئەوەی باسی کرد نووسیمەوە. دیگار وا دیار بوو لەو شەجەرەیە چی وای دەست نەکەوت و بە ئاماژە گوتی، کۆتایی پێ بێنە. باسەکەمان گۆڕی و گوتمان با بچینە فانیاوا. خواحافیزیمان کرد. دیگار کاغەزەکانی دڕاند و گوتی تەواوی هەڵەیە.

سەرەنجام بڕیارمان دا بچین بۆ «لاهاشەك»، سەرووی فانیاوا، سەردانێکی جەعفەرقوولی بکەین. لە پەرویزیم پرسی، ئێستە شێوەی وەرگرتنی ڕێگەپێدانی لەوەڕگە چۆنە بۆ ئاژەڵداران؟ گوتی، کارناسان دێن و پلەبەندیی دەکەن، لەوەڕگەی پلە یەك، بۆ هەر هێکتارێك ٢ سەر مەڕ، لەوەڕگەی پلە دوو، بۆ هێکتارێك یەك مەڕ و، بۆ لەوەڕگەی پلە سێش، هەر دوو هێکتار یەك مەڕ مافی لەوەڕی هەیە. قەول وابوو شاناز بچێت میوانی خێزانی سەرکار ئوستوار بێت. ئێمەش بچێن بۆ لای جەعفەرقوولی و بگەڕێینەوە. هەوڵێکی زۆرمان دا ترۆمبێلێك دەست نەکەوت و ماشێنی ناوچەداری بەنزینی نەبوو. ئاخری سەرۆك پاسگە دەچوو بۆ نیاکان، ئێمەشی گەیاندە کەلی فانیاوا. نێزیکەی دەمژمێرێك بە پێیان وەسەر کەوتین، هەمووی چیخ و چادر و ڕەشماڵ بوو. مەڕ و ماڵات لە بژوێنێ دەلەوەڕان و لە گۆلاوان پاراو دەبوون. وردە وردە گەیشتینە ماڵی خان جەعفەرقوولی، هەموو سەرقاڵی مەڕبڕینەوە بوون. سەلاممان کرد و چووینە ڕەشماڵەکە دانیشتین. لەگەڵ بی بی ئێران و بی بی شەوکەت ئەحواڵپرسیمان کرد و تەوقەمان لەگەڵ ڕۆستەم خان کرد و دەستمان کرد بە قسەکردن. باسی ڕۆژانی ڕابردوومان هێنایەوە گۆڕێ و لە دۆستانمان پرسی. فرۆجێکیان کردبوو بە شیشەوە و لەسەر ئاورەکە دەیانبرژاند، خێرا خێرا دۆیان پێدا دەکرد. بۆ ئەوەی نەسووتێ و تەواو

بپیشێت. ئەمەش شێوازێکی مامربرژاندنە لەنێو گەلی بەختیاریدا. ئەوان نانی نیوەڕۆیان خواردبوو، من و دیگاریش خواردنی خۆمان تەواو کرد. چایی و جگەرە و دۆ حازر و ئامادە بوو، پیرەمێردێك لە چادرەکەدا دەستی کرد بە قسەکردن و تاریفاتی بەختیارییەکان. زوو زوو شیعرێکی لە فانی، شاعیری ناوچەی خۆیان دەخوێندەوە، لە چادرەکە هاتینە دەرێ و چووینە سەیری مەڕبڕینەوە. ڕەشماڵی میوانیان تێك دابوو، لە جێی ئەو ١٢ کەسە ١٢ برینگ بەدەست خەریکی مەڕبڕینەوە بوون. سێ کەس دەچون لەنێو ڕانەکەدا مەڕیان دەگرت و چوار پەلیان دەبەست و برینگ بەدەستیش لە بەر زگەوە دەستی دەکرد بە بڕینەوەی خورییەکەی. بە شێوازێکی جوان دەیانبڕینەوە و دەست و پێی ئاژەڵی بەستەزمانیان دەکردەوە، ئەویش بە ڕاکردن خۆی دەکردەوە بەنێو ڕانەکەدا. کەسێکیش بەردەوام خورییەکانی هەڵدەپێچا و لەبەر دەستان لای دەبرد. خوری هەر مەڕێکیش دیار بوو. ئەگەر مەڕێك بە دەمی بریگ بریندار بووایە، کەسێك بەخێرایی بە مێرکرۆکرێم دەرمانی دەکرد. یەکی تر بۆ حەسانەوەی برینگ بەدەستان جگەرەی دەدانێ. ئەمەش هەرەوەزی مەڕبڕینەوە بوو، بەبێ خەڵات و بەرات. تەنیا ئەوەندە بوو ئەو ڕۆژە هەر لەو ماڵە نانیان دەخوارد. خان جەعفەرقوولی دەستی لە پاشکۆی دانابوو، چاوەدێری مەڕبڕینەوەکەی دەکرد. کڕیاری خوری و بەرگن لە ئەسفەهانەوە هاتبوون، ئەوانیش لەوێ پەکیان کەوتبوو مابوون. کڕیارێك کتوکوڵکە ڕژاوەکەی کۆ دەکردەوە، ئەمەش نیشانەی بەتەماحیی ئەو بوو. زۆرتر ئەوانەی هەژاران لەنێو ئێلدا هەر وەك گوڵچنینەوەی دوای دروێنەوان ئەو کارە دەکەن. وەختێ مەڕبڕینەوە تەواو بوو، ملیان نا لە ژماردن، جووت جووت دایان دەنا. ١١٤ خوری لە بەرێك، **٢٣٩** لە بەرێکی دیکە، **٦٤** خوری لێرە، **٢٥** خوری لەوێ. لەنێو قسەکاندا بۆم دەرکەوت ١١٤ خوری بەشی بی بی ئێرانە، ٦٤ خوری بەشی بی بی شەوکەتە، **٢٣٩** خوری بەشی جەعفەرقوولییە و **٢٥** خورییەکەش دەمێنێتەوە بۆ کاکی شوان. تینی تاو مێشکی مرۆڤی قاڵ دەکرد و منیش کڵاوم لە سەردا نەبوو. شنەی جار و بارەش قژی دەئاڵۆزاندم، لەو نێوەدا تەنیا من بووم سەرڕووت و بە بێ کڵاو، چ ڕاست و چ درۆ کەمەکێك شەرمم دەکرد. لە کۆتایی کاردا کڕیار ڕەشکەی گرتەوە و خوری داگرت. هەر ئەوەندەی مابوو لە هێستریان بار بکات. من و دیگار بە هۆی ئەوەی دەمژمێر پێنج

لەسەر ڕێگەکە لەگەڵ سەرکار ئوستوار چاوپێکەوتنمان هەبوو، کاتمان لەگەڵ جەعفەرقوولی دانا بۆ بەیانی، کە لە چلگرد بیێینەوە بۆ ماڵی ئەوان و حەوت هەشت ڕۆژێك بمێنینەوە، تاکو شاناز زۆرتر لەگەڵ ئێلاتی ئاشنا بێت. ماڵئاواییمان کرد و وەڕێ کەوتین. ڕێگە سەرەوخواری بوو زوو گەیشتینە سەر ڕێگەکە. تا بوو بە دەمژمێر ٧ چاوەڕوانی سەرکار ئوستوار بووین. دەرودەشتێکی خۆش بوو، لەگەڵ دیگار دەستمان کرد بە یاریکردن و بەردە فڕکێ. زۆریش سەیری گووگلێنەمان کرد، کە چۆن لە هزری پاشەکەوتکردندا بوون. دوای پەککەوتنێکی باش، سەرکار گەیشتە بەردەمان، لەگەڵی سوار بووین و گەیشتینە چلگرد. بەخت بوو بە یارمان و لە دووئاوانی مەحمووداوا و فانیاوا ترۆمبێلەکە نەگیرا، خۆمان گەیاندە قاوەخانە و هەتا زگ بردی خواردنمان خوارد. هەرلەوێ لەگەڵ فرووتەن خان، یەکێ لە سەرۆك هۆزانی تایەفەی بابادی ئاشنا بووین. دواتر هاتینەوە بۆ ماڵێ بۆ ئەوەی خۆمان ئامادە بکەین بۆ ڕۆیشتن، لەنێو ڕێدا تووشی بەرخەوانەکەی جەعفەرقوولی هاتین، هەمیشە گوڵبزەی لەسەر لێوە و دەم و ددانێکی جوان و خاوێنی هەیە و زۆریش وشیار و لەبەردڵانە. دەیگوت، ٥٠ سەری مەڕ هەیە و ئەوەی دەستی دەکەوێت خەرجی ناکات، هەر خەریکی مەڕ کڕینە، ئێستە ١٢ بەهاری تەمەنە. دوو ساڵ پێشتر کە چاومان پێی کەوت دەساڵان بوو، ڕووت و بێ ماڵ" دەمانزانی لە بەرد هاویشتندا زۆر ئازایە.

## چوارشەمە ١٧ی جۆزەردان

هێشتا بەیان ڕووبەندی شەوی لا نەدابوو لە پێخەفی خەو هاتمە دەرێ، دەمژمێرێك دوای من دیگار و شاناز ژوانگەی شەویان بەجێهێشت و دەستمان کرد بە خۆکۆکردنەوە. ماڵی من هەر ئەوە بوو بە کۆڵمدا دا، واماندەزانی جەعفەرقوولی خێرا دێت بە شوێنماندا، تۆزێك ڕاکشاینەوە و، هەستاین چووین جگەرە و قەوەمان کڕی و هاتینەوە بۆ ماڵێ، دیسان چووین سەرێکمان لە چایخانەکە هەڵێنا، چی بە قاوەچی قەرزدار بووین کردمانە مشتییەوە. پارەی ئەو چەند ڕۆژەمان ١١٥ تمەن بوو. ئاغا فەیزوڵا هەر لەوێ بوو. بە یەکەوە چووین بۆ ماڵی بەڕێز پەرویزی، چاوێکمان بەو بنجاقەدا خشاند کە باسی پارچە زەوییەکی شۆرابی تێدا بوو. بەڕێز پەرویزی لە بنەچەکەی جەهانگیرخان و

فەرامەرزخانە، واتە لە تیرەی «مندالّ»، تایەفەی بابادی، لە ڕاستیدا ئەمڕۆ هەقدار ئەوە و، ئەم بنجاقەش دەسەڵاتی ئەو نیشان دەدا بەسەر ئەو موڵکانەدا. تا ئێرە زۆر شت ڕوونە و دەبێ زۆرتر بە دوواداچوون بکەین و ئەو بنجاقانە بدۆزینەوە، تاکو سەر دەربێنین لە نیزامی دەسەڵاتی موڵکایەتی لە عەشیرەتدا. تا ئێستەش چەند نموونەیەکمان دیاری کردووە کە خاوەندارەتیی تەواوی دەسەڵاتی ئێل نیشان دەدات، بەڵام ئەمەش تەواو نییە و دەبێ دەستنووسە نیوە عارەبی و فارسییەکەی بێنن.

نیو دەمژمێر لە نیوەڕۆ لایی دا بوو، خان جەعفەرقوولی هات. دوو پیاو و دوو هێستری لەگەڵ خۆی هێنابوو. بەتەما بوو نەوت و بەنزین بباتەوە. ماتۆڕی کارەبای لە فەرەنسییەکان کڕیبوو. دەمژمێر ٣ بارمان لە هێستر بار کرد و خۆمان بە سواری پیکاب تا ئەوسەری فانیاوا ڕۆیشتین، لەوبەری ڕووبارەکەوە هێستریان بۆ هێناین، لە ئاوی خۆڕ چووینە ئەوبەر و گەیشتینە گوندە چکۆلەی فانیاوا. ژنان بەرەو پیری شاناز هاتن، هەر وەك دیگار وتی، بۆ ئەوەی بزانن ئەو ژنە کێیە لەگەڵ ئەم کابرا شێتە زەماوەندی کردووە! گەیشتینە ماڵی جەعفەرقوولی دەوراندەوری حەسارەکەی ئاخوڕ بوو، بۆ ئەسپ و هێستر، دوو ژووریان بۆ خۆیان داناوە، دووانیش بۆ نۆکەران. نوێن و زمهەر لە ژووری خۆیان بوو. دەیگوت: ماڵێکی دیکەشمان لە لالی هەیە، مەبەستی گەرمێن بوو. لەسەر سەکۆی حەساریێ فەرشێکیان ڕاختبوو، خێرا چاییان بۆ هێناین، یەك بە دووا چەند چاییمان خواردەوە و، جەلال بە هێستر و بارەوە گەیشتە بەردەرگە. شاناز سواری هێستر بوو، دیگار چوو لەسەر باری هێسترێك سوار بوو. من و جەعفەرقوولی بە پێیان وەپێشیان کەوتین. هەتا هەورازمان بڕی لە پێ کەوتین. بی بی هاتن بەرەو پیرمان و ئەحواڵپرسییان کردین. ڕەشماڵیان بۆ هەڵدابووین. هەر ئەوەندە خۆم کرد بە چادرەکەدا شەکەت و ماندوو تەخت ڕاکشام. کاوڕێکیان سەر بڕیبوو، یەك پارچە کەوڵیان کرد. بۆ مەشکۆڵە بەکار دەهات. جاریێ جەرگ و دڵی کاوڕمان خوارد. باسی بنجاق هاتە گۆڕێ، جەعفەرقوولی گوتی، لە بەشی ڕۆژهەڵاتی بەختیاریی تا بەشی ڕۆژئاوای گەرمێنی ئەم بەشە بستێك نییە بە بێ بنجاق بێت. هەر کەسە و بەشی خۆی کێڵگە و لەوەڕگەی هەیە. بنجاقەکان لە گوندەکانەوە دەست پێدەکات. تا دەچێتەوە سەر ڕێژاوی چیاکان، هەر هەمووی سنوور و کەوشەنی دیارە بۆ مندالّ و براکانی.

سەبارەت بە لەوەڕگەکان، ئەویش هەر ئەو قسانەی سولتان عەلی پەرویزی دووپاتە کردەوە. وەختێ دەچین ڕێگەپێدانی لەوەڕگە وەربگرین لەوە زیاتر نادەن و دەڵێن ئەمە دەستوور و پلانی ئەمەریکایە و بتەوێ و نەتەوێ بێنەوبەرەمان پێ دەکەن. باسی ئینگلیزەکان کرا، لەلایەن کۆمپانیای BBC ڕا بۆ سازکردنی فیلمێك سەردانی ئێلی بەختیارییان کردبوو. جەعفەرقوولی گوتی، ئاغا خانی بەختیاریی ئەوانەی ڕەوانە کردبوو، منیش ناچار هاوکاریم کردن. دەیگوت: **٢٣** هێسترمان پێ بوو، **٣٠** سندووق فیلم، سێ دەزگە کامێرەی مەزن. زۆر بە بەرنامە بوون. ژنێکی ئێرانییان لەگەڵ بوو، مێردەکەی ئینگلیزی بوو. ئەو ژنە هەواڵنێری دەیلی تەلەگراف بوو، زۆریش بێ شەرم و حەیاتکاو بوو. کەم و زۆر شکۆی لە کەس نەدەکرد، ڕووت و قووت ڕادەکشا، خانم خۆی لە بەرتاو هەڵدەخست. ژن و پیاوی ئەو ئێلە وەزاڵە هاتبوون، حەزیان نەدەکرد بیبینن. منیش هیچم لەگەڵی پێ نەدەکرا. باسی کرد، چۆن لە مەسجد سلێمانەوە تا دەگاتە چڕی، فیلمیان لە ئێلاتی و کۆچ و کۆچبار و هەوارچیان هەڵگرتووە. سێ شەویش لە کێوە زەرد ماونەتەوە. زۆری باسی بێ شەرمیی ئینگلیزەکانی کرد و، تەواو قەڵس و تووڕەیان کردبوو. زۆر خەوم دەهات و ئاماژەم دا بە خانەخوێ کە بخەوین. ئەو شەوە تا بەیانی حەپەی سەگەل نەیهێشت بخەوین.

## پێنجشەمە ١٨ی جۆزەردان

بەرەبەیان بە دەنگی سەگوەڕ و کاڕەی کاوڕەگەل ڕاست بووینەوە، بەرۆکی ڕەشماڵم ترازاند و هاتمە دەرێ. جەلال ئاوی هێنا و دەست و دەموچاوم شوشت. ماوەیەك چاوەڕێ بووم هەتا هاوڕێیان لە خەو هەستان. نانی بەیانی ماست و ڕۆنەکەرە بوو. هاتینە دەرێ و لە دەوروبەر ڕامایین، جگە لە چادری جەعفەرقوولی، ١١ ڕەشماڵ لەو هەوارە هەڵدرابوو. زۆرینەی ڕەشماڵەکان بوونەتە تەلیس. مەی نسا، ژنە لووڕەکەی جەعفەرقوولی هات تاکو جلکی بەختیاری بکاتە بەر شاناز خانم. لەچك، ئەو کوتە پارچەی ژنان دەیدەن بە سەریاندا، پێشتر باسم کردووە، «می نا»، ئەو تۆڕەیە دەیدەن بە سەردا، «جومە»، کراسە و «شولار»، تەنوورەی چینداری ژنانەیە. مەی نسا، پرچی شانازی کرد بە دوو بەشەوە، دوو پەلکەی جوانی لە پشتەسەرییەوە بۆ گرتەوە. لەچکەی

دا بە سەریدا و لەژێر چەنەی بۆی گرێ دا، چەند جارێك ئەگریجەی بۆ لوول دا و لە بن لەچكەدا شاردییەوە. دواتر نۆرەی بەستنی «می نا» هات، لۆیەکی هێنا و لە سەرووی گوێچکەی ڕاستی بە دەرزیلەیەك گیری کرد. ئەو بەشەی دیکەی لە پێشەسەرییەوە بردەوە و لەسەر گوێی چەپی ئەویشی بە دەرزیلە دابەست. هەر دوو لۆیەکەی لە پشتەوە شۆڕ کردەوە. ئەو بەشەی بە متومووړووی شێوە ئەڵماس ڕازا بووەوە لە بن لەچکەوە خۆی دەنواند، دوو بەش پووڵەکە و تا قڕانی پێوە بوو بە لاجانگیدا هاتبوونە خوارێ. دوای می نابەستن، ئەگریجەکانی بۆ خستە سەر گۆنای. ئەو سەر و شەدەیە تایبەتی ژنانی بەختیارییە و لە هەر جێیەك بن دیارن. ژنانی خزم و کەس دەوریان دابوون و جەعفەرقوولی و ڕۆستەم خان و عەلی خان سەیریان دەکرد و پێدەکەنین. جەعفەرقوولی دەیگوت تا ئێستە نەمدەزانی چۆن «می نا» دەبەستن. ئەوا ئەمڕۆ منیش فێر بووم. وەبیرم هاتەوە لە جەعفەرقوولی بپرسم، بۆچی ئێوە دەڵێن «ئامووری یەکدەستی و ئامووری دوودەستی؟» گوتی: ئەگەر ئامووڕەکە بخەنە سەر ملی گایەك پێی دەڵێن، یەك دەستی و، ئەگەر بخرێتە سەر ملی دوو گا پێی دەڵێن، دوودەستی. ئامووری یەکدەستی کورت دەکەنەوە و کونێکی تێ دەکەن، گوریسێك لەو کونەوە دەبەنە ئەو دیو، لە هەردوو شانی گاجووتەکەوە سەری ئەو گوریسانە ئەخەنە چەڵەمەکەوە. ئەوسا گاجووت بە تەنیایی ئامووڕەکە ڕادەکێشێت. نموونەی زۆرمان لە کەلوپەل و کەرەستەی کاری ئەوان هەڵگرت و لە دەفتەری تایبەتدا تۆمارمان کردن. بۆ ئەوەی ڕۆژێك وەك کتێبێکی کۆمەڵناسی لە چاپ بدرێت. هەتا بوو بە نیوەڕۆ کاری ئێمە بوو بە تماشاکردنی خێوەت و ڕەشماڵ و ژیانی هەوارچیان. سەبارەت بە چۆنییەتی دامەزراندنی خێوەتەکان زۆر شتمان نووسی. دواتر چووینە ڕەشماڵی جەعفەرقوولی و لەگەڵ دایکە پیرەکەی قسەمان کرد. هیچمان بە جوانی لە یەکدی تێنەدەگەیشتین. وا دیار بوو ئەو پیرەژنە هیچ وەختێ لە چوارچێوەی ئێل نەچووەتە دەرێ، بۆیە فارسی نازانێ. لەسەر دەست و پلی خاڵی کوتابوو. ژانی شان و قۆڵ دەشکێنێ. لە جەعفەرقوولی پرسیارم کرد: ئەو چادر و ڕەشماڵەی لە دەوروبەری ئێوەن، هەر ئەوانەن دوو ساڵ پێشتر لێرە بوون؟ گوتی: نا، هەندێکیان گۆڕدراون. هەر کەسێك لە منداڵی خۆی کوێی پێ خۆش بێت دەچێ، گرفتێك لە گۆڕێدا نییە، بەڵام بە هۆی ئەوەی دەمانزانی جەعفەرقوولی پیاوێکی دارا و

دەوڵەمەند و نانبدەیە، هەردەم دەوروبەری پڕە. خواردنی نیوەڕۆمان برنج و خۆرشت بوو. دیگار چەند کەسێکی ئامادە کرد سەبارەت بە زەماوەند و ژنهێنان بیاندوێنێ. منیش خەریکی یادداشتکردنی کارەکانی خۆم بووم. سەیرم کرد چەند ڕەشماڵێك لەگەڵ یەکدی خزمایەتیان هەیە و ئەوانەش لە تیرەی «لەك و ئەحمەد سمالی و حاجیوەرن». زۆرینەی خاوخێزانەکان هەر وەك کۆمەڵناسان دەڵێن، لەسەر ڕیشەی خۆیان دەڕۆن و ئەو کوڕانەی ژنیان هێناوە لەگەڵ باببیاندا دەژین. ئەوان هەر ماڵەی چادری خۆیان هەیە و لە کاروباریشدا یارمەتیی جەعفەرقوولی دەکەن و چی بڵێ لە قسەی دەرناچن، ئەویش زۆر پیاوانە ئاوڕیان وێدەداتەوە. شوانێکی جەعفەرقوولی شەرتی پەڕیبوو، ڕانەکەی هێنابووەوە ڕادەستی خاوەنماڵی بکاتەوە. جەعفەرقوولی داوای لێ کرد چەند ڕۆژێك ڕانەکەی بۆ بلەوەڕێنێ، پارەی دەداتێ، تاکو شوانێك دەگرێ. ئێستەش جەعفەرقوولی ٥ شوانی هەیە. بوو بە شەو کاری ئەمڕۆمان کۆتایی پێ هات و ڕانەکە ڕووی کردە پەرچەمەڕ و کاڕە و باڕە کپ بوو. لەگەڵ جەعفەرقوولی ئاسوودە ملمان نا لە قسەکردن. دەیگوت، سی چل ساڵ لەوە پێش گیسکێکمان دەکڕی بە یەك تمەن، ئێستە بە ٦٥ تمەنە. هەر ئەو کات بوو وەك چۆدارێك هاتوچۆی شووشتەرم دەکرد. بۆ مامەڵەکردن دەچووینە دزفول، تەپلەچییەکی باش لەو شارە بوو، کەسێکیش نێرگەلەی چاکی دروست دەکرد، نێرگەلەی گەرمێنی. ئەو شارە ئاسنگەری باشی تێدا بوو، شتی باشیان ساز دەکرد. باسی ئەرمەنی ئەو شارەی دەکرد «بەربرود»، دەیگوت، لە کاری کشتوکاڵدا زۆر شارەزا بوون. دەهاتنە ناوچەی بەختیاری و کەڵیان دەکڕی. جووتبەندەی چاك بوون. سی ساڵ لەوەپێش بە هۆی ئەوەی شیمبار (شیرین بەهار) دز و دزۆزنی لێ پەیدا ببوو، کەڵ و گامێشیان لەگەڵ خۆیان دەبردە گەرمێن و کوێستان. ئێستە ئەو کارە ناکەن. هەر وەك گوتم، ئەرمەنییەکان کەڵ و گامێشیان لە بەختیارییەکان دەکڕی و گەنمی باشیان پێ دەفرۆشتن و ئارەقیان بە خانەکان دەفرۆشت، بەڵام وەختێ دەسەڵاتی خان و ئاغا کۆتایی هات، ئارەقیش لەنێو ئێلدا تەواو بوو. ئەو ئەرمەنیانە دواتر گەڕانەوە بۆ ئەرمەنستان. لەو سەردەمەدا شارێك نەبوو بە ناوی لالی. چۆخۆر، مێرگ و زەنوێرێکی خۆش و گەورە بوو، خانەکان لەوێ چادریان هەڵدەدا و کاروباری خەڵکیان جێبەجێ دەرکرد و وەڵامی داواکاریی ڕەعیەتیان دەداوە. جەعفەرقوولی سەبارەت بە نەریتێکی جوان لەنێو

عەشیرەتی بەختیاریدا قسەی کرد، خۆیان پێیان دەگوت «خینە چوو»، لە کاتی دەمەقرە و شەڕ و هەلاّدا ئەگەر کەسێك لایەنی هەر تەرەفێك بگرێ، پێی دەڵێن خینە چووی ئەو کەسە. ئیتر لەوە بە دواوە ئەو دوو کەسە دەبێ هەردەم پشتی یەکدیی بگرن و ئاگایان لە یەکدیی بێ. ئەم نەریتەش لە تاکەوە هەیە تا دەگاتە تایەفە و عەشیرەت بە گشتی. بۆ نموونە سەرەتا بێهداروەند و چوارلەنگ خینەچوو بوون و دورکی و بابادی بوونە خینەچووی یەکدی. بۆ هەمیشە لە پشت یەکتر مانەوە. جەعفەرقوولی دەیگوت: «خینەچووو» واتە خوێن و چێو، هەر وەك خوێن لە دار نابێتەوە، ئێمەش پشتی یەکدی بەرنادەین. یان ئەوەی داری من دایمە ئاگەداری خوێنی تۆیە. ئەمەش شتێکی جوان بوو. یاسای نێوخۆی عەشیرەیی کە دەبێتە هۆی ئەوەی ناکۆکی لە نێوان ئێلاتیدا کەمتر بکاتەوە. ئەم کارەش وا دەکات، هیچ وەختێ تایەفە یان تیرەیەك لەبەر یەك هەڵنەوەشێت. دەبێ لەمەڕ ئەو بابەتەوە زۆرتر بەدوواداچوون بکەین. کات درەنگ بوو، جەعفەرقوولی ڕۆییشت و ئێمەش خەوتین.

## هەینی ١٩ی جۆزەردان

بەیانی زوو لە خەو هەستام، هەور و هەلاّ بەرۆکی ئاسمانی گرتبوو. هاوڕێیان لە خەو هەستان و نانی بەیانیمان خوارد. پڕووشە باران دایدا و وردە وردە توندی کرد. خۆمان خزاندووەتە ژێر ڕەشماڵەوە و بارانیش بان سەرمان دەکوتێ. مێگەلیش بەم بارانە کەیفی سازە، بەختیاریگەل دەڵێن، مەڕ سرووشتی گەرمە و لە هەوای سارد چێژ وەردەگرێت. بەرخ و کارژیلە زۆر کەیفیان ساز بوو. بەختیاریی دەڵێن، بزن بە گەرما هەردەم سەرخۆشە و لەگەڵ سەرما سازگار نییە. ئێستەش کارژیلەکان سەمایانە و هەڵدەلەرزن. دانیشتووم و بیر لە قسەکانی دوێنێ شەوی جەعفەرقوولی دەکەمەوە. ئەو پیاوە خێرا خێرا قسە دەکات و فریای ناکەوم وتەکانی بنووسمەوە. دەیگوت، جەعفەرقوولی خانی دورکی جەعفەرقوولی خانی بێهداروەند، لە چالّمونار بە یارمەتی بابادی گەل دەکوژن و بابادی عەسلّ خینەچووی خۆیان دەنێنە ژێر پێ. پشتی کردە دورکیان و یارمەتی بێهداروەندی دا. وەبیرم هاتەوە کە دەیگوت: لەنێو ئێلدا باوە ئەگەر ژنێك لە مێردەکەی منداڵی هەبێ و پیاوەکەی بمرێ، بنەماڵەی شوو، بەتایبەت مامی منداڵەکان لە سەریانە

ئەو منداڵانە بەخێو بکەن. ئەگەر ژنە ڕازی بێ یەکێ لە هێوەرەکانی مارەی دەکەنەوە. باران دەباری و ورد و درشت خزیبوونە کۆشی چادران. لەبەر بێکاری سەرمان ماسیبوو. بانگی جەلالم کرد و ناردم بە شوێن چەند پیرەمێرددا، بێن و لەگەڵمان دانیشن. ئەوانیش پێیان خۆش بوو لە دەورمان کۆ بنەوە. سەبارەت بە وشەی ئاژەڵ و ئاژەڵداری ئەوی گوتیان نووسیمانەوە:

سەبارەت بە ئەسپ:
یەك ڕۆژە تا یەك ساڵ= جوانوو
یەك ساڵ تا دوو ساڵ= کول
سێ ساڵە= نوزدین
ئەسب = ئەسپ
مادیان= ماین
یابوو = یابوو
ئەسپە شێ= بۆر
ئەسپی سپی= نێل
زەرد= زەرد
بەڵەك = پیسە
کوێت= کەهیر
توێڵ چاڵ= پیشوون چال
قاچ بەڵەك= قەڵەم سپی
چوار پەل سپی= چوار قەلەم
سمەکانی لە یەکدی نێزیك= سیردەس
سمی دەست دوور لە یەك= سەگ دەس
ئەگەر هەردوو چۆکی لە پاڵ یەکدابن= پێ ماڵ
ئەگەر پشتی ئەسپ بە قوڵدا چووبێ= کەت چاڤ
کلك قیت= مەعراج

کلك خوار= دۆم کەج
کلگ شۆڕ= شەل دۆم
مل کەڵەشێری= مل کەڵەشێری

گوێدرێژ
کەرەشین= گەزە
سوورتاڵ= سوورخە
ڕەش= دێزە
سپی= ئەلووس
جاشك= هولی
جاشکی نەگیراو تا دوو ساڵ= قودو
دوو تا سێ ساڵ= نوپاون
لە سێ بۆ سەرێ= هەر، خەر
بۆ هێستر هەر ئەوە دەڵێن.
مانگا
گوێلکە ساوا تا شەش مانگە = گەر
یەکساڵەی نێر و مێ= پارینە
پانێر= شەنگول
لە سێ ساڵ بۆ سەرێ مێ = گا
کوێلکە نێری سێ ساڵ بۆ سەرێ = وەرزا
لە سێ ساڵیدا گا دەخەسێنن.
مانگای سوورتاڵ= کاڵ
مانگا زەرد = زەرد
گابەڵەك = پیسە
گاڕەش= شە

کەڵ و گامێش

پاڵاخ تا یەك ساڵ = گوور

یەك ساڵ تا دوو ساڵ= هەشو

دوو تا سێ = نووری

لە سێ ساڵ بۆ سەرێ = گامێش

کەڵ ناخەسێنن، دەڵێن دەمرێ.

گامێشی کلك سپی = شول

مەڕ و بەران

کاوڕ = بەرە

یەك ساڵ تا دوو ساڵ = کەوە

شەکە مێو تا سێ ساڵ = شیشەك

شەکە مێو= میش

شەکبەران = نەڕمیش

بەڵەك = پیسە

سپی = ئەسپی

سووری شەکەری = ئەلو

قزڵ = بوور

کەوو= کەئو

کوڕەگوێ = کەڕە

گوێ شۆڕ = داڵ گووش

مەڕی گوێ بڕاو = کێلە

نێری و بزن

کاریله تا یەك ساڵ= بیگ

گیسك = تیشتر

دوو ساڵ تا سێ ساڵ = تیرەبوز

نێری = بەعید

بزن = بوز

بزنی شپی = ئەلوس

بزنی گوێ بچووك = کرەشە

بزنی گەورە = بەل، شە

مریشك:

کەڵەباب = خوروس

مریشك = مۆرغ

جووجەڵە = تیل

سەگ:

گۆڵ = سەگ

دێڵ = لاس

توڵە = سوگو

سەگی بەر مەڕی = گەلە پا

بۆ هیچ یەك لە ئاژەڵان ناوی تایبەت دانانێن، مەگەر سەگ، هەر وەك: بازە، بۆرە، گورگی، شێرە ...، وشەگەلێکی زۆرمان نووسییەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، فەرهەنگی بەختیاری دەربارەی ئاژەڵداری پشتیوانی مێژوویی لە پشتە. دوور نییە دواتر وشەگەلی زۆرتریش بژنەوین و لەگەڵ ئەوانە پێکیان بگرین. ئەوسا بزانین چەندێکیان تایبەت بە بەختیاریگەلن. چەندێکیان لە دەرەوە هاتوون و تێکەڵ بە زمانی ئەوان بوون. لەوە زیاترمان نەپرسی، چونکە خەڵکەکەی ماندوو دەکرد. تەواویان دەهاتنە نێو قسەکانەوە و بێ ددانەکان تەواو وشەکەیان ساخ نەدەکردەوە. شیرینزواتان، زۆرتر وشەی شێیان بەکار دەهێنا. لەوە دەترساین تووشی هەڵە بین. هەر لەو کۆڕەدا بابادیگەل گوتیان، لە سەرەتای خۆرهەڵاتی کوێستانەوە تا دەگاتە ئەوپەڕی خۆرئاوی گەرمێن، نێزیکەی ١٧٠ کیلۆمەترە. واتە ئەو مەودا ساردەی مێگەل بۆ لەوەڕ پێیدا تێ دەپەڕێت. لە کوهرەنگەوە تا کێوە زەرد، نێزیکەی سی کیلۆ مەترە. مەودایەك ڕانی بابادی لە گەرمێنەوە پێیدا دەڕوات، واتە لە لالییەوە تا شەعبیە ١٢٠ کیلۆمەترە. مابەقی مزڵی نێو ڕێگەیە. وتیان، مێگەلەکە لە ١٥ی سەرماوەزەوە تا سەرەتای خاکەلێوە لە شەعبیە دەبن. شەعبیە هەر لە کۆنەوە لەوەڕگەی ئاژەڵی بەختیاریی بووە، بەڵام ئەوە ماوەی سێ چوار ساڵێکە یەکێ لە خانان بە شێوەی تازە چاڵاوی لێداوە و حەساری بە دەوردا کێشاوە و دەستی کردووە بە کاروباری کشتوکاڵ، ئەگەر ڕێگەی مێگەلێك بدات ئەوا لە بری لەوەڕەکە بەرانێك وەردەگرێت. لە سەرەتای بەهارەوە تا پازدەی خاکەلێوە بەڕێوە دەبن. ١٥ی خاکەلێوە تا ١٥ی پووشپەڕ لە کوهرەنگ، لە ١٥ی پووشپەڕەوە تا سەرەتای ڕەزبەر لە کێوەزەرد، بە ماوەی مانگێك لە ڕێگەدا دەبن. مانگەکانی خەزەڵوەر و سەرماوەز، لە ناوچەی «لامەردان»ی لالی دەمێننەوە. جەعفەرقوولی گوتی، جاڕەکانی خوزستان زۆرینەیان موڵکی ئارپەنایەکانن. بە هۆی ئەوەی زەوییان زۆرە مەڕدارەکانی دیکەش ئاژەڵی خۆیانی تێ دەکەن. هەڵبەت تەنیا تایەفەی بابادییە. سەبارەت بە خوێدانی ڕان پرسیارمان کرد. مەڕ و ماڵاتەکە بە گشتی، لە وەرزی تایبەتدا حەوتەی دوو جار سوێرخوێ دەکەین. لە پایزدا مانگی دوو کەڕەت، سێ مانگەی زستان و مانگێك بەهار هیچ خوێیان پێ نادەین. ئەگەر پەزی لەڕ خوێ بدەن هیچ وەختێ قەڵەو نابێ. واتە مەڕ و بزن وەختێ زۆر خوێ دەخوات ئەگەر تێرلەوەڕ بێت. مێگەلەکە لە بەهادا ڕۆژی جارێك ئاو دەدەن. لەبەرئەوەی گیا شینە و کەمتر ئاو دەخۆنەوە.

پایز و هاوین ڕۆژی دوو جار ئاو دەخۆنەوە. خوڕەمە باران خۆشی نەدەکردەوە و ئەوانیش کاریان نەبوو بچنە دەرێ و ئێمەش لە پرسیارکردن مەحتەل نەدەبووین. دیگار باسی تەڵە و تەپکە و ڕاوەماسی هێنایە گۆڕێ. جەعفەرقوولی گوتی: بۆ کوشتنی پڵنگ هەر بە ترسی خۆی دەیکوژین. دەزانین پڵنگ بە زگەخشکێ دەچێتە پێشێ و ناتوانێ بە پاشەوە بکشێتەوە. هەربۆیە لەو کێوانەی کە دەزانین پڵنگی هەیە بە وشکەبەرد دوو دیواری نزم هەڵدەچنین، بەردی گەورە گەورەی لەسەر دادەنێن، ئەوسەری دیوارەکە بە بەرد دەگرین و کوتە گۆشتێك لەوێ دادەنێین، پڵنگ بۆن دەکات و بە زگەخشکێ دەخزێتە ئەو دالانە بەردەوە تاکو گۆشتەکە بڕفێنێ، بەڵام تازە ناتوانێ بۆ دواوە بکشێتەوە و بێتەوە دەرێ. دالانە بەردەکەش هەر ئەوەندەیە جێی پڵنگ ببێتەوە و کلکی لەدەرێ بەجێ بمێنێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ پڵنگ بە تەڵەوە بووە. مەشەدی ئەمیر گوتی، بۆ ڕاوی ماسی گیایەك دەکەینە ئاوەکەوە بە ناوی ژەهرەماسی. ئەو ڕووەکە ژەهری هەیە و ماسی دەکوژێت، بەڵام بۆ مرۆڤ هیچ زیانی نییە. ئەو گیایە دەخەینە گۆلاوەکەوە و بە شەکۆیەك ئەوەندەی دەکوتین تاکو کەف و ژەهرەکەی تێکەڵ بە ئاو دەبێ و ماسییەکان قڕ دەکات. یەکێ لە پیاوانی بەختیاریی گوتی: بۆ گرتنی کەو یان زۆرینەی گیانداران، مەترێك تا دوو مەتر زەوییەکە چاڵ دەکەین، بە چەپەرێکی سووك سەری دەگرین، ئەمەش بە شێوەیەك دادەمەزرێنین هەروەختێ ئاژەڵێك بچێتە سەری بەر دەبێتەوە و چەپەرەکەش بەخێرایی دەسووڕێ و وەك یەکەمجار دەرگەی چاڵەکە دەگرێت. جەعفەرقوولی پێکەنی و گوتی: دە بەسە بیبڕەوە. ئێمەش قەڵەم و دەفتەرمان وەلا نا و خوان هاتە گۆڕێ. هێلکە و ڕۆن و نان و ماست. لە پاش نانخواردنیش سەرخەوێکمان شکاند. جەعفەرقوولی دەم بە پێکەنین هاتەوە بۆ لامان، دەمژمێر نێزیکەی چواری دەمەو عەسر بوو. خەریك بوو نێوچاوانی ئاسمان ڕووناکی تێ دەکەوت. گوتی: شتێکم وەبیر هاتووەتەوە دەمەوێ بۆتان بگێڕمەوە. نێزیکەی ٢٢ ساڵ پێش ئێستە، دوو پیاوی مەندیل بە سەری عەبا بە شان کەوتبوونە دەڤەرەیلی بەختیاری و داوایان لە خەڵك دەکرد ببنە هۆگری «ئیمام عەلی»، ئەم بانگەوازە لە ماوەی یەك مانگدا تەواوی دەڤەری بەختیاریی گرتەوە. دەیانگوت، وەختێ خۆشەویستیی عەلی بچێتە دڵی هەر کەسێکەوە ئیتر پێویست ناکات بیر لە ماڵ و منداڵ بکەنەوە، حەزرەتی عەلی ماوەیەکی دیکە دێتە نێو خەڵکەوە و لە هەموو شوێنێك تیشکی دادپەروەریی بڵاو

دەبێتەوە و زوڵم و زۆرداری و ستەمکاری نامێنێ. جەعفەر قوولی دەیگوت، دڵدۆڕاوانی گوێ لە مست، هەزار گا و گۆلیان کوشتەوە و خەڵکێکی زۆر تێکەڵ بەم تاقم و دەستەیە بوون. دەیگوت لێیان ڕاسپاردم دەبێ حەوت سەر جوانەگا بۆ ئەو خەڵکە سەرببڕێ، منیش هەر ئەو ئەمیرقوولییەم نارد و گوتم لە زمان منەوە پێیان بێژە: لە دەوروبەری چلگرد نێزیك نەبنەوە، بیستبووم ئەرتەش قەولی داوە لە هەر جێیەك تووشیان بێت تەفر و توونایان بکات. ئەوانیش بە خەڵکی بەختیارییان گوتبوو کە گوللەی تفەنگ کاریان لێ ناکات! جەعفەرقوولی قاقای کێشا و گوتی: هەر ئەو ئەمیرقوولی حازرییە نێزیکەی ٥٠ ساڵە لەگەڵ منە هیچ وەختێ لەلای من سەری بەرز نەکردووەتەوە، دوایی ڕۆیشت و هاتەوە، سەیرم کرد لە ژێلا دێتە سەرێ و ملی قیت ڕاگرتووە و دەگوڕێنێ: جەعفەرقوولی ڕۆستەمی دەبێ تۆ لە ڕێگەی عەلیدا حەوت جوانەگا بکەی بە قوربانی! زۆرم پێ سەیر بوو ئەو پیاوەی من ناردم چ زوو ئەوانە فریویان دا، هەر بەم شێوەی جەعفەرقوولی، تەماشایەکی مەشەدی ئەمیرم کرد، سەری دەبەر خۆی نابوو بە دەم سەرلەقاندنەوە دەیگوت، «ها، ها» جەعفەرقوولی دەیگوت، تەواوی ئەوانە لەگەڵ ئەمیرقوولی هاتبوونە چلگرد، تەماشام کرد هەر کەسە و مارێکی دە ئەستۆی خۆی کردووە، بە بێ ئەوەی بیانگەزن و پێیانەوە بدەن. منیش خەریك بوو ترسم ڕێ دەنیشت و بیرم دەکردەوە چ شتێ پشتیوانی ئەوانەیە، بەڵام وەختێ ئەرتەش کەوتە نێوانەوە و بە دەستڕێژێك سێ کەسی لێ کوشتن مابەقی فیزماڵکیان دایە و بۆی دەرچوون و تۆویان بڕا. جەعفەرقوولی سەرلەبەری ئەوچیرۆکەی بە دەم شۆخی و پێکەنینەوە گێڕایەوە و زۆریش بە تام و چێژ قسەی دەکرد، وردەوردە شەو چارشێوی ڕەشی دا بە ڕووی ئاسماندا، زۆر یەك لە دارودەستە و مووریدانی عەلی لە دەورمان دانیشتبوون، ئێستەش نەیاندەزانی هۆی چی بوو هەڵفریوان. ڕۆستەم لێمان پەیدا بوو، لەگەڵ جەعفەر قەراریان دانا، بەیانی زوو بچن بۆ چلگرد. بۆ ئەوەی سەبارەت بە دالان و تونێڵەکە کاروباری خۆیان تەواو بکەن. وادیار بوو ئەمڕۆ بۆ ئەوە نابێ کار بکەین، زۆر ماندوو بووین. شێومان کرد و بۆ ماوەیەك موتالامان کرد و دواتر خەوتین. با بزانین سبەی بە بێ جەعفەرقوولی دەبێ چ بکەین.

## شەمە ٢٠ی جۆزەردان ١٣٥١ی هەتاوی

لە پێش کچی بەیاندا لە خەو هەستام، جەعفەرقوولی حازر و ئامادە بوو. هێشتا تاریکی ئاسۆگی بەرنەدابوو. گوتم بۆچی زوو دەڕۆن؟ گوتی جاریٚ چاوەڕێم ڕۆستەم بێت، بانگی جەلالی کرد، بەرقلیان بۆ کەریمی بێنیٚ! دووبەدوو لە ڕەشماڵەکەی ئەودا دانیشتین، گوتم: بۆ دەچن؟ گوتی: بەشێك لە جاڕەکانمان دەکەوێتە ژێر ئاوی دووەم تونێڵەوە، دەچین بزانین چ وەڵامێکمان دەدەنەوە. لەو قسانەدا بووین، ڕۆستم هات، ئەسپ زین کرا و سوار بوون و وەڕیٚ کەوتن. شاناز و دیگار لە خەو هەستان و چوون بە لای دەموچاوشووشتنەوە. بەیانییەکی خۆش بوو. شاناز چوو بۆ لای بی بی ئێران و بی بی شەوکەت. من و دیگار ملمان نا لە خۆهەڵقورتاندن. بیرمان کردەوە بزانین چۆن کار و بەرخ لە شیر دەگرنەوە. پێشتر لەسەر ئەم بابەتە زۆر شتم پرسیبوو. لەبەرئەوەی لەسەر هەر بابەتێك جویٚ جویٚ لە چەند کەس پرسیار بکەین. ئەمڕۆ پێیان گوتین، بۆ ئەوەی گوێلك لە شیر ببڕنەوە شیاکە لە گوانی دایکی هەڵدەسوون، گوێرەکە دەمی بۆ دەبا و نایمژیٚ. لە کاتی شیردۆشیندا خاوێن گوانی دەشۆنەوە. لە زۆر شوێن دیتوومانە گوێلکی بەستەزمان دەمبێن دەکەن. کاژیلەش هەر وا لیٚ دەکەن. یان ئەوەی بە قەمتەرکردن لە شیریان دەگرنەوە، بەڵام بەرخ لەمەڕ دوور دەخەنەوە. ئەگەر مێگەل کەم بێت، گوانبەند دەکەنە گوانی مەڕەکان، ئەوسا بەرخ و مەڕ تێکەڵ دەکەن. بۆ ئەوەی جاش لە شیر بگرنەوە، لەبەرئەوەی دەبیٚ تاکو ساڵێکی دیکە گوێدرێژ ئاوس بێتەوە، پیسیی سەگ لە گوانی دەسوون، ئەگەر ئەو کارە نەکەن جاشکۆڵە بە گوڕملێدان بەر بە دایکی دەخات. بۆ لەشیرگرتنەوەی جوانوو، مانگێك جوانووەکە لە دایکی دوور دەخەنەوە، لەو ماوەیەدا ماین وەشك دەکات. یان ئەوەی شیربڕ دەکەنە لمبۆزی جوانووەکەوە. پێشتر باسم کردووە، هەروەها زانیمان لە ئێلی بەختیاریدا، بزن و مەڕ نەبیٚ هەموو ئاژەڵێك بە ئەسپاردە دەدەن بە یەکدیی، بۆ ئەو کارەش پارەیەك وەرناگرن.

دیگار ماندوو بوو. هاتینەوە بۆ نێو چادرەکە، لەبەرئەوەی شاناز بەتەنیا بوو نەماندەویست بێتاقەت بێت. وانەبووایە بەتەما بووین زوو بگەڕێینەوە بۆ تاران. منیش ئەو هەلەم بەباش زانی و یادداشتەکانم ڕێکوپێك کردن. تاکو نانی نیوەڕۆمان خوارد بوو

بە دەمژمێر ٢، دوای نانی نیوەڕۆ لەگەڵ دیگار و خێزانی وەك کەژەوانان کەوتینە کێوان. دەمژمێر چوار بەرەو چیای بی بێکەس، وەڕێ کەوتین. لەنێو ڕێدا زۆر کەسی دیکەش تەمای ئەوێیان هەبوو. ئەو بی بێکەسە، چارەسازە و گرێکوێرەی کاران دەکاتەوە، مەڕێکی بۆ بکەی بە قوربانی کەند و کۆسپ و لەمپەرت لەسەر ڕێ نامێنێ. کانیاوێکیش لەو سەرە هەیە و مێگەلەکە لەوێ ئاو دەخواتەوە و لە سەفەری پارساڵدا باسم کردووە. هیچ کەسێك چڵێك لەو دارە ناکاتەوە و بۆ هیچ بابەتێك دەستی ناکەنێ. تەماشامان کرد ژێر پێی داری بی پڕە لە وشکەڵ و کەس دەستی بۆ نابا. تەنیا ئەو وشکەڵە بۆ کوڵاندنی گۆشتی نەزری دەسووتێنن، ئەویش لە بن دارەکەدا. دوو ژن لە دوورەوە دەهاتن بۆ لامان، چرپی و چاڵیان بە کۆڵەوە بوو. وەختێ هاتنە پێشێ زانیمان یەکیان کچی ئەمیرقوولییە، ئەوە مێردی کردووە و منداڵی هەیە، بەڵام لەگەڵ مێردەکەی تێك چوون و تەڵاقی وەرگرتووە و ئێستە لە ماڵی بابییەتی. منداڵە ٨ مانگانەکەی داوەتەوە بەسەر مێردەکەیدا. خەسوو و خەزووری بەخێوی دەکەن. ژنەکان ئەو کۆڵە دارەی بە کۆڵیانەوە بوو، دایاننا سەر زەوی. شاناز خۆی تاقی کردەوە بزانێ وەك ئەوان دەتوانێ یەکێ لەو کۆڵانە هەڵبگرێت. تەنانەت نەیتوانی لە جێی خۆی ببزێوێ. وەختێ کۆڵ دەدەن بە کۆڵیاندا هەردوو لای گوریسەکە دەکەنە شانیان، ئیتر دەستیان ئازاد دەبێ و کارەکەیان ئاسان دەبێتەوە. بەرەوخوار بووینەوە، وەختی شیردۆشینی بزنەگەل هاتبوو. چاوەڕێ مامەوە و دیگار، هەموو شتێکی بۆ شاناز شی کردەوە. چووینەوە چادرکەمان، شێومان خوارد و ملنان نا لە قسەکردن. بە بێ ئیزنی جەعفەرقوولی دەورو بەرمان پڕ بوو، کەس شەرمی نەدەکرد و چت دەپرسی بێ وەڵام نەدەبووی. سەبارەت بە خڕ و دۆڵان پرسیارمان کرد، مەڕ و ماڵات بە کوێدا دەڕوا. زۆر بە جوانی باسیان کرد و منیش خێرا نووسیمەوە. سەرەتا ناوی ڕێباز و کاروانەڕێیان دەگوت، دواتر ناوی ئەو خێڵ و هۆزانەی بە وێدا تێدەپەڕین. ئەو دەربازگە و بوارانەش زۆرتر باکوری و باشووری بوون.

دەربازگەی «تاکسونی» تەنیا هۆزی مەمیوەند لە بەشی چوارلەنگی بەختیاریی بەو شوێنەدا ڕادەبن.

دەربازگەی «کەڵەگا» هۆزی مەم ساڵح لە چوارلەنگ و ئێسترکی لە دورکی با بەم ڕێیەدا ڕادەبرن.

دەربازگەی «تیمبی یاکی نەو» ئەم ڕێیەش تایبەتە بە هۆزی مەم ساڵح و ئێسترکی.

دەربازگەی تیژ، زۆرتر لە بەهاردا بەستراوە و تایەفەی بابادی عالی ئەنوەر و ڕوکی لە بابادی باب لەم ڕێیەوە ڕادەبرن.

دەربازگەی «پەمووە کاڵ»، تایەفەی گەلە، بەبدینی، ڕوکی و بابادی عالی ئەنوەر، ئەمانەش هەر هەموویان تایبەتن بە بابادی باب لەوێوە دەڕۆن.

دەربازگەی «مۆنار» تایەفەی گەلە، بەبدینی، بابادی عالی ئەنەوەر لە باباد باب و ئەسی وەند لە دورکی باب، بەو ناوەدا ڕادەبرن.

دەربازگەی «لیلەوەك»، لە بەهاردا بوار نادا، تایەفەی گەلە، بەبدینی، ڕوکی، بابادی عای ئەنوەر لە بابادی باب و تایەفەی بامدی لە دورکی باب بەم ڕێیەدا دەڕۆن.

دەربازگەی «زەردە»، کاروانەڕێی تایەفەی بێداروەند و تایەفەی گەلە، بەبدین و شەهنی لە بابادی بابە.

دەربازگەی «کولونچی» لە بەهاردا کەس ناتوانێ خۆی لێدا، تایەفەی بێداروەند و تایەفەی گەمار، مەدمولیل، شەهنی، مولمویل لە بابادی باب پێیدا ڕادەبرن.

دەربازگەی «چەری»، کاروانەڕێی تایەفەی بێهداروەند، تایەفەی گەمار، مەدمولیل، مولیل لەبابادی باب و تایەفەی هەمۆڵە، بامدی، ئەسیوەند، گەنەلی لە دورکی باب ڕێگەی ئەوانەیە.

دەربازگەی «قەراو»، بووەتە کاروانەڕێی تایەفەی ئەسیوەند، گەندەلی و زەڕئەسوەند لە بەشی دورکی باب.

دەربازگەی «دێزبار»، تەنیا تایەفەی زەڕئەسوەند لە دورکی باب پێیدا دەڕۆن.

دەربازگەی «شالو»، هۆزەکانی ناوچەی دیناران و هۆزگەلی مەدمولیل، ڕوکی و بابادی عالی ئەنوەر لەوێوە دەڕۆن. هەروەها غولامخواستیی وشترەوان ئەم ڕێگەیان گرتووەتەوە.

نووسینی ناوی دەربازگە و دۆڵی تەنگەبەران زۆری وەخت گرتین، چەند کەڕەت ناسووسمان لە چراتۆڕ دایەوە تاکو تەواو بووین. ئەگەرچی شەو دەرەنگ و تەواو ماندوو

بووین، پێمان حەیف بوو ئەو باسەی لەسەر چۆخەچنین دەیکەن نەینووسینەوە. لۆکە و مەرەزێك کە دەیکەن بە چۆخە، بە زەحمەتێکی زۆر کارەکانی تەواو دەبێ. باشترین خوری هەڵدەبژێرن، دەبێ زۆر نەرم و زەریف بێت. خورییەکان بە سابوون خاوێن دەشۆرن. هەروەك لە پێشدا باسم کردووە ئەوسا دەیرێسن. بۆ ڕستنی خورییەکە ٣٠ تمەن پارە وەردەگرن. ٣٠ تمەن بۆ هەڵبژارنی خورییەك وەردەگرن. ڕەنگکردنەکەی دە تمەن دەستێنن، چنینی ٣٠ تمەن پارە دەبات. ئەمەش چۆخەچنێك بۆی باس کردین. وەختێ لێکم داوە زانیم بە ڕاستی هەرزان تەواو دەبێ. وەختێ لە باسی چۆخەچنین تەواو بووین، دەوروبەرمان چۆڵ بوو، ئێمەش لاقانمان لێ درێژ کرد و پشوویەکمان دا. شاناز دەیگوت، ئێوە زۆری لەسەر دەڕۆن و ئەو خەڵکە وەڕەز دەکەن.

## یەکشەممە ٢١ی جۆزەردانی ١٣٥١

هێشتا گزنگی خۆر تەوێڵی چیای ماچ نەکردبوو لە ڕەشماڵی خەو هاتمە دەرێ. شەوێکی ساردم بەرێ کرد و تا بەیانی خۆم هەڵگوشی. بە دوای مندا خان و ئاغا ئامێزی یەکدیان بەر دا و ئەوانیش لە چادرەکە هاتنە دەرێ. خواردنی بەیانی نان و کەرە و ماست بوو. جارێ پلانی ئەمڕۆمان دانەناوە کە چ بکەین، مەهدی خان لەگەڵ چەند بەیتارێك پەیدا بوون. هاتبوون مەڕ و ماڵاتی جەعفەرقوولی واکسێنە بکەن. جەعفەرقوولی لەوێ نەبوو، ئەوانیش نەیاندەزانی چی بکەن. بە یەکەوە دەستمان کرد بە قسەکردن، گوتیان: فەرامەرز خان دوو سێ ڕۆژە چووەتە چلگرد. هەموو چاوەڕێن لە دووەم تونێڵ شتێك بپچڕێ. تەواوی مەحتەل ماون، کەسیش بە ڕەی ئێمە ناپێوێ. شیرازەی کاری ئێمە هەڵوەشاوە و بەم پلانە ئاژاوە کەوتووەتە ئێلەکەوە. لە گەورە و چکۆلەوە، کەلانتەر و لووڕ هەرکەسە و بە تەمایە قولاخی بڕفێنێت و لە تونێڵەکەدا کارێکی دەست بکەوێ. مەهدی خان بە خۆڕایی نەکەوتبووە شوێن ئەم بەیتاڵ و مەیتاڵە. بۆ ئەوە ئەم کارەی دەکرد، جەعفەر کارێك بۆ خەڵکەکە بکات. ماڵئاواییان کرد و ڕۆیشتن. چەند دروێنەوانێك چووبوونە گەرمێن، تازە دەگەڕانەوە، لە گەرمێنەوە بە پێیان هاتبوونەوە، هەتاو سەر و چاوی گەزیبوون. هێندەیان تۆز بە گەروودا چووبوو، قرخن ببوون. وەختێ کەسێك دوو هەوا دەگۆڕێ، زوو سەرمای دەبێت. هەموو ساڵێك

ئەم بەزمە دووبارە دەبێتەوە. سڵاویان کرد و هەر کەسە و خزایە خێوەتی خۆیەوە، تاکو ماندوویی لەشیان دەربچێ. چاوەڕێین تاوێك بێنە لای ئێمە لێیان بپرسین بزانین خەبەر و باسی گەرمێن چییە. تووشماڵان لە دوورەوە هاتن و خۆیان کرد بە ڕەشماڵی بی بی ئێراندا، بی بی بانگی ئێمەشی کرد. هەڵبەت بە بۆنەی شانازەوە بوو. تووشماڵ زرمەیان لە دەهۆڵ هەستاند و فوویان کرد بە زوڕنادا، دە تمەنیان لێ سەندین و بەجێیان هێشتین. جەلال لە بنەوپاڵەوە بوو، لێمانپرسی گەرمێن تا ئێرە چەندێك دوورە؟ گوت: بە پێیان ٥ ڕۆژ، بە سواری چارەوێ، واتە ئەسپ و هێستر ٣ ڕۆژ، بە ترۆمبێل ٢٤ دەمژمێر. مەشەدی ئەمیرقوولی و چەند کەسێك هاتن بۆ لامان، باسی کاروباری کشتوکاڵ لەنێو ئێلدا هاتە ئاراوە. چەند خاڵی باشیان باس کرد و نووسیمانەوە. دەبێ لە دەرفەتێکدا پێیدا بچمەوە. ئەوەی ئەوان بە پەلە وتیان منیش لە خوارەوە نووسیمەوە:

لە ناوچەی کوێستانی ٤٥ هاوینان دێمەکار دادەچێنن، تەنیا گاسنێکی لێ دەدەن و هاوینی ساڵی داهاتوو دەیدوورنەوە. لە ناوچەی گەرمێنی ٤٥ پایزان تۆو دەچێنن و دەیکێڵن، ٥٠ ڕۆژ لە بەهار بچێ دەیدوورنەوە. ئەمەش گاسنێکی لێ دەدەن. شێوەردی دێمەکار هەر وەك خۆیان دەڵێن «دو وێلی»، لە کوێستانێ دەکەنە بەهارەکێڵ، لە ٤٥ی هاویندا دروێنەی دەکەن. بەراو، دووجار دەکێڵن. گاسنێکی لێ دەدەن، دە ڕۆژ دواتر تۆوی پێوە دەکەن، ئەوسا گاسنێکی دیکەی لێ دەدەن. دێمەکاری زۆزانێ، ٧٠ ڕۆژ لە بەهار بچێت، دەیکێڵن و ٧٠ ڕۆژ لە پایز بچێت دایدەچێنن، ئەمەش پێی دەڵێن «ڕەگبڕ» زۆرتر گاسنی بۆ دادەخەن و هێڵەکان دەچنەوە سەر یەك. دێمەکاری گەرمێنی زۆرتر لە ٧٠ ڕۆژەی پایزدا دادەچێنن و لە ٧٠ی بەهاردا دەیدوورنەوە. هەمیشەش چەندن و کێڵان بە یەکەوەیە. دێمەکاری گەرمێن، ئەگەر زەوی بێ هێز بێت، لە ٦٠ی زستاندا گاسنێکی لێ دەدەن تاکو لە ٧٠ ڕۆژی پایزی ساڵی داهاتوودا ئامادەی کێڵان بێت و ئەوسا لەگەڵ داچەندن ڕەگبڕی بکەن و لە ٦٠ی بەهاردا بیدوورنەوە. دروێنەوانێك گوتی، جێگەی ١٤٠ مەن تۆومان لە گەرمێن بە چوار کەس دووریوەتەوە. زۆرینەی بەراوەکان لە کوێستانن ـــ گەرمێن، زەوی و زاری ئاویی کەمترە ـــ لە ٧٠ی بەهاردا گاسنێکی لێ دەدەن و دوای چەند ڕۆژێك دایدەچێنن. کە پێی دەڵێن ڕەگبڕ، ئەوجار ئاوی دەدەن. لە بەهارەوە تا ٤٥ی هاوین ئەگەر زەوییەکە بە پیت بێ، ١٥ ڕۆژ جارێك

ئاوی دەدەن. ئەگەر بێ هێز بێت ١٠ ڕۆژ کەرەتێك ئاوی دەدەنێ. لە ٤٥ی هاوین دروێنە دەست پێدەکات. دروێنەی ٢٠ مەن زەوی دە ڕۆژ دەکێشێ. دروێنەی ٥٠ مەن زەوی ٢٠ ڕۆژ دەکێشێ و دروێنەی ٥ مەن زەوی ٢ ڕۆژ تەواو دەبێ. ئەم گەنمەش پێی دەڵێن، گەنمی پایزە. بەهارەکێڵی دێم لە کوێستانێ ٢٠ی خاکەلێوە دایدەچێنن و مانگێك هاوین بچێ دەیدوورنەوە. لە بەراوەکاندا نۆك و نیسك و ماش و هەرزن دادەچێنن. ئەمانەش بەهارەکێڵن و لەگەڵ بەهاروودا دەیڕنەوە. کە دەبێتە ٨٠ی هاوین. وەختێ ڕنەو و دروێنە تەواو بوو. پەرێزەکە سێوەرەیی لێ دادەچێن، ئەویش ئاوی زۆری دەوێ و کێلانی ناوێ. لە پایزدا سێ نۆرە سێوەرە ئاو دەدەن. ئەگەر لە بەهاردا بێت حەوتەی جارێك تەواوە. سێوەرە سێ بەر دەدات: یەکەم بەر سەرەتای هاوین، دووەم بەر ٤٥ی هاوین و ئاخر بەر دایدەنێن بۆ تۆوی. ئەمەشیان لە سەرەتای پایزدا تەواو دەبێ. وەختێ سێوەرە کۆتایی هات، دەیکێڵنەوە و دەیکەنە گەنم. زەوییەك دوو کەرەت سێوەرە نادات. باش وایە بکرێتەوە بە گەنم. ئەگەر ساڵەکەی تەڕەساڵ بێت، دێمەکار یەك بە دە دەیگرێت، بەڵام بەراو یەك و پێنجە. بەختیاریگەل کەیفیان بە دێمەکار سازە و ئەو جۆرەی پێدڤییە لە بەراو ناگەن. لە هەر لایەك بەراویان هەبێ دەیکەنە سێوەرە. ئەوەمان لە تەواوی کوێستانەکاندا دیتووە. دەر و دەشت بە گوڵ و بەرامەی سێوەرە ڕازاوەتەوە. سێوەرە لە هەموو شوێنێك شین دەبێت. جەعفەرقوولی لێرە نییە و مەشەدی ئەمیرقوولیمان بە دەستەوەیە. خێزانێکی پێنج کەسی، خراپ نەبوو سیایی ساڵێك ژیانی ئەوان بنووسین. پیاوێکی بە سەبر و لەسەرەخۆ، ڕووڕاست و بێ فرتوفێڵی ئێلاتی. ژنێکی هەیە و کوڕێکی چواری سەرەتایی دەخوێنێت و ئەوی چووکەتری لە قوتابخانە دووەم دەخوێنێ و کچەکەشی تەڵاقی وەرگرتووە و هاتووەتەوە بۆ ماڵی باوان. ئەو کچە زارۆیەکی ٤ مانگەی هەیە. پێم گوت، دەمەوێ خەرجی ئێوە بنووسم. ڕازی بوو گوتی پێم خۆشە. گوتم وەڕەز نابی؟ گوتی وەڕەز نابم، بەڵام شتێك هەیە، ئەویش خەرجی زۆری لەسەر قەرز هەڵدەسووڕێت. هیچ وەختێ پووڵ و پارەی حازرمان بە دەستەوە نییە، زمهەری خۆمانی پێ لێ بکەین. ئەوەی لە دووکانداری دەکڕین، وەختی خەرمان قەرزەکانی دەدەینەوە. یان ئەو کاتەی پووڵمان بێتە دەست حیسێبی خۆمان پاك دەکەین. کەسێکیش ئاوا بەڕێ بچێ خەرجی لێ گەورە دەبێتەوە. بۆ نموونە، چەند شت

باس دەکەم بۆ ئەوەی بە ڕوونی لە مەبەستەکە تەواو تێبگەی: ئەو نرخانەی باسی دەکەم هی ئەم ساڵە و لەگەڵ ساڵی ڕابردوو زۆریان جیاوازی نییە. بۆ نموونە، ئەگەر قەند بکڕین کیلۆی ٢٥ قڕان حیسێب دەکرێت، ئەگەر بەقەرز وەری بگرین و لە دەفتەردا بینووسێ بە ٤٠ قڕان حیسێبی دەکات. پارە بدەین چایی کیلۆی ٢٠٠ قڕانە، بە قەرز ٣٥٠ قڕانە. ئارد بە نەغد مەنی ٧٠ قران و بە قەرز مەنی ١٠٠ قڕانە، پارساڵ خێزانی ئێمە ١٥٥ مەن نانیان خواردووە. ١٢ مەن قەرز بووە. گوتی داهاتەکەشمان هەر بەم جۆرە قەرز و قۆڵەیە. ئەگەر پارەمان لازم نەبێت حاسڵمان بە قیمەتی بازاڕ دەفرۆشین، بەڵام هەر ئەو دەڵاڵ و دووکاندارانە دەزانن پارەمان بە دەستەوە نییە زووتر لێمان دەکڕن و ناچارین شینفرۆشی بکەین. ئەمەش دەبێتە نیوە قیمەت. ئەوەی ڕاستی بێت تەواوی داهاتمان دەچێتە گیرفانی ئەوانەوە و خۆیشمان هەر بخۆ و بڕۆیە. تازە ئاوێکە ئاوارژاوە. مەشەدی ئەمیر دەیگوت، جووتبەندە نیم، بەڵام زۆر کەس زەویم دەداتێ، دایچێنم بە بێ ئەوەی پارەی بدەمێ. ئەویش لە ڕوومدا دەمێنێ. ئەگەر جووت و گا لە خۆم بێت حاسڵەکەش هەر بە من دەبڕێت. لەبەرئەوەی نیمە سێوەڕە دادەچێنم لەگەڵ خاوەن زەوی لە نێوەڕاستەوە بەشی دەکەین. ئەوەی من هەمە ٢ ماینە و ٦ سەر ڕەشەوڵاخ. لەگەڵ ٢٠ سەر بزن. نێر و ئاموور زۆر گرینگ نییە. دەکرێ ئەوانە بە ئەمانەت لە خەڵکی وەربگری. بە گوێدرێژ و ماینی خۆم جووت دەکەم. دەکرێ گاجووت بە ئەمانەت وەربگری و پارە نەدەی، خێزانم خەریکی چۆخەچنینە. ئەمەش کەلێنێك دەگرێ. لە هەمبەر ئەو کارەی بۆ جەعفەرقوولی دەکەم بەرگ و پێڵاو و شتێکم دەست دەکەوێ. ساڵی ڕابردوو ئەو خەرجانەم هەبووە. ڕەنگە زۆریش تەواو نەبێ، بەڵام هەر لەو دەوروبەرەدایە. دەگەز کوتاڵی «شولار»م بۆ خێزانم کڕیوە بە ٣٠ تمەن. چوار گەز پارچەی کراسم کڕیوە بە ١٢ تمەن. چوار گەز تۆڕ بۆ می نا، ١٦ تمەن. دوو جووت پێڵاو دە تمەنە. بەسەر یەکەوە دەبێتە ٦٨ تمەن. ئەوە چوار مانگە کچەکەشم هاتووەتەوە، ٦٨ تمەن بۆ ئەویش دانێ. تەنیا بەرگ و پێڵاوی دوو ئافرەت لەماڵدا ساڵێ دەکاتە ١٣٦ تمەن. دوو ژێرپاتۆڵ بۆ خۆم ٢٠ تمەنە. پاتۆڵێکی دبیت ٤٥ تمەنم پێ داوە. کڵاوێك ١٠ تەمەنە. چۆخەیەك خێزانم بۆی چنیبووم ئەگەر بمفرۆشتبا ٧٠ تمەنی دەکرد، کۆتێك ٣٠ تمەنە. دوو کراس ٢٠ تمەنە. دوو جووت کەوشی لاستیکی ١٤ تمەنە. ٤ جووت گۆرەوی

١٢ تمەنە. كۆی خەرجی من لە ساڵدا بووەتە ٢٢١ تمەن. كوڕە كان سەر و كراسێكم بۆ سەندوون بە ١٠ تمەن. ٢ شەڕواڵ ١٠ تمەن. ٢ جووت كەوش ١٥ تمەن. كڵاوێك ٥ تمەن. پشتێنێك ١٠ تمەن. بلوزێك ١٠ تمەن. ئەم خەرجە بۆ هەردوویان دەبێتە ١٢٠ تمەن. ساڵی ٤٠ تمەن خەرجی قوتابخانەی كوڕە گەورەكەیە، ئەویش دەبێتە ١٦٠ تمەن. پارساڵ ١٥٥ مەن ئارد، ١٢٠ كیلۆ قەند، ١٢ كیلۆ چایی، ٣٦٠ پاكەت جگەرەی ویژە، ٢ مەن كەشك، ٣ مەن سێوە بن عەرزیلە (پەتاتە)، ٢ مەن پیاز، ٦ كیلۆ ڕۆن نەباتی، ٥ مەن برنج و نێزیكەی ١٠ تمەن شەمچە و ١٢ تمەن نەوت و ٥ مەن دۆشاوی هەنارمان خواردووە. ٢ چراتۆڕمان كڕیوە. ئەوانەش خان جەعفەرقوولی نەغد پارەی داوە. تەنیا ئاردەكە نەبێ پووڵی تەواویان دراوە. بۆ نەوت ١٢ تمەن، چراتۆڕ ٢٤ تمەن. برنج ٢٠٥ تمەن، ڕۆنی نەباتی ٣٠ تمەن، بۆ كەشك ٤٨ تمەن، پارە سەرف كراوە. فاكتۆری هەموویانم هەیە. تەواوی ئەوانەی لە ڕووی كاغەزێك بۆ ئێمە دەخوێندەوە.

ئەمیرقوولی خەرجی ساڵی ڕابردووی نووسیبوو تاكو لەگەڵ جەعفەرقوولی حیسابی بكات. خەرجی ساڵێكی ئەو خێزانە سەرجەم ٢٩٤٧ تمەن بوو. گوتم چەندەت پارە دەست كەوتووە؟ بەدەم پێكەنینەوە گوتی: بینووسە با بۆت حیسێب بكەم:

٣٠٠ تمەن سێوەڕەم فرۆشتووە، نێزیكەی ٣٠ مەن گەنمم فرۆشتووە بە ١٥٠ تمەن" ١٢ سەر گیسك بە ٩٠٠ تمەن. گایەكم فرۆشتووە بە ٣٢٠ تمەن. گوێرێژێكم دا بە ١١٠ تمەن. خێزانم سێ چۆخەی بەخشیوە، یەكیان وەبەر خۆم كەوتووە ٨٠ تمەن. ٣٣٠ تمەن لە دەوڵەت وامم وەرگرتووە. دەبێ پایز بیدەمەوە. ٢١٩٠ پارەم دەست كەوتووە. ٧٥٧ تمەن كەمم هەیە و ئەگەر ٣٣٠ تمەن وامی دەوەڵەتی بێتە سەر ١٠٨٧ تمەن قەرزدار دەبم. هەربۆیە لە لای بەڕێز جەعفەرقوولی نابزووم. لەنێو ئێلدا زۆر كەسی وەك من هەن ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژیانیان ناخۆشتر دەبێ.

لەگەڵ ئەم قسانەدا مەشەدی ئەمیرقوولی زۆرتر دەردی كاری بوو، هەر بۆیە خێرا هەستا و ماڵئاوایی كرد و بەجێی هێشتین.

لەگەڵ دیگار و شاناز بۆ ماوەیك لەجێی خۆمان وشك بووین. دواتر سەبارەت بە ژیانی ڕەوەندان زۆرمان قسە كرد. ئاخۆم ئەو خێڵەكیانە لە بابەت ئابوورییەوە قازانجێكیان بۆ وڵات هەیە؟ یان هەر ئەوەی ئێمەش قسەی ڕووت دەكەین. وردە وردە

وەڕەزی ڕووی تیێ کردین و قسەکانی ئەمڕۆی مەشەدی ئەمیرقوولی بە تەواوی هەژاندینی. چاوەڕێی جەعفەرقوولی بووین بیبینین و ئێمەش بڕۆین. بی بی ئێران بە دڵ دەیگوت، ئەمشەو دێتەوە، هەر واش بوو. گوتم دەمانەوێ بڕۆین، جەعفەرقوولی گەلێك دەوا و دەرمانی بۆ خەڵکەکە لە دیگار وەرگرت و شێوەی بەکارهێنانی پرسی و لەسەر پاکەتەکان نووسی.

قەول وابوو بەیانی بەجێیان بێڵین، جەعفەرقوولی گوتی: سبەی ماشێنێك دێتە فانیاوا. ئەو چوو بە لای کاری خۆیەوە و ئێمەش دەستمان کرد بە کۆکردنەوەی کەلوپەلەکانمان. ئەمەش ماوەیەك مەحتەلی کردین. زوو زوو لە نێوان شاناز و دیگاردا قڕە و هەرا ساز دەبوو. منیش ئاورەکەم خۆش دەکرد و بە قاقا و پێکەنین و شۆخی شەومان درەنگ کرد.

## دووشەمە ٢٢ی جۆزەردانی ١٣٥١ی هەتاوی

شەو تێی تەقاند و بەیانی زوو لە خەو هەستاین. هەموو شت ئامادە بوو. نانی بەیانیمان خوارد. کیژۆڵەیەکیان هێنا سەگ گازی لە قاچی گرتبوو. برینەکەی ئەوندە چڵکی کردبوو نیگەرانی کردین، ئەوان دەیانگوت زۆر گرینگ نییە. شتی ئاوا زۆر پێش دێت. کچۆڵە لەبەر خۆیەوە دەگریا، برینەکەمان تەواو شوشتەوە و دەرمانمان کرد و چەند کەرەت لەسەر یەك گوتمان دەبێ بیبەن بۆ لای دکتۆر. نابێ دوای بخەن.

پیرەپیاوێك بە جەفەنگ بە دیگاری گوت، «بیبە چاکی بکەوە بۆ خۆت» مەبەستی هەر ئەو کچە ١٥ ساڵەیە بوو. بە قسەیان کردین و بردیان. شانازمان نارد نەختێك دڵخۆشیی ئەو کچە بداتەوە. لەگەڵ جەعفەرقوولی چووین خواحافیزیمان لە بی بی گەل کرد و بەرەو فانیاوا کەوتینە ڕێ و شۆڕ بووینەوە. بە بێ ئەوەی کەس بدوێنم بیرم لە ئازاری ئەم کچۆڵە بێ نازە دەکردەوە و حەزم بە کوێربوونی خۆم دەکرد، نەك ئەوە ببینم. گەیشتینە کەناری ڕێگە و جارێ هەواڵێك لە ماشێن نەبوو. عەلی مراد ٨٠ ساڵییەتی و بابی سەید مرادە و لە دوورەوە گەیشتە لامان، وەك باوکێك باوەشی پێداکردین و ماچی کردین. دەیگوت، لە خوزستانەوە بە پێیان هاتووە و ١٥ کەسن. سێ ڕۆژ بە ڕێگەوە بوون، شەو لەسەر بەفر خەوتوون و بە دەوری خۆیاندا ئاوریان کردووەتەوە بۆ ئەوەی ورچ نەیانخوات.

پیرەمێرد زۆر ماندوو بوو، ماڵئاوایی کرد و ڕۆیشت. ئێمەش هەروا چاوەڕێ لەسەر ڕێگە. خۆم بە شکاندنی بەردەکانی قەراخ ڕێگەکەوە خەریك کرد. مراد دەیگوت، لەو شاخ و کێوە لە باتی چەقۆ بەردی تیژ بەکار دەهێنین. ئەگەر ئاژەڵێك لە شاخەوە بەر ببێتەوە و بزانین خەریکە مندار دەبێتەوە، بەو بەردە تیژانە سەری دەبڕین. چاوەڕوانی کۆتایی هات و، ماشێن لە بەردەمان خولی خوارد و ڕاوەستا. جەعفەرقوولی و شاناز لە پێشەوە سوار بوون و من دیگاریش لە پاش کۆی ترۆمبێل لەنێو بەختیاریگەل دامەزراین. بە بینینی ئێمە خەڵکەکە کەوتنە سرت و خورت. دیگار لەوان نێزیك بوو، منیش لەبەر هاڕەی ماشێن هیچم نەدەبیست، بەڵام جارجارێك ئەم قسانەم بەرگوێ دەکەوت:

ــ ئەمانە خاریجەن، هاتوون بۆ سەیران، وێنە دەگرن.

ــ کاروباریان چییە؟

ــ کاریان بۆ چییە، پارەیان وەك کا زۆرە!

ــ خان جەعفەرقوولی دەیانبات بۆ شاریکورد.

یەکیان غیرەتی وەبەر خۆی نا، ڕووی کردە دیگار، بە قامکی نیشانی دا کە وێنە دەگری؟

دیگار وەڵامی نەداوە، بەڵام سەری بۆ لەقاند، بەختیاریی بە غیرەتێکی زۆرترەوە لێی پرسی:

-وێنەکان؟ وێنە؟

دیگار دیسان سەری بۆ لەقاند. دیسان دەستایان کردەوە بە ورتەورت، یەکیان لە تەنیشت منەوە بوو گوتی، مستەر ئێوە زمانی ئێمە دەزانن؟

چاوم لە چاوی بڕی و شەرمم کرد لەسەر و سەکوت و قەڵافەتی خۆم، ئەمە چ بەرگ و لیباسێکە و ئەم دەم و ڕدێنە چییە؟ بۆ دەبێ ئەوان وا بزانن دیگار لە خۆیانە و من دەرەکیم. خۆم بۆ ڕاگیر نەکرا و بە زمانی لووڕی گوتم:

براگیان! مەگەر زمان لە دەمتا نییە؟ نابێ بزانی دەڵێی چی؟ زۆریان بە لاوە سەیر بوو، تێکڕا تێم ڕامان، هەر ئەو کوڕەی پرسیارەکەی کردبوو، کەوتە جووڵەجووڵ، یان

ئەو لە من حاڵی نەبوو یان من نەمزانی دەڵێ چی. هەرچۆنێك بوو بە تەما بوو لە مەبەستی تێبگەم:

ــ کاتێك هاتییە ئێرە، زمانی ئێمەت دەزانی؟ زمانی فارسی؟

تەواو خۆم ئارام نیشان دا، هێدی و لە سەرەخۆ ڕووم تێ کرد و گوتم:

-کوڕی باش! چۆن دەبێ نەزانم، من ئێرانیم.

کوڕە لە هەڵەی خۆی پەشیمان بووەوە و نەختێکیش زیرەکانە گوتی:

-لەوە دەچێ، بابت یان دایکت دەرەکیی بێت.

بازاڕی قسەوباس گەرم بوو، شاگرد شۆفێر، وەك بزنەگەل مووسافیرەکانی لەپاڵ یەکدی دەپەستاوت. تاکو خەڵکی زۆرتر سوار بکات. ئەگەر کەسێك دەیویست بڵێ جێم ناخۆشە خێرا ئەوی پەنای بێدەنگی دەکرد. لە پشت پیکابەکە بەزمێك بوو هەر مەپرسە. ماشێن هەڵدەبەزی و ئەو خەڵکە بەسەر یەکدا دەکەوتن. خۆ باسی ئەو تەپوتۆزەش ناکرێت. لەسەر ڕێگە تووشی گوندێك هاتین، لام وایە هاروینە بوو، ئاویان لەدەشتێك ئاژین کردبوو، لەو نێوەدا جووتیان دەکرد. دیگار لێی پرسیم: بۆچی دەبێت؟ خەریك بووم بیرم لێ دەکردەوە، ڕەنگە بۆ برنج بێت. هێشتا وەڵامم نەدابووەوە، یەکێ لە بەختیارییەکان گوتی:

ــ گەنمەکان زەرد بوون...

لێی حاڵی بووم، خەریکن جێ خەرمان خۆش دەکەن. ڕووم کردە دیگار گوتم: جێ خەرمان خۆش دەکەن. کابرای بەختیاری واقی وڕما، گوتی:

ــ ئێوە زۆرزانن، دەڵێی باب و باپیرتان وەرزێڕ بووە.

گوتم: «چۆن دەبێ نەزانم»، گوتی: «شارنشینان گوڵی گەنمیان نەدیوە تا بزانن جێ خەرمان چییە». لە نیوەی ڕێدا ماشێن پەنچەر بوو. تەگەرمان گۆڕی و بە هەزار کلکەلەقە گەیشتینە «مۆرغمەلەك» لە قاوەخانە نان و ماستێکمان خوارد“ بە ڕاستی ماستی باشی هەبوو. ماشێن وەڕێ کەوتەوە و دەمژمێر ۳ی دوانیوەڕۆ گەیشتینە شاریکورد. دەمژمێر ۹/۳۰ لە سەرووی فانیاوا کەوتبووینە ڕێ. خێرا سواری پاس بووین و بەرەو ئەسفەهان وەڕێ کەوتین. هەوا زۆر گەرم بوو. گەیشتینە ئەسفەهان و خۆمان گەیاندە هۆتێل سیروس و بە گەرماوکردنێك بووژاینەوە. دیگار گەیشتێ و

ڕوومان کردە شەقامەکان. ئەمڕۆ سێشەمە، ٢٣ی جۆزەردان و چوارشەمە ٢٤ی جۆزەردان و پێنجشەمە ٢٥ی جۆزەردان، لاسایی گەشتیارانمان کردەوە و گوزەراندمان. ئەویش چی وا نەبوو بینووسینەوە.

عەسری پێنجشەمە بەرەو نەجەفاوا کەوتینە ڕێ، میوانی مامی جەعفەرقوولی بووین. وەختێ گەیشتین ماڵێکی گەورە بوو، ئێمەش ماندوو و شەکەت، بە دووی شێوکردندا خەوتین. بزانین بەیانی دنیا چ باسە.

## هەینی ٢٦ی جۆزەردانی ١٣٥١

بەیانی زوو سواری ماشێنی ئەسفەهان بووین و نەجەفاوامان بەجێ هێشت. لەوێشەوە بەرەو شاریکورد کەوتینە ڕێ. چاومان بە بەیتاڵ مرادی کەوت. هەواڵی پێ داین، شاریکورد و یاسووج دەبنە پارێزگە، ئیتر لەمەولا فەرمانداری دەسەڵاتی نامێنێ. جارێکی دی بەنێو شاردا سووڕاینەوە. مووساخانی جەهانگیریمان دیت گوتی، فەرامەرز مەحموودی گەڕاوەتەوە بۆ بیرگان.

دیگار بۆی باس کردم، ئەو قەومانەی چەند جۆر ئاژەڵیان هەیە (مەڕ، بزن، ڕەشەوڵاخ و...) ئەوانە لە بەرزایی کوێستانەکان دەژین. ئەوانە ناوەندێکی گشتی و ئێلاتییان هەیە. هەر وەك بەختیاریگەل، بەڵام ئەو قەومەی لە بیابان دەژین و تەنیا یەك جۆر ئاژەڵیان هەیە هەر وەك (وشتر) ئەوانە ناوەندی گشتی پێك ناهێنن. هەر وەك قەبیلەکان دوور لە یەکتر یەکدی دەژین، وەکو عەشایری سوورییە، هەر هەموویان وشتریان هەیە. دەیگوت، دەبێ بزانم بۆ وایە. لە شاریکورد هیچمان بۆ نووسین دەست نەکەوت. هەتا ئێوارەمان لێ داهات زۆر وەڕەز بووین و خەوتین.

## شەمە ٢٧ی جۆزەردان

دەمژمێر ٥ی بەیانی بزەی هەتاو لە خەوی هەستاندین. دەمژمێر ٦/٣٠ مووسا خانی جەهانگیری کۆت و شەرواڵ لە بەردا، بۆین باخ لە ملدا، هاتە ژوورەکەی ئێمە. نانی بەیانیمان بە یەکەوە خوارد. چەند ڕۆژ لەوە پێش لەماڵی جەعفەرقوولی تووشی کوڕەکەی هاتین. لێم پرسی، لەوێ چی دەکرد؟ گوتی: ماڵی خاڵی لەوێیە. چووبوو

«ئوزی» کۆ بکاتەوە. بۆی شی کردینەوە لەنێو بەختیاریدا ئەم نەریتە هەیە ئەگەر کوڕێك وەختی ژنهێنانی هات دەکەوێتە نێو تەواوی ئێل و تایەفەوە بۆ کۆکردنەوەی «ئوزی». هەر کەسە و لە توانایی خۆیدا لە پارەوە بگرە تا جوانەگا، هێستر، مەڕ، بزن و هەرچییەکی جێبەجێ ببێ دەیدەنێ. کەڵانتەر و بەچکە دەوڵەمەندان زۆرتریان دەست دەکەوەێت. چونکە ئەوان زۆرتر دەدەن. هەر ئەو خان جەعفەرقوولییە، کاتێك ویستی بی بی ئێران بێنێ، سی هەزار تمەن «ئوزی» کۆ کردەوە. ئێستەش کوڕەکەی من وەدووی «ئوزی» کۆکردنەوە کەوتووە. ماڵئاوایی کرد و بەجێی هێشتین.

چووینە گاراژ، جارێ ماشێن نەدەڕۆیشت. بەنێو شاریکورددا سووڕێکی باشمان لێدا، چووینە مزگەوتی ئەتابەکان. دەرگە دارەکە و بەردەنووسی سەردەرانەکەی نەبێ هەموو جێیەکی لە تازە دەچوو. دەبێ ئەمەش بڵێم، شێوازی مێعمارییەکەی کۆن بوو. نازانم لە کوێ خوێندوومەتەوە، ئەتابەکان لە کوردستانەوە هاتوونە ئەم ناوچەیە و لێرە دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرتووە و هەر بۆیە ئەم ئاواییە ناو نراوە «دێکورد» دواتر بووەتە شاریکورد. ئێستەش پیرەمێردانی بەختیاریی پێی دەڵێن دێکورد.

لە بولواری ئەتابەکەوە بە پیاسەکردن هاتینەوە بۆ گاراژەکە. دانیشتین هەتا نۆرەی ماشێنی ئێمە هات. شۆفێرێك لە تەنیشت ئێمەوە دانیشت و دەستی کرد بە دەردە دڵکردن. «ئێمەی شۆفێر زۆر ماڵوێرانین، هەرچەندێك پەیدا بکەین دەچێتە گیرفانی گاراژدارەوە. تەنیا ماندوبوون و دووری لە ژن و منداڵمان پێ دەبڕێ». زۆری لێ گوت و کەمان بەڵێ بۆ گوت، وردە وردە نۆرە گەیشتە ئێمە و کەوتینە ڕێ.

ئەمجارە ماشێن لە ڕێگەی باوە حەیدەرەوە ڕۆیشت، ئەوێش تەنیا بۆ تونێڵەکە لێ دراوە. لەو ناوەدا کەمتر لادێی لێیە، بەڵام زوو گەیشتینە شاریکورد. ئەوماشێنەی کە ٢ دەمژمێر زووتر لە مۆرغمەلەکەوە وەڕێ کەوتبوو دەمژمێرێك درەنگتر دەگەیشتە چلگرد. چووینە چایخانە و لەگەڵ خەڵکەکە ئەحواڵپرسیمان کرد. ئەوەی لەوێ دانیشتبوو هەر هەموویی باسی تونێڵیان دەکرد. ئەم تونێڵە لەو ناوەدا بووەتە هۆی سازبوونی جەنجاڵی لە نێوان ئێلخانی و حاجی ئێلخانیدا. هەر هەموویان لە ناخەوە شیر لە یەکدی دەسوون. تاکو کامیان سەرکەوتوو بن و قەباڵەی ئەم پرۆژەیە بەدەستەوە بگرن بۆ هێنانی خیز و بەرد و ئاگا لێبوونی. کەس وازی لە کارکردن نییە لەگەڵ کەسێکی

دیکە. چووینە لای گیوەچی تاکو دەسکی جانتاکەی دیگار تەقەڵ بداتەوە. نامەیەکمان بەڕێ کرد بۆ فەرامەرز، بگرە هێسترمان بۆ بنێرێت، تاکو سەردانێکی بکەین. کەوتینە ڕاوێژکردن، ئەگەر چارەوێی بۆ نەناردین بەبێ دواکەوتن وەگەڕێین بۆ تاران. لە دەڤەری کوهرەنگ بە بۆنەی کاری تونێڵەکەوە، کارکردن لەو دەڤەرە زۆر بە دڵەوە نانیشێت. کارکردن لەسەر کۆمەڵناسیی دەڤەرێکی ئارام و ئاسایی گەرەکە.

دیسان بەرێز سوڵتان عەلی پەرویزیمان بینی. جارێ هەر لەسەر مێژووی بەختیاریی خۆی هزری دەکردەوە و لە دەرفەتێك دەگەڕا چۆنییەتی خانانی ئێلخانی و حاجی ئێلخانی بخاتەوە سەر یەك. ناوی چەند کەسێکی برد و دەست بەجێ نووسیمەوە. ئەوانە زۆرینەیان لە یەك کات و سەردەمدا بوون و بە نۆرە دەبوونە ئێلخانی. هەڵبەت بە هیوام بە خێرایی هەوڵی خۆم بدەم. جارێ بۆ ئەوەی هەشتێ لە مشتێ بە دەستەوەیە لە بیرم نەچێتەوە بەم شێوەی خوارەوە دەینووسمەوە:

ئاغاکانی حاجی ئێلخانی
ئیمام قوولی خان
حەمە حوسێن خان (سەردار سپەهدار)
غولامحوسێن خان (سەردار موحتەشەم)
نەسیر خان (سەرداری شەڕ)
لوتفعەلی خان (ئامیر موفەخەم)
ئەبولقاسم خان
ئاغاکانی ئێلخانی
حوسێن خان
ئیسفەندیار خان
حاجی عەلی قوولی خان (سەردار ئەسعەد)
نەجەفقوولی خان (سەمساموسەلتەنە)
جەعفەرقوولی خان(سەردار ئەسعەد)
خەسرەوخان (سەردار زەفەر)

شەو هیچ کەس بە گەرمی ڕوویی تێ نەکردین. ئەگەرچی زۆرمان خەو دەهات خۆمان خافڵاند تاکو قاوەخانە چۆڵ ببێ و ئێمەش بخەوین. نیوەشەو مووسای جەهانگیری بۆ خەوتن هاتە قاوەخانە، لە خەوی هەستاندین، بەڵام ڕوومان پێ نەدا. چایچی قەرەوێڵەیەکی فەنەری بۆ کردەوە و ئەویش وەك ئێمە لە قاوەخانە خەوت. هەرچەندە ئەویش بەختیاریی و سەرۆك هۆز بوو.

## یەکشەمە ۲۸ی جۆزەردان

دەنگە دەنگی ڕادیۆ، گرمەی ترۆمبێل، خڕەی دەڕابەی دووکانەکان، دەمژمێر ٥ی بەیانی لە خەوی هەستاندین. نان و چایی بەیانیمان خوارد و چاوەڕێی فەرامەرز بووین. چەند پیرەمێردێك لە قاوەخانەکە بوو سەری قسەمان لەگەڵ دامەزراندن. پرسیم کام یەك لەو گوندانە پێش ڕەزا شا لە کوێستانەکاندا هەبووە؟ گوتیان: زۆرینەی ئەم گوندانە لە ساڵی ۱۳۱۲دا دروست کراون. لەبەرئەوەی گۆڕی ئیمام قوولی خانی حاجی ئێلخانی لە ئەردەل بوو،ە ئەو ناوچەیە بۆ خەڵکی بەختیاری جێی ڕێز و حورمەتە، چۆخەخۆر شوێنی ڕەشماڵی ئاغاکان بوو. تەنیا ئیزە هەبووە، بەڵام لە گەرمێن ئیزە و ئەندیکا و زۆرینەی لادێکان پێش ئەو مێژووە هەبوون. لە ساڵی ۱۳۱۲دا پێناسە «سجیل» یان دا بە ئێلاتی. پیرەمێردێك دەیگوت، کەی ئەوندە ئاژەڵ لەنێو ئێلاتدا هەبوو. لە ساڵی ۱۳۱۸دا مەزنترین مەڕداری تایەفەی بابادی پیاوێك بوو بە ناوی مەلیك، خاوەنی ۱۰۰ سەر مەڕ بوو. کەسێکیش لە مۆرییەکان ۱۰ سەری مەڕ هەبوو. ئەو کاتی ئێمە دەمانگوت، «وەختێ مەڕ بگاتە چل سەر، تازە کۆز چۆڵ نابێ» ئەمەش پەندێکە لەنێو ئێمەدا. لە ساڵی ۱۳۱۲دا وەختێ دەستووری تەختەقاپۆکردنی عەشایر دەرکرا، تەنیا شوانەکان دەیانتوانی ڕانەکە ببەنە گەرمێن و کوێستان، ژن و منداڵ مافی ئەوەی نەبوو لەگەڵیاندا بچێت. لە گەلاوێژدا عەشایر دیسان گەرمێن و کوێستانی دەست پێ کردەوە و یەك خانێك لە دوای ۲۰ی گەلاوێژ کە هاتە بەختیاریی خوالێخۆشبوو، ئەبولقاسم خان کوڕی ئەمیر موفەخیم بوو. وازی لە فەرمانداری کاشان هێنا و هاتە نێو ئێلەکە و بوو بە خان. سەبارەت بە دەسەڵاتداری بەسەر زەوی و زارەکاندا دەیگوت، تەواوی منداڵ و

منداڵی تیرە و تایەفەکانی بەختیاری بنجاقی خاوەنداری بۆ بەشی خۆی هەیە و لە کۆنەوە وەریان گرتووە. تەنیا تیرەی «لەك» نەیانبوو، ئەوان لە لوورستانەوە هاتبوون و لە خزمەت خانەکاندا بوون، بە بێ زەوی و زار، بەڵام خان بۆ ماوەیەك زەوییان پێ دان، ئەویش بۆ لەوەڕگە. هەر ئەوانیش دواتر زەوی و زارەکانیان کڕی. لەوەڕگەی ناوچەی شێخ عەلیخان تایبەتە بە ئارپەنایەکان ئێجگار گەورە بوو، ئاژەڵداران لە دوورەوە دەهاتن و لەوەڕەکەیان دەکڕی و مێگەلی خۆیان تێ دەکرد. دوای ئەوەی دەوڵەت دەستی بە سەردا گرت، ئەوانیش ڕێگەپێدانی لەوەڕگەیان وەرگرت، بەڵام تەنگگزی نەچووە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتەوە، بۆ ئەوەی لەوەڕگە بۆ تایەفەکە کەم بوو.

دەمژمێر بوو بە ١٠/٣٠ ئێمە چاوەڕێ و فەرامەرزی هەر نەهات. ئەحمەد سمالی زاوای جەعفەرقوولی بۆ نانی نیوەڕۆ هات بە شوێنماندا. هەر لەو ساتەوەختەدا خواڕەحمی وەرزێڕ خەبەری پێ داین ، ئاغا فەرامەرز چارەوێی بۆ ناردوون. چووینە ماڵی ئەحمەد سمالی. هەر وەك دیگار گوتی، پڕ بوو لە شەڕواڵ تەنگان. ئەحمەد سمالی مامۆستای فێرگەیە. دوای نانخواردن خۆمان گەیاندە چایخانە. بۆ ئەوەی قەرزەکانمان بدەینەوە. لەوێ تووشی حەمە خانی پەرویزی هاتین، بە سواری ئەسپ دەهات، چەند سوارێکیش لە پشت سەری. تەواو بە شکۆیەکی خانسالارییەوە. خێرا ماڵئاواییمان کرد، لەگەڵ چارەوێکاندا گەیشتینە بەندەنەکە و لەوێوە سوار بووین، دەمژمێر ١/٣٠ دوای نیوەڕۆ وەڕێ کەوتین.

دەمژمێر ٥ی دوانیوەڕۆ گەیشتین. شەکەت و ماندوو، تەواویان کۆ بوونەوە، فەرامەرز مەڕێکی ون کردبوو لێی دەگەڕا. بە یەکەوە سەرکەوتین بۆ بەندەنەکە. دەربازگەی چەری لەبەر دەمماندا بوو پڕ لە ئاو. هەر وەختێ داربازگەی زەردە بوار نەدا، خێڵاتی بە چەریدا تێ دەپەڕن. هاتینەوە بۆ نێو ڕەشماڵەکە. فەرامەرزی دەیگوت، بەنێو ڕانەکاندا گەڕاوین لە هیچ لایەك سەر و سۆراخمان نەکرد. هەواڵیان دا بە شوانەکانی دیکە ئەگەر بەو ناونیشانە مەڕێکیان دۆزییەوە بۆمان بێننەوە. دواتر دەرکەوت ئەو مەڕە تێکەڵ ڕانەکەی خۆیان بووە.

شێویان هێنا، پڵاو و گۆشت و خوڵکی گەرمی نەجەف خان. هێندەی خۆرشت کردە سەر برنجەکەی دیگار وەڕەزی کرد. ناچار گوتی دە بەسە. وەختی خەو هات و زۆریش بە کیسەخەوی ئێمە پێکەنین.

**دووشەمە ٢٩ی جۆزەردان**

خواردنی بەیانی سەرو پێی شەوێ بوو. دوای نانخواردن ڕوومان کردە کەژ و کۆ، لە تەنیشت ڕەشماڵێك مریشکیان لە سەبەتەیەکدا نابووەوە. لەو دەر و دەشتە ژنان خەریکی هەڵکەندنی گژوگیای خۆراکی بوون. فەرامەرزمان لەگەڵیاندا بوو بە بێ ڕووبینی لەگەڵیاندا قسەمان دەکرد. هەڵکەندنی ڕووەکی کێوی لە زیمەی ژنانە. پرسیارمان لێ کردن تاکو بزانین لەو کارەی ئەوان چیمان بۆ نووسین دەست دەکەوێت.

«کەرسم»، گیایەکە وشکی دەکەنەوە، دواتر بە هێڵەك دایدەتەقێنن، لەگەڵ خوێ تێکەڵی دەکەن و دەیکەنە نێو گۆشتا و، زۆریش بە تامە و لە سەرەتای هاویندا دەست دەکەوێت.

«گەندۆلە»، گیایەکە لە کوێستانێ دەست دەکەوێ، لە سەرەتای هاویندا، وشکی دەکەنە و دەیکوڵێنن، لەگەڵ ئاوی ڕووبی هەنار تێکەڵی دەکەن بۆ خوریڕەنگکردن، ڕەنگی زەردی جوانی لێ بە دەست دێت.

«کلوس، کەرەوز» نێرکەکەی وەشك دەکەنەوە بۆ نێو دۆ، ئەویش لە هاویندا دەست دەکەوێ.

«تەڕە»، گیایەکی بەهارییە وشکی دەکەنەوە و تێکەڵ بە گۆشتاوی دەکەن.

«بن سوور، قونسوور»، بە تەڕی و بە وشکی دۆکڵێوی پێ لێدەنێن، ئەویش بەهاران هەیە و دەخورێ.

«کارگ، قارچك» لە ڕۆندا سووری دەکەنەوە و دەیخۆن.

«گوێنی» پێشتر باسم کردووە، گەرد و گوڵی دەگرن و دەیفرۆشن (کیلۆی بە ٢٠٠ قڕان) کەتیرەی ئەو گیایە دەگرن و کیلۆی ١٢٠ تا ١٥٠ قڕان دەکات.

«برنجەسووری» یەکجار زۆرە و دانەکەی دەردێنن، لە شێوەی ساوەر دەیکوتن، ئەویش بۆ دۆکڵێو بەکار دێت و لە سەرەتای هاویندا دەست دەکەوێ و ڕەنگی سوورە.

«موسیر» بنەکەی لە شێوەی پیوازە و چەند جارێك لە ئاودا دەیکوڵێنن، وەختێ تامی خۆش بوو بە ڕۆنەوە دەیکوڵێن و دەیخۆن.

هاتینەوە بۆ ماڵێ و ماڵی فەرامەرز ٥ ڕەشماڵە و دانەیەك لە چادرەکان تایبەتە بە میوان. ئەمبەری ئاوبیرگان بامدی و ئەوبەری ئاوی بیرگان بێهداروەندین، تا دەگاتە شەهریاری و سەرووی یاوەرئاوا هەمووی چادر و ڕەشماڵە و لەوێشەوە تایەفەی شەهنی و مول مولین. فەرامەرز گوتی: وا دیارە شەوی ڕابردوو «جونەوەر»، هاتۆتە نێو ماڵەکانەوە، لێم پرسی مەبەستت لە جونەوەر چییە؟ دواتر زانیم هەر ئاژەڵێك گیاخۆر بێت و ماڵی بووبێ، پێی دەڵێن، «حەیوان» هەر ئاژەڵێك لە دەر و دەشت بژی و دڕندە بێ بە «جونەوەر» ناوی دەبەن. هەر گیاندارێك بتوانێ بفڕێت پێی دەڵێن «باڵندە» بۆ مێش و مەگەز ناوی گشتییان نییە. دواتر گوڵە گەنمێکم هەڵگرت و نیشان فەرامەرزم دا و بە وردی پرسیارم لێ کرد تا بزانم ناوی لووڕیان لێ ناوە و ئەو ناوانە لە کوێوە هاتووە؟ گوڵەگەنم «پورێن» بوو، توێکڵی گەنم «سوست»، قەڵتاس «داسە»، گەڵای گەنم «پەڕ» لاسکی گەنم «قر»، گوڵی گەنم «هوشە»، ڕیشەی گەنم ڕیشەیە و لقە گەنم «هێلور» چەکەرەی گەنم «تیف».

هاتینەوە نێو چادرەکە، لەگەڵ ئاغا نەجەف دانیشتین. هەر وەك پێشتر باسم کرد، ئاغا نەجەف، کوێخا و کەلانتەری ئیلە، هەر لە کۆنەوە خزمەتی بە خانەکان کردووە. جانتای پڕە و زۆر شتی بۆ ئێمە پێیە، ئاغا نەجەف گوتی: وەختێ شاخکردنی ئێل کۆتایی دەهات کەلانتەران هەر کەسە و هەق و بەراتی یاسایی خۆی بەم شێوەی خوارەوە وەردەگرت: ٤ سەر کاوڕ، ٤ سەر مەڕ، ٤ مەن ڕۆن، ٦٠ تمەن پووڵی نەغد، ١٠٠ تا ٢٠٠ مەن گەنم. جگە لەمانە کەلانتەران و کوێخایان داهاتی دیکەیان هەبوو. ئەگەر ماڵێك دزرابا ئەوان دەیانگێڕایەوە بۆ خاوەنی و لە دەشت شتێکیان وەبەر دەکەوت و دزەیان جەریمە دەکرد. وەختێ میوانیان دەهات گیسك و کاوڕیان لە خەڵکەکە دەسەند. هەڵبەت سامانی خۆیان شاخ نەدەکرا و ماڵیاتیان نەدەدا. لەنێو وشەکانیاندا ئەم شتانەم دەبیست: مەڕ «میشون»، هێسترەکان «قاترون»، بزن «بزگە»، بەرخەکان «بەرەیل»، ئەوانەیان بەسەر یەکەوە دەگوت. دەنگی شیوەن و گریان لە چادرێك بەرز بووەوە، تازە کچێکیان دابوو بە مێرد بە زەڵقیگەل، دە ڕۆژ لەوە پێش مردبوو. گریانێکی بە سۆز و کوڵ، بەردی دە تاواندەوە. فەرامەرز، بابی، خێزانی، براکەی، دایکی، خوشکی شووەکەی نەمابوو، دوو منداڵی خوشکی، سێ منداڵی فەرامەرز تەواویان لەو ڕەشماڵەدا دەژین. سەد سەریان مەڕ هەیە. دە سەر بزن، ١٥٠ مەن

زەوی لە کوێستان و ١٥٠ مەن لە گەرمێن. تاوێك بۆ پیاسەکردن دەرکەوتین و دواتر هاتینەوە نان و ماستێك بخۆین ددانم شکا.

پیرەمێردێك بە دەم قسەکردنەوە بە چەقۆیەك سەرقاڵی تاشینی داردەستێك بوو. سەرەتا وامانزانی بۆ کات ڕابواردن خەریکی ئەم لقەدارەیە. دواتر سەیرمان کرد دەستکردەکەی بوو بە جۆرێك تەشیی خوریڕستن، سێ لقی پێوە داوە بۆ هەڵپێچانی بەنە بادراوەکە. ئەمڕۆ تەشیڕێسی کارێکی بەرچاوی ژنانە و دواتر ئەم بەنە بادراوانە ڕەنگ دەکەن و بۆ تەون و چنین بە کاری دەهێنن.

عەسر هەواڵیان هێنا مانگای پیرەمێردی کچ مردوو ون بووە، ئەوجا دایکە لەلایەك بۆ کچەی لە دەستچووی دەگریا، لە لایەکی دیکەش بۆ مانگابۆری!. گریانێکی خەمناك و دڵبرژێن. ماڵی پیاوێك دەرکەوتن بۆ دیتنەوەی مانگای خاڵۆ پیرە. درەنگانێکی شەو هاتنەوە بە بێ مانگابۆر. قەراریان دا بەیانی بۆی بگەڕێن. ئێمەش هیچمان بۆ نووسین دەست نەکەوت و خەوتین بزانین بەیانی چی ڕوو دەدا.

## سێشەمە ٣٠ی جۆزەردان

بەیانی بە دەنگی مەشکەژەندنی ژنێك وەخەبەر هاتین. نانی بەیانیمان خوارد و لە ڕەشماڵ دەرکەوتین. ناسر ژنبرای فەرامەرز چوو هێسترێك بگرێت و پێی بچێتەوە بۆ ماڵی خۆیان. ئەمەش گرفتێکە بۆ هاموشۆکردنی خەڵکی بەختیاری. لێرە یەکسمان لە دەر و دەشت بە ئازادی بڵاو دەبنەوە و دەلەوەڕێن و ئەگەر کەسێك بەتەما بێ بە سواری بچێ بۆ شوێنێك دەبێ چەند دەمژمێر بکەونە ڕاکردن تاکو دەیانگرنەوە. ئێمەش لە دوورەوە سەیری ڕاوە هێستری ناسرمان دەکرد. لەوسەری دۆڵەکە ئاخری هێسترێکی گرت و خۆی خستە سەر پشتی و بەرەو ژوور هاتەوە. جلێکیان دا بەسەر پشتیدا و بەرۆك و پاڵوویان لێ توند کرد. بە گوریس پەتوویان لێ قایم کرد و ناسر سوار بوو ڕۆیشت. ئێمەش چووینە چادرێك و وێنەی لانکەیەکمان گرت. لەگەڵ وێنەی بلوێری منداڵەکە. بێشکەی منداڵە بەسەر سنگە و دەسرازە و سەردەمە ڕازا بووەوە. زۆریش متوموورو گۆشگرە و کوژەکەیان پێدا هەڵواسیبوو. تەواوی ئەو پێشە و مووروگەلە بە خەیاڵی خۆیان بۆ بەرگریکردن لە چاوەزار کراوە بەم لانکەیەدا. بیرو باوەڕی سەیر و سەمەرە. بۆ

بەرگریکردن لە مارگەزین و...، چەند وێنەیەکمان لەسەر تاشینی منداڵان هەڵگرت، قوولیك تووکیان لە پێشەسەری دەهێشتەوە و مابەقییان بۆ دەتاشی. چەند منداڵێ خەتەنەکراومان چاو پێ کەوت، لە فەرامەرزیم پرسی، داخۆم بۆ خەتەنە سووران جەژن دەگرن؟ گوتی نا. دەلاك دێت و هەر بەو کەرەستەی پێیەتی منداڵان خەتەنە دەکات، ٥ تا ٢٠ تمەن وەردەگرێ و دەڕوات. زۆرتر منداڵان لە تەمەنی دوو ساڵیدا خەتەنە دەکەن و خۆڵەمێشی بۆ دادەتەقێنن بەم خۆڵەمێشە بەرگری دەکەن لە خوێن بەر بوون و زووش چاك دەبێتەوە. جانتای دەلاك لە ڕەشماڵەکەدا بوو، وەختێ تەماشامان کرد گوێزانێکی سەرتاشین و قامیشێکی تێدابوو. چەند ئافرەتێکمان دیتبوو خاڵیان کوتابوو. لەگەڵ فەرامەرز ڕوودەربایتسمان نەبوو، پرسیم ژنان چۆن خاڵ دەکوتن؟ گوتی: قورم تێکەڵ بە «زەهلە»، سەفرای مانگا دەکەن و لەو شوێنەی دادەنێن کە خاڵی لێ دەکوتن. ئەوسا بە نووکی دەرزی دەرزی ئاژنی ئەکەن ئەم مادده ڕەشە لەگەڵ خوێن تێکەڵ دەبێ و دەچێتە ژێر پێستەوە و دەبێ بە خاڵی کوتراو. لە فەرامەرزم پرسی، بۆچی بە تایەفەی ئێوە دەڵێن «بامدی»؟ گوتی «بامدی هەر بابا ئەحمەدییە، ٤٠٠ ساڵ لەوە پێش یان زۆرتریش! من باش ئاگەدار نیم، بابا ئەحمەد، دەڵێن برای ئیمام ڕەزایە! بە هۆی ئەوەی منداڵی نێرینەی نەبوو حەسەن عەبداڵ و محەمەد عەبداڵ بە کوڕی خۆی قبووڵ دەکات، تایەفەی بابادی تۆرەمەی ئەو دوو کەسەن، بەناوی بابا ئەحمەدی ناوبانگیان دەرکردووە. تش «(برام» ئێمە لەوانین لە بنەچەکەی حەسەن عەبداڵ، ئەو سەیدانەی لەنێو تایەفەی بابائەحمەدین، سەید نەبوون، بگرە ئەوانە شێخن، دەرکەماڵی ئەو حەزرەتە بوون.» ئەوەی ئەو گوتی منیش نووسیم.

ماوەیەك بوو نیشانەی خاوەنداری لەسەر ئاژەڵەکان لەو ئێلەدا سەرنجی ڕاکێشابووم. فەرامەرز گوێچکەی زۆرینەی ئاژەڵەکانی بڕیبوو. هەر دەبوو تەواوی ئەوانەم لە یەك شوێندا بنووسیبایە. ئەمڕۆ لە بێهداروەندان و بامدیگەل چەند کەس لێرە بوون. (خەزووری فەرامەرز بێهداروەندە) لەمەڕ ئەم بابەتەوە زۆرم پرسیارلێ کردن. زۆریان داخی پێوە دەنێن و هەندێکیان گوێیان دەبڕن. بە گشتیی کەفەڵی وڵاخ و ڕوومەتی بزن و مەڕ داخ دەکەن. یان ئەوەی گوێچکەی مەڕ وەك نیشانەیەك دەقرتێنن. هەر کەسە و ناونیشان و نیشانەی خۆی دیارە. نیشانەکانی سەر ڕانی ماین و هێستر و ئەسپ و کەر،

لەسەر کەفەڵیان دەدرێ، هەر ئەو نیشانەیەش لەسەر ملی گا و مانگا دەدەن. بامدییەکان بە شوان دەڵێن «شون». بە بەرخەوانیش دەڵێن «بەرگلون»، بە شوانی بزن دەڵێن «بزگەلون»، بە کارەوانیش دەڵێن «بی گەلون»، بە گاوان «گاگلون»، بە کەردار، یان کەرەوان «هەرگلون»، هەروەها بە ڕەوکەوان کە برێتییە لە ئەسپ و ماین و هێستر «رەمەخون»، بە باشمان زانی چەند پرسیارێك ئاراستەی خەزووری ئاغا فەرامەرز بکەین. لەسەر تیرە و تایەفەی بێهداروەند. ئێمە پرسیمان و ئەو گوتی: بێهداروەند یان بەختیاروەندەکان ٢٤ تیرەن ئەوانەش برێتین لە:

بێهداروەند، بەختیاروەند:

عەلاوەدینوەند، مەنجزی، بلیوەند، مەش مەرداسی، مقام ڕەگی، ئەسکەنی، دێهناشی، شێخ ئەحمەد بەلەد، پیر ساڵح ئیبرام، للڕی، کیارسی، تیریدی، عالی جەمالی ــ فیرگینی، گەندایی، تەکی، زەیلایی، مارە پەن، سوورخابی، ئۆلیکی، کاڵە، چەنگویی، براماڵی، گیرما.

خانەکان هەموویان لە عەلاوەدینی بوون. مەنجزی لە منداڵی ئەسەدخانی گەورە.

ئەم بێهداروەندە دەیگوت: بازفت، دووئاوانی شامەنسووری، چەلو، شیرین بەهار، شەلاّ و سەرتەنگ شێرکوژ، موڵکی بێهداروەندان بووە. ئێستە مۆریگەل لەوێ دەسەلاّتدارن. مۆریگەل سەرەتا لە شوێنێك بە ناوی مۆری هەر لەو بازفتە بوون، ناوەکەشیان بە سەردا سەپا. دواتر خانەکان تەنکەیان کردن و بە تەواوی بازفتدا بلاّو بوونەوە. خۆیشی لە تیرەی مەنجزی بوو دەیگوت: نێزیکەی ١٥٠٠ بنە ماڵەن و ئەمانەش بەرەو عەوادی منجزین:

مەنجزی

لێوخوردە، ڕێوی، تاجەدین عەبدولاّیی، بولحەسەنی، بونیحە، لم لمی، ماڵ ئەحمەدی، پڵنگ، هەیتیوەند.

هەڵبەت لەگەڵ ئەو شتانەی پێشتر بەرگوێم کەوتبوون، زۆرم پێ باش نەبوو. دەبێ دواتر پرسیار بکەم، بەلاّم جارێ دەبێ بنووسم. سەبارەت بە منداڵی پڵنگ گوتی، سەری منداڵەکە وەك سەری پڵنگ وا بووە. هەر بۆیە بە پڵنگ بە ناوبانگ بوون. گوتی، عەلی

سالّح خان له خانەكانی بەرماڵی بووه. ئەو بەختیارییانە هەمیشە باسی شەڕە بە ناوبانگەكانی ئێل دەكەن. شەڕی كۆلۆنجی، شەڕی ئەندكا و هی دیكەیش، خراپ نەبوو ئەگەر سەبارەت بەم بابەتە لەم پیرە مێردە چەند پرسیارێك بكەم، بزانم ئەو شەڕانە كەی ڕوویی داوە، لایەنی شەڕەكان كێ بوون لەم ڕەوەند و كۆچەرانە، گوتی:

شەڕی كۆلۆنجی - لە دۆڵی كۆلۆنجی لە ناوچەی بیرگان لە نێوان دوری و بێهداروەندەكماندا ڕووی داوە، سەركردەكانی دوركی ، ئەلیاس خان و جەعفەرقوولی دوركی بوون و سەركردەكانی بەختیاروەند، ئەسەدخانی بەختیاروەند بوو، چراغعەلیخان و كەلبعەلی خانی دوركی و براكانی جەعفەرقوولی خان كوژران. ئەو شەڕە لە ساڵی ١٢٢٧ی كۆچی مانگیدا ڕووی داوە.

شەڕی ئەندیكا- لە شوێنی ئەندیكا، لە نێوان چوارلەنگ و بێهداروەندەكاندا ڕووی دا و، نەجەفقوولی برای جەعفەرقوولی خانی بێهداروەند بە دەستی زۆراب خانی چوارلەنگ كوژرا، بەڵام شەڕكەرانی چوارلەنگ تێك شكان. ئەم شەڕە لە ساڵی ١٢٤٥ی كۆچی مانگیدا قەوما.

شەڕی شەوخوێنی ئەندیكا- لە ١٢٥٠ كۆچی مانگی لە ئەندیكا لە نێوان دوركی و بێهداروەندەكاندا ڕوویی دا، سەیدال مەندەنی بێهداروەند بە دەستی دوركیان كوژرا.

شەڕی مونار- لە كێوە مونار، شەڕی دوركی و بێهداروەندان دەستی پێ كرد و جەعفەرقوولی دوركی بە دەستی جەعفەرقوولی بێهدارەند كوژرا، لە ساڵی ١٢٥١ی كۆچی مانگیدا.

شەڕی نۆ هەزار چۆغاخۆر- لە نێوان بێهداروەند و دوركیدا ڕووی دا، بێهداروەندان تێك شكان و بۆ هەمیشە بڵاو بوونەوە و دوركی هاتنە سەركار. ئەو شەڕە لە ساڵی ١٢٤٣ی كۆچی مانگیدا قەوما.

هەروەها جەعفەرقوولیخانی بێهداروەند لە ساڵی ١٢٧٧دا گیرۆدەی زەلل سوڵتان بوو. لە دەورەی جەعفەرقوولی خانی بێهداروەند، چوار تیرە بە ناوەكانی «كەهكەش» «بابێر ساد» حەمۆلە» و «پیر بوێر» كۆی ئەوان بە «سوهونی» بە ناوبانگن (ئەم ناوەش لە سێ هونەیی، سێ ماڵی وەرگیراوە و كاهكەش، بابێرساد و پیر بوێر دەگرێتەوە).تەواوی ئەوانە دەچنەوە سەر چوارلەنگ و پاڵ دەدەن بە جەعفەرقوولی

بێهداروەندەوە، بۆ ئەوەی شەڕ نەکەن. ئەگەر تێکەڵ بە چوارلەنگ نەبن تێکەڵ بە حەوت لەنگ دەبن. ئەمەش بیرەوەری ئەم چەند پیرەمێردە بوو، منیش یادداشتم کرد. ڕەنگە ڕۆژێك بۆ نووسینەوەی مێژووی بەختیاری گۆڕانکارییی لە ئێلدا بە کار بێت.

تەواو ماندوو بووین و دەمەو ئێوارەش بوو. لەگەڵ فەرامەرز چووینە دەرێ نەختێك بای باڵمان بدەین. لە بەر ملی گایەك نیشانەیەکم چاو پێ کەوت. پرسیارم کرد، فەرامەرز گوتی: زۆر کەس نیشانەی خۆی لە شۆرابەی بەر ملی ماڵاتەکەی دەدا. بەشێکی کەمی لێ دەبڕن، پێی دەڵێن «تەلون بڕاو» لەسەر نێوچاوانی گوێلکە ساوا، نیشانە یەك بە جێ دەهێڵن بە ناوی «سەر نوفت بڕاو» وەختێ چەرمەکە دەبڕن بە تاڵە بەنێك توند دەیبەستن، دواتر وەك نیشانەیەك دەمێنێتەوە.

هاتینەوە و شێوێکی سووکمان خوارد، لە بەر دەرگەی ڕەشماڵەکە لە دەوری ئاور کۆ بووینەوە، لەگەڵ دیگار قسەمان کردبوو بە بۆنەی تونێڵەکەوە مانەوە لەنێو ئێلدا باش نییە و بۆ ماوەیەك بەجێیان بێڵین. دوور نییە سبەی وەڕێ بکەوین، کەمەکێك شەکەتی بە دواوەیە. سەبارەت بە ئەستێرەکان پرسیارم لە ئاغا نەجەف کرد: سەرێکی بۆ لەقاندین و گوتی: یەکەم «هەسارەی نەحس» ئەم هەسێرەیە، یەکەم مانگ لە خۆرهەڵاتە، دووەم مانگ لە نێوان خۆرهەڵات و باشووردایە، سێیەم مانگ لە باشوورە، لە چوارەم مانگدا لە نێوان باشوور و خۆرئاوایە، مانگی پێنج لە خۆرئاوایە، مانگی شەش لە نێوان ڕۆژئاوا و باکورە، مانگی حەوتەم لە باکورە، مانگی هەشت لە نێوان باکور و ڕۆژهەڵاتە، مانگی نۆ لە دڵی زەویدایە، ئەو لەگەڵ ئەستێرەی دیکە شەڕیەتی ئەو هەسارەیە هەسارەی نەحس بە زەویدا دەباتە خوارێ. مانگی دە بە تاقی ئاسمانەوە دەمێنێ. لە یازدەوە تا نۆزدەهەم هەر ئەوە دووپاتە دەبێتەوە. لە بیستەوە تا بیست و نۆ دیسان دەست پێ دەکاتەوە. بە هۆی ئەوەی ئەم هەسارەیە ڕۆژەکانی نۆیەم و نوزدە و بیست و نۆ دەچێتە دڵی خاکەوە، ئێمە ئەو ڕۆژە پاچ و بزمار بە زەویدا ناکێشین. واتە نە جووت دەکەین، نە چادر هەڵدەدەین. لە ڕۆژەکانی دە و بیست و سێ دا بە هۆی ئەوەی هەسارەکە بە حەواوەیە، هیچ جووڵەیەکی حەوایی ناکەین، واتە نە بار بەرز دەکەینەوە نە ئاژەڵان بار دەکەین. ئەگەر ڕۆژێك ئەستێرەکە لە هەر لایەك بێ ئێمە بۆ ئەو لایە ناچین. سا کۆچکردن بێت یان هەر جووڵەیەکی دیکە. بۆ کۆچکردن ڕۆژێك

هەڵدەبژێرین ئەستێرەکە بکەوێتە پشت سەرمان. هەڵبەت نەحسی ئەستێرەکە لە هەر بابەتێکەوە لە ڕۆژی یەکەمدایە. واتە ئەگەر وەڕی کەوتین و لەو ماوەدا هەسارە کەوتە بەر دەممان، تا ئەو کاتەی ڕاوەستانەکەمان زۆر نەبێ هەسارە نەحس نییە، بەڵام ئەگەر ڕاوەستان درێژە بکێشێت، دیسان باسەکانی نەحسی ئەستێرە لە بەرچاو دەگرین. ئەستێرەیەکی دیکەش کە ئێمە دەیناسین هەسارەی سیوەیلە، ئەویش لە سەرەتای هاوین و سەرەتای پایز لە خۆرهەڵات دەردەکەوێت. ئەمەش بۆ ئاژەڵەکانی ئێمە زیانی هەیە. بۆ ئەوەی لە بەڵا بە دوور بین لەو ڕۆژانەدا حەیوانەکانمان ڕەنگ دەکەین. سەرەتا توێکڵی بەڕوومان لێ دەدا. ئێستە تەختی نێوچاوان یان پشتیان ڕەنگ دەکەین. تا دەهات شەو خۆی لە کورتی دەدا، ئێمەش نەماندەویست لەوە زیاتر ئاغا نەجەف ماندوو بکەین، خۆمان خزاندە ئامێزی خەوتنەوە.

## چوارشەمە ٣١ی جۆزەردان

بەیانی زوو لەخەو هەستاین، خواردنمان بوو بە نان و ماست و ڕۆنەکەرە. فەرامەرز بە تەما بوو بۆ کاروباری تونێڵ بچێ بۆ چلگرد. ئێمەش قسەی خۆمان تەواو کرد و وەڕێ کەوتین. کاروباری ئەو تونێڵە نەك هیچی بۆ ئێمە پێ نەبوو، تەنانەت لەبەر دەم کارەکانماندا ڕێگر بوو. وامان بە باش زانی خۆ مەحتەل نەکەین. شاناز لە ئەسفەهان لە ئێمە هەڵبڕا، ئێستە ئەو لە کرماشان چاوەڕێی دێگار بوو. منیش حەزم دەکرد خێرا بگەمە تاران. لە مێژ نەبوو دەزگیراندار بووم. وەڕێ کەوتم. ماڵئاواییمان لە هاوڕێیان کرد و بە یەکەم پیکاب گەیشتینە شاریکورد. شەوێ لە شاریکورد گیر بووین و بەیانی گەیشتینە ئەسفەهان. لەوێشەوە بەرەو کرماشان وەڕێ کەوتین بۆ ماڵی خەزووری دیگار.

# سەفەری سێیەم

## ٢٣ ڕەزبەری ١٣٥٢

دەمژمێر ٥/ ٨ی بەیانی لە تاران دەرکەوتین. بۆ ئەم سەفەرە ترۆمبێلێکی شاسی بڵند تایبەت بە ئیدارەی لێکۆڵینەوەی ئەنێستیتۆی ئێران و فەرەنسا لە خزمەت ئێمەدا بوو، دیگار لێی دەخوڕی. هەر وەك لە ڕێکەوتی دەرچوونەکەوە دیارە ئامانجی ئەو سەفەرەمان گەرمێنی بەختیارییە. واتە ناوچەی خوزستان. سەرەتا دەبوو بچینە ئەهواز، کاروباری ئیداری تەواو بکەین، دواتر بە بێ هیچ گرفتێك تێکەڵ بە ڕەوەندان ببین. بە بێ ئەوەی لە شاری ساوە لابدەین، تێپەڕین و بەجێمان هێشت. زۆرتر ئامانجمان ئەوە بوو نێر و ئامووری جووتکردن ببینین بە جیاوازی ناوچەکانەوە. لە دەوروبەری ساوە ئامووریکی ئەسفەهانیمان چاو پێ کەوت. بە ئەراکدا تێپەڕ بووین و کەم و زۆر تووشی چەند ئامووریك هاتین. هەروەك بەختیاریگەل دەیانگوت یەك دەستی. تا زۆرتر بەرەو باشوور دەچووینە پێشێ ئەم کەرەستەیە زۆرتر بوون. ئەمەش لە مەلایر و ئەراکەوە دەست پێ دەکات. نێزیکەی دە کیلۆمەتری ماوە بۆ ئەراك چووینەتە ڕێگەی خوڕەمئاوا. لە سەرەتای دووڕێیاندا لە چایخانەیەك وێستاین، بە دەم چاخواردنەوە پشوویەك بدەین. چەند کەسێکی خەڵکی ئەم لادێیانە لەو چاخانەیە مەحتەلی ماشێن بوون، هەستمان ڕاگرت بزانین بە زمانی لووڕی قسە دەکەن، کەچی وانەبوو، ئەوە فارسییە و بن زاراوەی دێهاتی تێکەڵە، تەواوی وشەکان بۆ فارسزواتان نامۆ نییە. وەڕێ کەوتینەوە و لە یەکەم بەنزینخانە

ڕاوەستاین و نەخشەی ئێرانمان کڕی بۆ ئەوەی ون نەبین. وردە وردە خەریك بوو تاریك دادەهات و ماشێنەکان چرایان هەڵدەکرد. تا گەیشتینە خوڕەماوا دیگار باسی ناوندی لێکۆڵینەوەی جیهان و فەرەنسای کرد و ئەو ئارشیوانەی کە لەبەر دەستدان و ئاسانکاری لەوێ زۆرترە. وەختێ گەیشتینە خوڕەماوا یەك سەر چووینە ماڵی لووڕێك، دۆستێکی دێرین و شارەزا لە مێژووی گەلان. تاکو درەنگانێکی شەو خۆمان بە خوێندنەوە و یاداشتەکانی ئەو برادەرەوە خەریك کرد. سەبارەت بە «خینە چو» قسەم بۆ کرد و لێم پرسی ئاخۆ لە دەڤەری لووڕستان ئەو شتە هەیە؟ گوتی: نییە. شتێکمان نییە بە ناوی «خینە چو»، بەڵام شتێکمان هەیە پێی دەڵێین «سەگ چاڵ» سەرۆك هۆزەکانی تایەفە بۆ ئەوەی ببنە پشت و پەنای یەکدی، بە بەرچاوی کۆمەڵێك لە مەزنە میر و گەورە پیاوانەوە سەگێك دەتۆپێنن و چاڵی دەکەن. بەو واتایەی ئەو کەسەی پەیمان بشکێنێت ئەوە گۆڕی بابی ئەو بێت. ئەمەش بەڵێنێکە و ناشێت ژێر پێی بنێن. «سەبارەت بە تەسالحە و خوێنبەست» چەند پەیڤێکی درکاند: بکوژ، کفن دەکاتە بەری و قورئان و خەنجەرێك بە دەستەوە دەگرێ، لەگەڵ چەند ڕیش چەرموودا دەچێت بۆ ماڵی کوژراوەکە، ئەمەش ئەوە دەردەخات یان بەم خەنجەرە بمکوژن یان بە حورمەتی ئەو قورئانە لە تاوانم خۆش بن. لەو ڕێوڕەسمەدا خاوخێزانی کوژراو دەیکەنە شین و شەپۆڕ و خۆرنین و وایلۆکچڕین، ئەوسا کەیخودای ئەو ماڵە بە حورمەتی قورئانەکە لەو خوێنە خۆش دەبن و بکوژەکە ئازاد دەکەن و بنەماڵەی بکوژ کچێك دەدەن بە ماڵی کوژراوەکە و خزمایەتی دەست پی دەکات، بەم نێزیکبوونەوەیە خوێنەکە دادەکوژێ. هەڵبەت جگە لەو کچە پووڵ و پارە یان مەڕ و ماڵات دەدرێ بە ماڵی خاوەن مردوو. ئەم کەشەیەش زۆر شەکەت بووین و خەوتین.

## ٢٤ی ڕەزبەری ١٣٥٢

دەمژمێر ٨/٥ی بەیانی بەرەو ئەهواز کەوتینە ڕێ. مەودای ڕێگە تا پولدوختەر ئێلاتی لووڕ بە ڕێگەکەدا دەهاتن و کۆچ و باریان وەپێش خۆیان دابوو. دوای پولدوختەر هەوا گەرم دەبێت، سەیرمان کرد، خێڵەساتی لووڕ خەریکی چادرهەڵدانن، ئەوسا زانیمان پولدوختەر مەودای نێوان گەرمێن و کوێستانی ئێلی لووڕستانە. تەواوی تایەفەی لووڕ وەختێ ڕەشماڵ هەڵدەدەن، چێخی لە دەور دەگێڕن. کوردەکانیش چیخ و چادریان هەیە، کەچی لەنێو ئێلی بەختیاریی ئەمەم نەدیوە. ئەوان بەم چیخە دەڵێی

«چەپۆق یان چیت» بەدەم ڕێگەوە سەیری مێگەلی لووڕمان دەکرد. مێگەلی لووڕەکان لەگەڵ مێگەلی بەختیاریی جیاوازییان هەیە. دووگی مەڕی ئەوان گەورە و یەك بەشە و لە کۆتایدا کوتێکی چووکەی شۆڕ بووەتەوە، بەڵام دووگی مەڕی بەختیاریی دوو بەشە و زۆریش چووکەترە. ئەم بەشانەش هەر یەکە و دەکەونە سەر ڕانێکی ئاژەڵەکە. خوری مێگەلی لووڕستان قژترە و ئاژەڵەکە قەڵەو نیشان دەدات. کەچی خوریی مەڕی بەختیاریی تیسکن و شۆڕە و ئاژەڵ کز نیشان دەدات. مێگەلی لووڕی لووڕستان شاخیان هەیە و مێگەلی بەختیاریی مەڕ و بەرانی بێ بەش لە شاخن. بە هۆی ئەوەی بە ڕێگەوە بووین هەر ئەوانەمان دیت و نووسیمان.

وردە وردە دەشتی خوزستانە و گەرمای تاقەتپڕوکێن. لە ئەندیمێشك نانی نیوەڕۆمان خوارد و خۆمان گەیاندە ئەهواز. میوانخانەیەکمان گرت و تەنیا ژوورێك شەوی ٧٠ تمەن، گەرماوێکمان کرد و سوورێکمان بەنێو شاردا لێدا. شێومان کرد و فیلمی وێنە کێشانمان کڕی. خۆمان لە بەر گەرما ڕانەگرت و هاتینەوە بۆ بەر کولێری هوتێلەکە. قسەکانمان زۆرتر لەسەر پرسی خینەچوو بوو. دیگار دەیگوت: ئەگەر تایەفەی a وb لەگژ یەکدی ڕاچن، تایەفەی c بچێتە یارمەتیی تایەفەی a و تایەفەی d لەسەر تایەفەی b بکاتەوە، بە هۆی ئەوەی تایەفەی d هەوڵی داوە نیزامی هێزی ئێل وەك خۆی بمێنێتەوە و تایەفەی b بە دەستی دوو تایەفەی a و c لەنێو بچێت. بە تایەفەی d دەڵێن «خینە چو»، بەڵام بەم جۆرەی من تێگەیشتم دوو تایەفەی a و c لە بارودۆخی ئاساییدا لەگەڵ یەکدی دەبنە «خینە چو» لە هەموو کاتێکدا پشتیوانی یەکدیی بن. سا لەبەرئەوەی دوو تایەفەی d و b خینەچووی یەکن، بۆ هەمیشە دەبنە پاڵپشتی یەکدی. ئەم هاوکارییەش بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە و بەم شێوەیە هیز و قودرەتی ئێل هاوسەنگ دەمێنێ و هیچ وەختێ تایەفەیەك بە یەکجاری خاشەبڕ نابێت. هەر بۆیە نەریتی خینەچووبوون لە ئێلدا نەریتێکی کۆن و گرینگە و ئێستەش کارسازە. هەروەك بۆیان باس کردین، تەنیا بابەتێك هەیە کە ئەو خینەچوویەی کەمڕەنگ کردەوە، بابەتێك بوو کە بێهداروەند لەگەڵ چوارلەنگ خینەچووبوون و بابادی لەگەڵ دورکی، لە شەڕی چوار لەنگ و دورکی، بابادی چونکە خینەچووی دورکی بوو چووە یاریدەی ئەو، بەڵام بێهداروەند خینەچووی چوار لەنگ بوو، یاسای خینەچووی ژێر پێ نا، لە چوارلەنگ دابڕا و چووە یاریدەی دورکی و بابادی، لەو شەڕەدا چوارلەنگ تێك شکا و ئەو هێزەی خۆی لە دەست دا. سا لەو کاتەوە باوەڕی ئێل، هەروەتر خانەکان سەبارەت بە

بێهداروەند دابەزی و ئەوانە بەسەر چەند بەشی بچووکدا دابەش بوون و هەر بەشەی لە ناوچەیەك گیرسانەوە تاکو هیچ وەختێ لە نێزیك یەکدی نەبن. ئەم باسە هەروا درێژەی هەبوو، دیگار وتی، دەبێ بچین زۆرتر لێکۆڵینەوە بکەین.

## ٢٥ی ڕەزبەری ١٣٥٢

بەیانی زووتر لە کیژی خۆرەتاو لەخەو هەستام و دەست و چاوم شوشتن و سەر و پرچم شانەکرد. شەو ڕابرد و من کەم نوستم. بای ئەم کولێرەش زۆر سارد بوو، ئەگەر خۆم دادەپۆشی گەرمام دەبوو. لە گەرماو هاتمە دەرێ و دیگار لەخەو هەستا. خۆمان پۆشتە کردەوە و دەرکەوتین نانی بەیانی بخۆین. ئێمەی نامۆ هیچمان دەست نەکەوت و هاتینەوە هوتێلەکە. هەر لەوێ نان و پەنیرێکی وشکمان خوارد. دوای نانخواردن چووین بۆ ئوستانداری «پارێزگاری» نامە و ڕێگەپێدانی تایبەت بە پشکنینی ئەم ناوچەیە وەرگرین، چ لە ئیدارەی پارێزگە و چ لە ژاندارمەری خێرا کارمان جێبەجێ بوو. هاتینەوە هوتێلەکە و داوای سیایی حیسابمان کرد. ژوور ٧٠٠ قڕان، نانی بەیانی ١١٠ قڕان، نۆشابە ٤٠ قڕان، هاتوچۆ ٨٠ قران، خەوتنی ئەم هوتێلە سەت تمەنی دا بە کۆڵماندا، من لە مانگدا ٤٢٠٠ قڕان وەردەگرم، سواری ترۆمبێل بووین و بەرەو مزگەوتی سلێمان تێمان تەقاند. دەر و دەشتێکی چۆڵ و هۆڵ، دەیان کیلۆمەتر ڕێگە دەبڕین نە ئاو هەیە و نە ئاوەدانی. لە نیوەی ڕێگەدا تووشی قاوەخانەیەك هاتین و نان و ماستێکمان خوارد. شتێك لەوێ سەرنجی ڕاکێشام، شۆفێری ترێلییەك لەسەر بەردێك دانیشتبوو، سەگێك لە بەردەمی هەڵتووتەکابوو. کابرا هەردوو قامکە کەڵەی نا بەیەکەوە و بە پەنجەی کونێکی دروست کرد. گوتم بۆ ئاوا دەکەی؟ گوتی: ئەوە وەك دەمی گورگ دەچێ، ئەگەر ئەمە نیشان سەگ بدەی هەڵدێ و دوور دەکەوێتەوە! سوار بووینەوە و دیسانیش ڕێگە چۆڵ و بە بێ سێبەر. بە تەنیشت ڕێگەکەدا مەودای مەسجد سلێمان تا ئەهواز لوولە داندرابوو. تا بڵێی ڕێگەکەش قووڵکە و ناخۆش. لە نیوەی ڕێگەدا تووشی خێڵێکی بەختیاریی هاتین. پیاوەکان لەم هەوا گەرمەدا چۆخەی ئەستووریان لە بەردا بوو. هەر چۆنێك بوو گەیشتینە مەسجد سلێمان، شارێکی پرژوبڵاو، بە بۆنەی کۆمپانیای نەوتەوە تێك و مەکان درابوو. ماڵی کارمەندانی کۆمپانیا تازە ئاوەدان دەکرانەوە، دار و دیواری لە قامیشە. کەلوپەلی کۆمپانیا، لەو دەشتە کەوتووە. جارێ نە شار دیارە و نە هیچ. وردە وردە گەیشتینە شار. تەنیا میوانخانەیەکی تێدایە

بە ناوی کەرامەت، ژوورێکمان بە کرێ گرت و لەسەر قەرەوێڵەکان درێژ بووین. دوای سەرخەوێك لەگەڵ دیگار چووینە بازاڕی مەسجد سلێمان. ئای بگرە بەختیارییەکی ئاشنا ببینین. زۆر کەس بە دەم بزەوە سەریان بۆ لەقاندین کەسمان نەناسی. زۆریان لە مۆری دەچون. مۆریگەل سەر و چاویان چکۆلەیە. بازاڕی مەسجد سلێمان، بازاڕی چلگردی هێنایەوە بەرچاوم. لەنێو بازاڕەکەدا چاوم بە دوو تێڕ کەوت. فرۆشیار گوتی، دەستکردی تورکانە. دواتر زانیم مەبەستی «لۆرکی»یە، گەرمێنیان لە نێزیك حەوت گوڵە و دەستەیەکی تورك زمانن، لەگەڵ بەختیارییەکان دەژین و تەنیا دەستەیەکی خاوەن وشترن لەنێو ئێلدا. دیگار ۲ چارەکێك پارچەی دیبیتی کڕی، مەتری بە ۲۸۰ قڕان. ساڵی ڕابردوو لە بەشی کوێستانێ هەرزانتر بوو. بەختیاریگەل دەیانگوت، هەموو شتێك لە کوێستان هەرزانترە تاکو گەرمێن. هەر بۆیە بەختیاریی لە کاتی کۆچ و هەواردا ئەوەی گەرەکیانە لە چلگرد دەیکڕن و لە کاتی کۆچی پایزەدا وەختێ دەچنە خوزستان. لە چلگرد پاتۆڵێکی بەختیاری بە دوورینەوە بە ٦٠ تمەن تەواو دەبێ. هاتینەوە بۆ مزڵەکەمان خەریکی ڕێکوپێکی پلان و بەرنامە بین شەو بەسەری داداین.

## ٢٦ی ڕەزبەری ١٣٥٢

ئەو کەسەی بۆ یەکەم جار دێتە ئەم ناوچەیە بە بۆنی گاز گێژ دەبێ. هەوای گەرم و مێش و مەگەز، شەو و ڕۆژیان لێ تاڵ کردین. بەیانی زوو پێش ئەوەی نانی بەیانی بە گەرووماندا بچێتە خوارێ لە بەردەرگەی ئیدارەی فەرمانداری چاوەڕوانی فەرماندار بووین. بەرپرسی ئیدارەی شارەبانی هات و بردینی بۆ ئیدارە، چەند پرسیارێکیان کرد و بە وەڵامدانەوەمان دڵنیا بوون، ئێمە لە ئیدارەی کۆمەڵناسییەوە هاتووین، دواتر چووینە فەرمانداری و ژاندارمەری، وەڕێ کەوتین بۆ لالی. تا بڵێی ڕێگەکە ناخۆش بوو. لەسەر نەخشەکە نووسراوە ٣٥ کیلۆمەتر، کەچی زۆرتر لە ٩٠ کیلۆمەترە. لە عەنبەل دەرچووین و لە ڕێگەی کوێستانییەوە گەیشتینە لالی و پرسیاری ماڵی جەعفەرقوولیمان کرد، چوو بوو بۆ کوهرەنگ و لە ماڵ نەبوو، لەگەڵ بی بی ئێران ئەحواڵپرسیمان کرد و بووین بە میوانی ئەحمەد سمالی، زاوای جەعفەرقوولی. تەواوی براکان لە دێ دادەنیشن، هەر کەسە و بە کارێکەوە سەرقاڵە. ئەحمەد سمالی سەیدایە و یەکیان شۆفێرە و ئەوی دی کارناسی لوولەی نەوت. تەنیا یەکیان لەوێ ماوەتەوە و زیندەماڵی براکانی دەباتە

گەرمێن و کوێستان. دانیشتین و قسە و باسەکانمان هێنا سەر ئەو مەبەستانەی کە دەمانویست لێی نێزیك ببینەوە. لە لالییەوە تا شیوی بابا ئەحمەد دەمانتوانی بە سواری ترۆمبێل بڕۆین، لە قەراخ زەندۆڵەکە شازادە بولقاسم هەیە. دەبێ ماشێنەکە لەو شیوەدا بە جێ بێڵین و بە بێ یەکسم لەو شیوەوە تێپەڕین تا دەگەینە هەواری حەمە حوسێن خان لە گەرمێنی تایەفەی بامدی. لەوێوە بە چیای مونادا سەر بکەوین و دابەزینەوە تاکو دەگەینە شیرین بەهار. بۆ ئەوەی چاومان بە تایەفەی مۆری بکەوێت. یان ئەوەی بچینە مەسجد سلێمان و بەوێدا بچینە قەڵای زەرامی (بە ماشێن)، بگرە بتوانین تایەفەی بێهداروەند ببینین. بڕیارمان داوە دوایی ئەم کارە بکەین. دواتر ئەحمەد سمالی چیرۆکێکی بۆ گێڕاینەوە کە «نادر شای داماو پلانی دادەنا، چ بکات. دەستەیەك لەگەڵ نادر بوون، بە لاساری خۆیان قەندەهار دەگرن. دارودەستەی نادر ئێرەیی بەم کارە دەبەن و دەڵێن بەختیاریگەل تۆ بە هیچ نازانن، زۆری خۆیان نیشان دەدەن. نادر تووڕە دەبێ و دەستووری لە داردانی چەند کەسێك دەر دەکات. پیاوێکی بەختیاریی زیرەك، هزری شیعری دەبزوێ و ڕوو دەکاتە نادر، دەڵێ:

بەختیاری شایە بەخت یاری کرد/ بەختیاری فەتحی قەندەهاری کرد

نادر دڵنیا دەکاتەوە بە پشتیوانی بەخت و ئێقباڵی شا، ئەم هەڵمەتە سەری گرت و تووشی ئەم سەرکەوتنە بوون.

چەند جارێك ئەم چیرۆکەم بیستبوو. زۆر کەس ئەم ناو لێنانەی بەختیاریی هەر بەم هۆیەوە دەزانن.

## ٢٧ی ڕەزبەری ١٣٥٢

لە فێنکی بەیانیدا ترۆمبێلمان ئامادە کرد و وەڕێ کەوتین بۆ دۆڵی بابا ئەحمەد. مەودای نێوان لالی و دۆڵی بابا ئەحمەد تەواوی ڕێگەکە چاڵ و قوڵکە و بزنەڕێیە. بەزەحمەت لەندەروێر لەم ڕێگەیە دەر دەچێ، ئێل خەریکی کۆچکردنە و تازە دەگەیشتنە گەرمێن. شمەك و کەلوپەل باری چارەوێ کراون، ژن و منداڵ و مێگەلیش ملی ڕێگەیان گرتووەتە بەر. فیتەفیتی شوان و گوڕە و هەرای چارەوێدار و دەنگی سەگوەڕ ئەو دۆڵەی پڕ کردووە. هەرچۆنێك بوو گەیشتینە شازادە قاسم، ئیمامزادەیەکە، بەختیاریگەل زۆری

گرینگی پێ دەدەن. گومبەزی ئەو هەر لە گومبەزی دانیالی نەبی دەچێ و لە ناوچەیەکی سەرووی کوێستانیدا هەڵکەوتووە. تا بڵێی وەسەرکەوتنی ئەستەمە. دواتر گەیشتینە بنوار، لە شیوێکی تەنگەبەردا قەڵایەك لەو ناوچەیەدا قوت بووەتەوە.

لێرە بە دواوە ڕێگەی ماشێن تەواو دەبێ و ناچارین بە سواری وڵاخە بەرزە وەسەر بکەوین. ئیسماعیل برای فەرامەرز مەحموودی لە قەراخ شیوەکە ڕەشماڵی هەڵداوە. لامان دا ڕەشماڵەکە و تاکو هێسترمان دەست دەکەوێ کەمەکێك پشوو دەدەین. دوای ئەوەی هێستر دەست کەوت، ماشێنمان لە بنوار بەجێ هێشت و بە سواری یەکسمان خۆمان کرد بە گەرووی شیوەکەدا. بەشێکی بزنەڕێگەکە وشکانییە و بەشێکیشی پێچ و گەوە. ئیمامزادە بابا ئەحمەد لەم دۆڵەدایە، بەڵام لە جێیەکی بەرچاودا، گومبەزێك و دوو منارەی هەیە. نیوەی گومبەز کاشیکارییە. کاشی سەوز و گوڵدەستە بەڕەنگی سەوزەوە. لە تەنیشت ئیمامزادە بەختیاری خەریکی گێرە و شەنکردنی خەرمان بوون. دەستەکێك لە ناوەندی خەرمانەکەدا قیت بووەتەوە، پێی دەڵێن، «مێ» بازنەیەکی چل سانتیمەتری تێکراو پێی دەڵێن، «هەچە ڕۆ» گوریسێکی تێخراوە. تەواوی گوێدرێژ و هێستر و ئەسپیان بە زنجیرە لە گێرە کردووە، ئەسپێکی توسەن لە سەرەدایە. پێی دەڵێن، «سەر پەڕ»، ئیتر لەوێدا ئەو دەستەکە بنەیە و سەرەش لە هەموویان زۆرتر ماندوو دەبێت. پیاوێکی بەختیاری بەشوولێکەوە کەوتووەتە شوێنیان. بە دەم لێخوڕین و گێرەکردنەوە گۆرانی و شیعری تایبەت دەڵێ. ئەم هەموو زەحمەت و یەکسمئاژووتنە بۆ وردکردنی کلۆشەکەیە و سووربوونی خەرمان. کە تەواوی ئەم هەڵاتە هەر بۆ زگە ڕەشە. کەسێکیش بە شەنەی دارین بە دەوری خەرماندا دەسووڕێتەوە و کلۆشەکە دەخاتە بەر پێی یەك سمەکان. ئێمەش لەو دیمەنە وێنەمان هەڵگرت و ماوەیەکیش دواکەوتین.

دیسان وەڕێ کەوتینە و تووشی ڕێگەیەکی ڕژد و هەڵەموت هاتین لە قەدپاڵی چیاکان. ناچار بووین دابەزین و ڕەشمەی چارەوێکان بگرین و بە دووی خۆماندا بیانکێشین. ڕانەکەش هەر وەك ئێمە سەرەیان گرتبوو، بە بێ ئەوەی پەلە بکەن. هەڵەیەکی چووکە بەر بوونەوە و مردنی بە شوێنەوەیە. دەرچوون لەو دەربازگەیە مرۆڤ نیوە عەمر دەکات. هەتا پەڕینەوە تف لە دەمماندا وشك بوو. ئاوای ئەودیو بووین و چلبار و دێی حەمە حوسێن خان دەرکەوت. دەمژمێر شەش و نیوی دوای نیوەڕۆ

گەیشتینە هەواری فەرامەرز. هەوا گەرمە و جارێ چادریان هەڵنەداوە، لەژێر سێبەری داران دادەنیشن. شێوی گەرم لە گۆڕێدا نەبوو، بە نان و پیازێك قنیاتمان کرد. بۆمان دەرکەوت لە دلییەوە تا شیمبار نێزیکەی ۱۲ فرسەخە و بە شێکی بە سواری وڵاخە بەرزە و ئەوی دیکەی بە پێیان تا دەگەینە مۆرییەکان. لەوێشەوە ٦ فرسەخ دەمانگەیەنێتە سوسەن و سوورخاب، ئەوسا دەتوانین بێهداروەندان ببینین. کەمەکێك پەرێشانین. خۆمان بۆ ئاوا سەفەرێك ئامادە نەکردووە. ئەو شەوە لە هەوایەکی ئازاددا خەوتین و نوقمی دیمەنی ئەستێران بووین. هەوا ساردە و چەق و لووری گورگ و سەگ تا شەبەقی بەیان خەوی لێ زڕاندوین.

## ٢٨ی ڕەزبەری ١٣٥٢

خواردنی بەیانی نان و پەنیر و تەرەپیاز بوو. تەنیا نانەکەمان خوارد و چاییمان بەسەردا کرد، خۆمان گەیاندە خەرمانەکە. ئەم دیمەنە هەر ئەوەبوو پێشتر بینیبووم، گێرە و شەن و کەو و جەز و ماسوولکە و شەقڵکردن. شەماڵ تووندی کردبوو فەرامەرز بردینی بۆ ماڵێك بەرنامەی خوازبێنیکردن لە گۆڕێدا بوو. لەژێر سێبەری داران فەرش و مافوورە ڕاخران و ڕیش چەرمگی بەختیاریی هاتن و چوارمشقی دانیشتن. دوو بزنیان سەر بڕی. ئەمەش ماڵی زاوا هێنابوویان. پێی دەڵێن «خەرجی دەست ماچکردن»، خەرجی ئەو ڕۆژە لە قەند و چایی و ڕۆنەوە بگرە تا شتی دیکە بابی زاوا دەیهێنێت. چی ئامادە بوو خورا و دەمژمێر ٢ی نیوەڕۆ، بە بەرچاوی میوانانەوە قەرار و بڕیە بە هەزار کەمە و زۆرە بڕایەوە و نەغد و قەرز لە پشت قەباڵەی مارەبڕین یاداشت کران. کۆی بڕەکەی حەوت هەزار تمەن، چواری هەزار نەغد، سێ هەراز قەرز لە پشت قەباڵەدا نووسرا. ئەو چوار هەزار تمەنە ٢ هەزاری وەك جیازی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی زاوا. لەو چوار هەزار تمەنە هێسترێك بە هەزار و حەوسەد تمەن لە حزووری میوانان درا بە ماڵی بووکێ. دوای ئەوەی هەموو شت تەواو بوو، چەپڵەیەکی باشیان لێدا. وێنەی ڕێوڕەسم و مارەبڕین و خوان و ئاگردانمان گرت و ملمان نا لە قسەکردن.

دوای نیوەڕۆ بۆ ماڵی فەرامەرز وەڕێ کەوتین. لەنێو ڕێدا تووشی گۆلێك هاتین مێگەل ئاویان تێدا دەخواردەوە. وێنەمان هەڵگرت. فەرامەرز گوتی: ئێمە پێی دەڵێین

«بوت»، له فەرامەرزم پرسی، بۆ ئەو ڕێوڕەسمە تووشماڵی لێ نەبوو؟ گوتی: دەبوو بیانهێنابا، بەڵام لەبەرئەوەی لە مێژ نییە مردوومان لێ مردووە ئەو کارەیان نەکردووە.

پێشتر باسم کرد دوو ناوچە لەو سنوورە هەیە. یەکیان چلبار و ئەویدیی دلی حەمە حوسێن خان، ئاوی چلبار ئەم دووانەی کردووە بە دوو کەرتەوە. لە چلبار، تیرەی ئارپەنایی لە تایەفەی بابادی چادر هەڵدەدەن و لە دلی حەمە حوسێن خان، تایەفەی بامدی و تایەفەی زلقی لە دورکیگەل چادرەکانی خۆیان هەڵدەدەن. گەیشتینە هەوار، لە دەورییەکدا «کێل خونگ« یان، بۆ هێنایین، دەنکەکانی لە ماش گەورەترە، وەك نێوکە گێلاسێك دەبێ. شینی ئامالْ زەردە. بەری درەختێکی پان و پۆڕە. ئەم میوەیە بە تازەیی و بە وشککراوەیی دەخورێت. زۆر جاریش تێکەڵ گەنم و گوێزی دەکەن.

فەرامەرز گوتی: دەبێ سبەی بار بکەین و بچین بۆ شوێنێك، پرسیم بۆچی؟ گوتی: تا ئێستە مانگە شەو بوو، ئەم دەڤەرەش شەوانە ڕووناك بوو، دەمانتوانی بە بێ گرفت ئاگامان لە ئاژەڵەکانمان بێت، بەڵام لە سبەینێوە سەرەتای مانگە و شەوانەش هەموو لایەك تاریك دەبێ، زۆر بە هاسانی جونەوەری دڕندە دێنە نێو مێگەلەکەوە و زەرەدمان لێ دەدەن، بەڵام لەوێندەرێ ڕەوەزەکان تیژ و بەرزە و توخنی ئێمە ناکەون. فەرامەرز تفەنگی هەڵگرت و قەتارەی فیشەکی کردە پشتێنە، بەم شەوە تاریکە وەڕێ کەوت، گوتی، لەوانەیە ئەو ورچەی شەوی ڕابردوو مەڕەکەی کوشت بێتە سەر ڕێگە.

ئێمەش لەگەڵ ئاغا نەجەف و براکانی فەرامەرز دانیشتین و دەستمان کرد بە قسە و باس. گوتم، ئاغا نەجەف، بەختیاریگەل هێستر دەکڕن، یان ماین لە نێرەکەر چا دەکەن؟ گوتی: زۆرتر دەیکڕین، ئەم کارەش دەکەین، بەڵام زەحمەتی زۆرە. ئەگەر بمانەوێ ماینی خۆمان چاك بکەین، پێویستیمان بە گۆڵەکەری باش هەیە. ئێمە پێی دەڵێین «خەر ڕەمە». بۆ ئەوەی ئاوا گوێدرێژێکمان هەبێ، پێوستە ماکەرێك لەگەڵ ماینەکە بزێ، هەردوو جاشەکەش نێر بن، بەچکەی ماینەکە دەکوژین و پێستەکەی دەدەین بەسەر جاشەکەدا، ماین بە بۆنی جاشەکە ڕادێت و شیری دەداتێ. لەوە بە دواوە ئەم جاشە تێکەڵ بە ڕەوکەی ولاخە بەرزە دەبێت و گەورە دەبێت و سواری ماینەکان دەبێ و هێستر لە دایك دەبێت. زانیم بە ڕاستی ئەوە تاقەت و حەوسەلەی دەوێ، هێسترکڕین زۆر بە

قازانجه. ئاغا نەجەف شەو بەخێری گوت و بەجێی هێشتین، ئێمەش ڕاکشاین، سەگوەڕ و تەقەی تفەنگی فەرامەرز خەوی لێ سەندین.

فەرامەرز دەست بەتاڵ هاتەوە بۆ ماڵ.

## ٢٩ی ڕەزبەری ١٣٥٢

خواردنی بەیانی نان و پیاز بوو. لەبەرئەوەی دەبوو بار بکەین خۆمان کۆ کردەوە. بەیانی ولاخەبەرزەیان سوێرخوێ کرد. یەکسم بارکران و ئێمەش تەماشامان دەکردن و وێنەمان هەڵدەگرتن. تاکو دێنەوە بە شوێنماندا لە ماڵی برایم میوانین، هەر ئەو ماڵەی ڕووبەڕوومان. چووینە ئەوێ و هەر وەك هەمیشە خێرا پەتوویان بۆ ڕاخستین و پاڵمان وە دەستە نوێنەوە دا و تێر تەماشای کەژ و کۆی جوان و دڵڕفێن نەدەبووین. لە گەرمێنێ، دەوری ڕەشماڵەکە بە بەرد هەڵدەچنن. تەنانەت سەرگێڕ و کۆزی بەرخانیش وشکەچن دەکەن. هەمووی بە بەرد چاك دەکرێ و تەنیا چادرەکەی بە سەردا دەدن. هەر وەك ماڵێك حەوشە و حەساری هەبێت. هەر ئەوەندەی دانیشتین، ڕادیۆیەکی تەرانزیستۆریان بۆ هێناین، بەلام زۆرمان حەز لێی نەبوو. یەکی دیکە دەستێك وەرەقی هێنا و دیگار گوتی، ئێمە نازانین. فەرامەرز گوتی: ئێوە باسی ڕەوەند و ئێلاتیان بۆ بکەن بە کەیفی ئەوانە. من پێکەنیم و گوتم: حەمە حوسێن خان کێیە ئەم دەڤەرەیان ئاوا ناو ناوە؟ دەر کەوت حەمە حوسێن خان چوار لەنگە. وەختی خۆی لێرە خاوەنی بورج و قەلا بووە و حەوت لەنگان دەریان کردووە و گەیاندوویانەتە چیاکانی دزفول. لەم دەور و بەرە دێ کۆنێکمان دیتبوو. پرسیمان بۆ چ سەردەمانێك دەگەڕێتەوە؟ گوتیان: بۆ دەورەی تەختە قاپۆی ڕەزاشا. لەوە دوا وێران بوو. باس لەوە دەکرا خەریکە ئەسپ و ماین لەنێو بەختیاریدا کەم دەبێت. هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە خەڵکەکە تەواو تەکی داوە بە لای کارو باری کشتوکاڵەوە. پیاوێکی بەختیاری دەیگوت: ((وەبیرم دێت هیچ کەس مستێك تۆوی نەدەکرد بەم دەر و دەشتەوە، تەواوی لەوەڕگە بوو، چارەوێ لێرە مەست دەبوو. ئێستە وەرزێڕی دەستی پێ کردووە، ولاخە بەرزەش لە کەمی داوە)). هەر ئەو پیاوە دەیگێڕایەوە: (( نێزیکەی چل ساڵ لەوەپێش دوو سێ هێستر زیاتر لەنێو ئێلی بەختیاریدا نەبوو، ئەمڕۆ هەرماڵە بەختیارییەك نێزیکەی دە سەر هێستری هەیە. کەچی هەردێت و نرخی گران دەبێت. ڕۆژ نییە هێسترفرۆشانی لووڕستان و ئازەربایجان و زەنجان ڕەوە هێستری خۆیان لێرە نەفرۆشن. ئێستە ئەگەرچی هێستر زۆر

بووە، قیمەتی چووەتەسەریٚ و هێستری باش بە چوار هەزار تمەن نادەن. کەچی کیلۆیەك ڕۆنی مەڕ ئەوپەڕی ١٨ تا ٢٣ تمەنە». هەر ئەو پیاوە ناوی غوەلاّمحوسێن بوو دەیگوت: «بابم ٣٠ مەن گەنمی دادەچەند، ئێستە من ١٥٠ مەن دادەچێنم، هێشتا بەشی ژیانی ئێمە ناکات». پرسیم جگە لە سواری و بارکردن چی بەم هێسترانە دەکەن؟ گوتیان: لە گەرمێنیٚ جووتکردن هەر بە هێستر جێبەجیٚ دەبێت. سیپالّێك دەکەینە ملی هێسترەکە و دواتر چەلّەمە، بۆ ئەوەی ملی بریندار نەبیٚ. بەم جۆرە جووتی پیٚ دەکەین. منیش نووسیمەوە تاکو ڕۆژێك بیبینم. پرسیم، سەبارەت بە خینەچوو چی دەزانی، کام یەك لە تیرە و تایەفەکان خینەچووی یەکدی بوون؟ گوتیان: زۆرتر هەقی هاومالّی و تاڕادەیەکیش تێکەلّی و خزمایەتی دەبێتە هۆی چێبوونی خینەچوویی. باسی لایەنێك دەکەم «هەمیشە یاریدەی بیٚ هێزانە» لە لایەکی دیکەوە باوەڕمان وایە «بەهێزترین تایەفە بچووکترین تایەفەیە. لە تایەفەکان مۆری لەگەلّ گەندەلی خینەچوو بوون. بامدی لەگەلّ زەڕئەسوەند و لە تیرەکان لەك لەگەلّ جەلیل لەگەلّ حاجیوەر خینەچوو بوون. ئارپەنایی لەگەلّ میرکائد. دەیویست درێژەی بداتیٚ هێسترێکی نەخۆشیان هێنا. دەیانگوت گەرما کاری لیٚ کردووە، خوێنی کارژیلەیان تێکەلّ بە ئاوی ترشی هەنار کرد و بە شیر پالّۆکیاندا کرد و کردیانە مەسینەیەکەوە. سیٚ کەس هێستریان ڕاگرت و کەسێکیش ئەم تراوەی بە لووتی هێسترەکەدا بەڕێی نێو ورگی کرد. تاکو گەرماکە بەری بدات. کاری بەیتەری کۆتایی هات و ئێمەش هاتینەوە بۆ جێی خۆمان. پرسیم، لە تایەفەدا عارەبتان هەیە؟ گوتیان: عارەبی بەختیاریی سیٚ بەشن، دورکی، بێهداروەند" بابادی. هەر یەکە و کەلاّنتەری خۆیان هەیە. ئەوانیش تەنیا گامێش ڕادەگرن. ئەگەر دەتانەویٚ باشتر ئەوان بناسن، دەبیٚ بچن بۆ عەنبەل، لەویٚ قسە لەگەلّ ستار کەریمی بکەن، ئەو کەلاّنتەری ئەوانە. پرسیم ئەوە چۆنە هەموو تایەفەکان چوار کەلاّنتەریان هەیە و ئەو تایەفەی پێنج کەلاّنەتەری هەیە؟ گوتیان: ئەو تایەفەیە، خاوەنی چوار کەلاّنتەر بوون، بەلاّم وەختیٚ کچی سەمسام سەلّتەنە مێردی بە ئاغا محەمەدی پەرویزی کرد، بەشێکیان لەو تایەفەیە کەم کردەوە و دایان بەو، ئەویش بوو بە کەلاّنتەر، ئەوسا تایەفەی بابادی بوون بەخاوەنی پێنج کەلاّنتەر.

فراوین گۆشتی ئەو کارژیلەیە بوو خوێنەکەیان کرد بە لووتی هێسترەکەدا. هەتا عەسر لەکن ئەو پیاوانە دانیشتین. لەو کاتەدا کە بە تەمای ڕۆیشتن بووین، پیاوانی بەختیاریی قەتارەی فیشەکیان لە خۆیان بەست و چەکیان کردە شان و بە سواری ئەسپەوە، ئێمەش یەك

یەك وێنەمان گرتن وەختی خۆی بۆیان بنێرینەوە. وردە وردە وەڕێ کەوتین بەرەو ماڵی فەرامەرز. ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژ بوو لەو شوێنە بار و بنەی خستبوو. لە قوڵکەیەکدا چوار دەوری ڕەوەز و کێوی بڵند. وەك حەسارێك وا بوو بۆ مێگەلەکە. تا ئەو کاتەی کەشەکە تاریکە مێگەل لەو حەسارەدا دەمێنێتەوە، وەختێ مانگ هەڵات و هەموو لایەك ڕووناکی تێ خزا، شوان ڕانەکەی شەوێن دەدات. وێنەی چەند بنجاقی کۆنمان هەڵگرت. لە کۆتایی نووسراوەکەدا تەواوی شاهیدانی ئاگەدار بە ساتوسەودابیەکە بە نیشانەی تووشماڵ پەنجە مۆریان پێدا ناوە، کە لەو کاتەدا مەبەست لە ڕیشسپی و کوێخا بووە. مام جەعفەر برای فەرامەرز سەبیلەیەکی لە قوڕ سازکردبوو، خێرا خێرا مژی لێدەدا و سەیری بنجاقەکەی بەردەستی ئێمەی دەکرد و زۆریش پەرۆشی ئەم کارە بوو. نووسراوی زۆرینەی بنجاقەکانی لە زەیندا بوو، خەتی زۆر یەك لە خەتاتەکانی دەناسی. کەم کەم شەو تەپی دا سەرمان و کوانوو گڕی تێکەوت و نان و پیاز و دۆی ترش، دەخۆی بخۆ، ناخۆی چش. بۆ ئەوەی بەیانی زوو لە خەو هەستین خێرا خەوتین.

### ۳۰ی ڕەزبەری ۱۳۵۲

بەیانی دیسان نان و پیاز هاتەوە گۆڕێ. هێستر زین کران، جوامێرێکی ۱۲ ساڵەیان ڕەگەڵ خستین بۆ ئەوەی لەوسەر چارەوێکان بێنێتەوە. ئەمجارەش گەوە و ملەی کەژ و کۆمان گرتە بەر، بە ڕژد و نشێواندا سەرەوخوار و بەرەوژوور هەڵچووین. دەستەیەك لە پیاوانی بەختیاریی زمهەڕ و بژیویان لە هێستران بار کردبوو، چەندە بە ئازارەوە بە کەند و کۆیاندا تێ دەپەڕین. لێرەدا مرۆڤ بۆ حەسانەوەی خۆی چەندە کەر و هێستری بەستەزمان دەڕەتێنێ. گەیشتینە شیوی بابا ئەحمەد، چاومان کەوت بە بەرات، براکەی فەرامەرز. بە شوێن مێگەلەکەوە بوو. تازە لە بنوار دەگەڕایەوە. پێنج مەڕیان ون ببوو. دوو مەڕی دیتبووەوە، لەو سێیانەی دیکە دەگەڕا. زۆریش تووڕە و ماندوو بوو. لەگەڵ ئێمە گەڕایەوە بچێتە لالی. لەنێو ڕێدا تووشی کەرتە مەڕێك هاتین لەسەر کانییەکە خەریکی ئاوخواردنەوە بوو. گوێمان هەڵخست بۆ کاڕە و باڕەی بزن و مەڕ. ئێلاتیان لە ڕەشماڵێ هاتبوونە دەرێ و بە قامك ئاماژەیان دەکرد بۆ داوێنی کێوەکە، زانیمان گورگیان دیوە، بەرات گۆڵێکی وەدووی خۆی دا و بە حەلەلەکردن، تیژ لە شاخی هەڵبوو. زۆری پێ نەچوو بەرات گەیشتە سەر باسکەکە، بە پڕتاو پێشاوبڕی گورگی دایەوە و چەند بەردێکی ڕێ هاڵاند، بەڵام نەیتوانی بیئەنگێوێ، گەڕایەوە و ئێمەش درێژەمان دا بە ڕێگەی خۆمان. لە بنوار

نان و چاییمان خوارد و سەرێکمان لە قەڵای بنوار هەڵێنا. دیوارەکانی لە بەرد و قوڕ بوون، پێیان دەگوت، قەڵای ئەسەدخان. شێوەی تەلارسازییەکەی بۆ ئێمە جێی سەرنج بوو. زۆرینەی ژوورەکان دوو قات بوون و بەقوڕ سازکرابوون، سەر دەرانە و تاقەکانی هەشتییان کەوانی بوون. تەواوی لە بەرد و کەڤران چێ کرابوون. ڕوون بوو هەمووی ئەو کارە بە دەست و زەحمەتی خەڵکی لادێ تەواو بووە. پێیان گوتین، ئەو گوندە، دەسەڵاتنشین بووە بە ناوی بنواری چوار و حەوت. زۆریەك لە خانەکان وەختێ دەهاتنە گەرمێن ماوەیەك لەم شوێنە دەگیرسانەوە، لە سەرکردەکانی تایەفەی چوارلەنگ و حەوت لەنگماڵیاتیان وەردەگرت. بە واتایەکی دیکە ماڵیاتی ئێلاتی لێرە کۆ دەکرایەوە. سواری ماشێن بووین و ڕۆیشتین بۆ لالی. لە بەردەرگەی پاسگەکە بەرات دابەزی و ئێمەش سەردانێکی ماڵی جەعفەرقوولیمان کرد. خۆی لە ماڵ نەبوو، عەلی خانی برای زۆری بەخێر هێناین، دانیشتین و شەربەتمان خواردەوە. خوشکە چکۆلە، گوڵی (ناوی کچێکە لە ماڵی جەعفەرقوولی) بۆ کوڕە مامی جەعفەرقوولی دیاری کراوە. بی بی ئێران ناڕازی بوو دەیگوت، لە پێشدا گوڵی بە مێرد بدەن، دواتر خوشکەچکۆلەی. عەلی ئاغا ڕازی نەبوو، هەر لەوێ زانیم عەلیاغا گوڵی بۆ خۆی داناوە. دوو ژنی بووە و یەکیانی تەڵاق داوە، لە دوو ژنە ٦ منداڵی هەیە، ئێستەش بە تەمای گوڵییە. دەیگوت، ژنهێنان لەنێو ئێلدا هەرزان تەواو دەبێ بۆ ژن نەهێنم؟ سەردانێکی گەرماوەکەمان کرد و هاتین بۆ لای ئەحمەد سمالی و هەتا شەوێ زۆرمان قسە کرد، بە بێ ئەوەی قازانجی بۆ ئێمە هەبێت. ئەم بەختیارییانە ئەگەر تا نیوەی شەو دانیشی لەگەڵت دادەنیشن و دەورت چۆڵ ناکەن، تۆزێك وەحەسێی. ئەمەش کێشەی نێوان ئێمە و ئەحمەد سمالی بوو. ئێمە حەزمان دەکرد زوو بەجێمان بێڵێ و خەریکی نووسراوە و یادداشتی خۆمان بین. ئەویش چاوی لێڵی خەو بوو، پێی خۆش بوو ئێمە بخەوین و خۆیشی ڕابکشێت. لەبەرئەوەی هیچ کاممان بە نەریتی یەکدیمان نەدەزانی یاترالی و ئۆترالیمان لێ شێوا بوو. تا ئەوەی من پرسیارێکم کرد و ئەوسا حاڵی بووم، ئەمەش حورمەتپێکردنێکە بە میوان. لەگەڵ میوان نان ناخۆن و دەستە و نەزەر دەوێستن. لە شەودا هەتا میوان خۆی دەنگ نەکات، هەر لەگەڵی دادەنیشن. وەختێ میوان گوتی، دەخەوم جێی بۆ چاك دەکەن و بەجێی دەهێڵن. یان ئەوەی پێی دەڵێین، ئەگەر خەوت دێ جێت بۆ چا دەکەین. وەختێ بەمەم زانی سوپاسی ئەحمەد سمالیمان کرد و شتومەکی خەوی هێنا و بەجێی هێشتین و ئێمەش دەستمان کرد بە کاری خۆمان.

## ١ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

بەیانی کەشکەکیان پێدایین. گەنمە کوتراو لەگەڵ گۆشت، بەڵام نەك ئەو حەلیمەی تاران، ئاوا خەست و خۆڵ. گەنمی ئەم کەشکەکە تەواو ددانی دەگرت. خاکە قەندمان بە سەردا کرد و ئەوانیش ڕۆنیان بۆ قرچ کردبوو. بە نانەوە خواردمان و زۆریش بەتام بوو. داردەستێك لە و سەری ژوورەکە بوو، گەلێك پێکەنیم و گوتم: سەیدای قوتابخانەش گورز و گالۆکی هەیە؟ گوتی : هی براکەمە. « دینەگا »یە، گوتم یانی چی؟ گوتی: بەختیاریگەل بۆ ئەوەی گورزی باشیان هەبێت، گۆشتی کلکی گایەك دەردێنن، دایدەنێن تەواو وشك ببێتەوە و بۆنی نەمێنێ، دواتر لە ئاودا دەیخووسێنن، ئەوسا بە زەحمەت لە گورزەکەی هەڵدەکێشن. وەختێ باش وشك بووەوە ڕێگە دەگرێت لە شکان و قەڵەشینی دارەکە. ئێمەش لەبەر ئەم گشتە ڕێزگرتنەی سوپاسمان کرد و خۆمان ئامادەی سەفەر کرد. بەرات هاتە شوێنمان.

هاتینەوە بۆ مەسجد سلێمان بۆ ئەوەی بتوانین درێژە بە کارەکانمان بدەین. گەیشتینە مەسجد سلێمان، ئاشنایەکمان نەبینی و بێکار و بێ بار سەرمان لێ قورس بوو. شەو جەعفەرقوولیمان بینی و لە باشگەی کۆمپانیای نەوت بووینە میوانیان. زانیمان بە هۆی دووەم تونێڵی کوهرەنگەوە ٣٠٠٠ مەن زەوی و زاری بابادیگەل لەنێو چووە. قەول وایە لە هەمبەر هەر مەترێکی چوار گۆشەدا ٨ قران بدەن بە خاوەن زەوی. چی باشترمان گیر نەکەوت و چووین بۆ میوانخانەی کەرامەت شەو لەوێ خەوتین.

## ٢ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

لە میوانخانە خواردنی بەیانیمان خوارد و سووڕێکی نێو بازاڕمان لێدا و تەلەفۆنێك بۆ تاران و سەرێکمان لە فەرمانداری هەڵێنا و گەڕاینە و بۆ میوانخانە. جەعفەرقوولی بە تەما بوو سجیلەکەی بگۆڕێت. تەمەنی ٥٢ ساڵە و بە سجیل ٧٢ ساڵییەتی. دوو شاهیدی دەویست ئەوانیش نەهاتبوون. لەگەڵ جەعفەرقوولی چووین بۆ لالی. لە عەنبەل نانی نیوەڕۆمان خوارد. جەعفەرقوولی دەیگوت: بابادیگەل نێزیکەی ٥٠٠٠ بنەماڵەن، نێزیکەی ٣٠٠ هەزار سەر مەڕ و بزنیان هەیە. ١٠٠ ماڵیان زیاتر لە هەراز سەر مەڕ و بزنیان هەیە. دەیگوت: لە خوزستان، لە هەیڤا سەرماوەز و بەفرانبارێ، سەرما و باران زۆرە و لەوەڕ کەم، ئاژەڵ تووشی نەخۆشی و مردن دەبن. لە کۆتایی ڕێبەندان لەوەڕ

خۆش دەبێ. هەر ئەو کاڕوونەی لە زستان و بەهاردا لرفەی دێت، ئێستە قووڵایی دۆڵەکە تێر ناکات. جەعفەرقوولی دەیگوت: چەند ساڵ لەوە پێش ئێمە بە سواری کەڵەك دەپەڕینەوە. ئێستەش کۆمپانیای نەوت پردێکی ئاسنی لە نێزیك لالی لێداوە ئەمەش هاتوچۆیی ئێلاتی ئاسان کردووەتەوە. لە ڕێگەدا وچانێکمان گرت بۆ ئەوەی کەلاّنتەری عارەبی بەختیاری ببینین. نەماندیت و چوو بوو بۆ مەسجد سلێمان. گەیشتینە لالی و پشوویەکمان دا. جەعفەرقوولی بنجاقی تایبەت بە بەشەکانی خۆیانی نیشان داین. بڕیار وابوو بەیانی وێنەیان لێ بگرین.

## ٣ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

بەیانی کەشکەکەمان خوارد. دواتر وێنەمان لە بنجاقی زەوییەکانی منداڵی (جەهانگیرخان و فەرامەرزخان) هەڵگرت. دانەیەکیان تۆمار بوو. تەواوی زەویەکانی جەهانگیر خان و فەرامەرز خانی نیشان دەدا، ئەو دوو برایە ئەو زەویانەیان کڕیوە و بنجاقیان کردووە، دوو سەر هێستریان داوە بە سەیدێك، بۆ ئەوەی تەواوی ئەو قەباڵەجات و بنجاقانەیان بۆ بکات بە سەنەدێکی گشتی و یەك پارچە. دواتر میراتگرانی ئەوان لە بەر ئەوە ئەو زەویانەیان فرۆشتووە. جەعفەرقوولی دەیگوت: مالیکییەتی زەوی لە ئێلدا بە شێوەی دابەشکراوی تاکە کەسییە و خاوەن ئاژەڵ بۆ لەوەڕاندنی ڕانەکەی دەبێ لە خاوەن زەوی ئیزن وەربگرێت و ماوەکەش دیاری بکات. خاوەنی زەوی دەسەلاّتی هەیە لەوەڕگە بکێڵێ و بیکاتە دێمەکار! جەعفەرقوولی دەیگوت: «بیست ساڵ لەوە پێش ٣٠ مەن زەوی لە هاوینەهەوار، ٣٠ مەن زەوی لە گەرمێن دادەچێندرا، بەلاّم ئێستە ٣٠٠ مەن زەوی لە هاوینەهەوار، ٣٠٠ مەن زەوی لە گەرمێن دادەچێنین. لەو دەورەدا گەنمان لە «گەتوەند» و شووشتەر دەکڕی مەنی ٥/ ٢ تا ٣ قڕان بوو، بزن سەری نێزیکەی ٥٠ قڕان قیمەتی بوو، بەلاّم ئێستە گەنم مەنی ٦٠ قڕانە و بزنێك ١٠٠٠ تا ١٢٠٠ قڕان نرخی هەیە. هاموشۆ و کەرەستە وای کردووە کێڵگەی زۆرتر داچێنین. لە ڕابردوودا وەرزێڕ بە زەحمەت و مەرارەت لە کوهڕەنگەوە دەگەیشتە گەرمێن و توانای دروێنەی ٢٠ مەن زەوی هەبوو، لەگەڕانەوەدا نەخۆش دەکەوت و لە کار و کەسپی ئەو ساڵەی دەبوو. جگە لەوە زەوییەکی کەمتری دادەچەند.

بۆ ئەوەی زوو لە خۆ ببێتەوە و لە کۆچەران بەجێ نەمێنێت، بەڵام ئێستە ئەم پەلەپروزێیە نییە و کێڵگەی زۆرتر ئاوەدان دەکەنەوە و زۆرتر خۆیان بە کشتوکاڵەوە خەریك دەکەن. بە کەرەستەی ماشێنی ئیش دەکەن و لەگەڵ ئێلاتی دەگەنەوە کوێستانێ. هۆیەکی دیکەش ئەوەیە خەڵکەکە زۆرتر، بۆیە کشتوکاڵ ڕوو لە زیادبوونە و گەنمکڕین بۆ ئەم گشتە خەڵکە گرانترە لە داچەندنی. هەروەها لە ڕابردوودا داچەندنی زۆر دەبووە هۆی تەماحتێکردنی تالانچیانی لووڕی لووڕستان و ڕامالینی خەلەوخەرمان، بەڵام ئێستە هێمنی هەیە و کەس ناوێرێ قامك بۆ مالی کەسێك ڕادێرێت.

بابەتێکی دیکەش لە گۆڕێدایە، زۆر بوونی ئاژەڵداری، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی لەوەڕگەکان ئەم بژوێنی و لەوەڕەی ڕابردوویان نەمێنێ. دەرفەتیش بۆ ڕاگرتنی ئەسپ و چارەوێ نەماوە. ئەگەر ئاژەڵدارێکی بەختیاری بتوانێ ڕانەکەی بحاوێنێتەوە وەبزانە هونەری کردووە. شوێنێك بۆ ڕاگرتنی محەندەکاتن نەماوە بە خەرجی زۆر و کاری کەمەوە. لە پڕ باسی بەشە میرات کرا، هەڵبەت لە مالیکییەت و جاڕ و لەوەڕگەوە هاتە گۆڕێ. زانیمان لە هەشت یەك وەبەر ژن دەکەوێ، هەڵبەت ئەو یەك لە هەشتە لە سامان و سامانە، نەك لە موڵك. ئەگەر پیاو بمرێت و چەند ژنی لە پاش بەجێ بمێنێ، ئەو یەك هەشتە بە ڕێژەی بەش لە پشتی قەباڵەی ژنەکان دابەش دەکرێت. ئەگەر پیاوێك ژنێکی لووڕ و یەکی بی بی هەبێ، لە هەر یەك لەو ژنانە کوڕێك، ئەو ژنەی وازۆرتری بۆ دیاری کراوە لە پشت قەباڵەکەیدا، بەشی زۆرتری پێ دەبڕێت. ئەگەر پیاوێك بمرێ و کچی هەبێ و کوڕی نەبێ، تەواوی موڵك و ماڵ بە کچە دەگا، لە میرات، جگە لە زەوی و زار، کوڕێ بەشێك و کچ نیو بەشی وەبەر دەکەوێ. ئەگەر هات و کوڕ ژنی نەهێنابێ و بەتەما بێ لە مالی بابی جوێ ببێتەوە، بەشەمالی لە وەختی زیندووبوونی بابیدا پێ دەدەن. پێی دەلێن، «کوڕی بەهر». ئەگەر کوڕێك کاری وا بکات و دوای ڕۆیشتنی ئەو سامانی باب زۆر یان کەم بکات، کوڕ لە بەرانبەر بنەماڵەدا هیچ هەق و بەرپرسی نامێنێت. ئەو بەشەی لە پشت قەباڵەدا (لەکاتی داواکردن) کراوە هەقی ژنە، هەر وەختێ بیهەوێ دەتوانێ وەری بگرێت یاخۆ بیبەخشێ بە کەسێك یان بۆ خۆی ڕابگرێت. ئەگەر پیاوێك بمرێ و مندالی لە دوا بەجێ نەمێنێ، میراتی ئەو وەبەر براکانی دەکەوێت. بە هۆی ئەوەی خەڵك دەهاتنە ژوورێ و دەچوونە دەرێ باسەکەمان دەگۆڕدرا. سوارێك هات و گوتی، زۆر ماندووم، ئەم ئەسپە بە «لوکێ» دەڕوات و سوار ماندوو دەکات. زانیم بە غاردان «تەرات» و بە جوان ڕۆیشتن «یۆرغە» و بە

خراپ ڕۆیشتن «لوکیٚ» دەڵێن. کێشەی ئەو زەوی و زارەی کە دەبوو خەسارەتی بدریٚ بە بەختیارییەکان، لەسەر مێشکم دەهات و دەچوو. دوای پرسین و وەڵام بۆم دەر کەوت لە دەورو بەری سەدی ڕەزاشای پێشوودا زەوی بەراو مەنی ١٤٥٠٠ قڕان و زەوی دێمەکار، مەنی ٦٥٠٠ قڕان. (نیزیکەی مەتری چوار گۆشە ١٠٠ قڕان) لە کوهرەنگ، زەوی بەراو مەنی ١٨٠٠ قڕانە. لە گەرمەسێر، یەکەی زەوی گاسنە و هەر گاسنێك یان ٦٠ مەن یان ٨٠ مەنە تۆوە. ئەمجار لە لالی دەرکەوتین و دەمژمێر ٦ی دوانیوە ڕۆ گەیشتینە مەسجد سلێمان و شەو لە باشگەی کرێکارانی نەوتی مەسجد سلێمان میوان بووین.

## ٤ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

ئەو ڕۆژەمان لە مەسجد سلێمان بردەسەر. سەردانێکی چاڵاوی «ناکەس دارسی»مان کرد. دەورەیان شیشبەند کردبوو، کردبوویان بە مۆزەخانە. ماوەیەك بەنێو گەڕەکەکانی کرێکاران و کارمەندانی کۆمپانیدا سووڕاینەوە و شەو لە باشگەی کارمەندانی نەوتی مەسجد سلێمان گیرساینەوە، بزانین ئەویٚ چۆنە، ئاخۆ ناونیشان دەبێتە مایەیی ئاکار. باشگەی شەوی ڕابردوو تایبەت بوو بە کرێکاران و هی ئەم شەومان کارمەندانە. جیاوازیی هێکجار زۆرە و قەول وایە سبەی سەردانێکی قەڵای زەڕاس قەڵای خواجە بکەین.

## ٥ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

فێنکی بەیانی کەوتینە ڕیٚ بۆ قەڵای زەڕاس. کەوتووەتە سەر ڕێگەی دامەزراوەی سەدی ڕەزاشا، کۆمپانی فەرانسا ساسر لەویٚ خەریکی کارکردنن. سەردانێکی ئەوانمان کرد و بە هۆی دیگارەوە فەرەنساییەکان زۆریان حورمەت پێکردین. نیگابانی و چاوەدێری ئەویٚ لە دەست بەختیاریدایە، ئەسکەندەر سوڵتانی و یاوەر سوڵتانی، ئەو دوو برایە لە گەورەکانی تایەفەی گەندالین. ئەوەڵی نیوەڕۆ گەیشتینە قەڵای زەڕاس. ڕێگەی شۆستەی هەیە و بە ملەی کێوەکاندا سەر دەکەویٚت، لەو ناوەدا پاسگەی ژاندارمری زۆر قەدری گرتین. مەودای مەسجد سلێمان و قەڵای زەراس ١٢ فرسەخە، واتە ٧٢ کیلۆمەترە. پرسیارمان کرد و زانیمان مەودای قەڵای زەراس تا دلی حەمە حوسێن خان ٧٢ کیلۆمەترە. لە قەڵای زەراسەوە تا شیمبار ١٨٠ کیلۆمەترە، نانی نیوەڕۆمان

خوارد و ملی ڕێگەمان گرتەبەر بۆ قەڵای خواجە. لە نیوەی ڕێگەدا لاندوێر کەوتە قوڵکێکەوە و جووڵەی لێبڕا. تا دەمژمێر بوو بە ٨ی شەو لەبەر شۆقی چراکەوە، بە یارمەتی چەن شۆفێری تەراکتۆر و جیپی دەوڵەتی ماشێنمان کردەوە، بۆمان دەرکەوت «پلوس»ی لای شۆفێری بڕدراوە. تەواو لە کاربووین و ئەو شەوە لە پاسگە خەوتین، قەول وابوو بەیانی «دیفرانسیڵ و گربۆکس» ببەین بۆ مەسجد سلێمان بەشکەم نۆژەنی بکەنەوە یان تازەی بۆ پەیدا بکەین.

## ٦ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

خۆمان گەیاندە مەسجد سلێمان، جا وەرە پلوس بکڕە و وەستای مکانیك بێنە و جگە لەوەی پلوسەکەی دیکەشی شکابوو، بە یارمەتی دندەی کۆمەکی بە دیفرانسیڵی پێشەوە گەیشتینە مەسجد سلێمان. زۆری کات گرتین، دەمژمێر ٥/٥ی دوانیوەڕۆ بوو گەیشتین. جەژنی ڕەمەزانە دەرگەی دەم کراوەتەوە و دەرگەیی دووکانان داخراوەن.

## ٧ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

هەر لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ کاتمان بە لای ماشێنە شکاوەوە تەواو بوو. دوای نیوەڕۆ تووشی مەلا فەیزوڵای سادقی (مۆری) هاتین و سەبارەت بە ئێلی مۆری قسەمان کرد. ئەویش هیچی تازەی پێ نەبوو. ئەمەی ئەوڕۆ ڕووی دا بۆ خۆی کارەساتێك بوو. گوتمان، خەڵکی ئەم ناوە بە سواری پیکاب هاموشۆ دەکەن. بەتایبەت ڕێگەیەك لە چاوی مەعمۆری دەوڵەتەوە نەدیو بێت. ڕۆیشتنی پیکاب بەسەر ئەم ڕێگەوبانەوە کاری مرۆڤ نییە و کەری دجاڵی دەوێ. وەك مێگەل خەڵکی تێ دەپەستێون. وەختێ ماشێنێك ئاوا دەبینی، وا دەزانی خەڵك لە سەری پوورەی داوە. تەنیا کونێك ماوەتەوە کاکی شۆفێر دەرەوەی پێدا ببینێت: «بەرچاوم بەردەن، ڕێگەی دندەم لێ مەگرن، قاچ لەسەر تورمز لابەرە و...» زۆریەك لە شۆفێرەکان بۆ ئەوەی بتوانن خەڵکی زۆرتر کەڵەکە بکەن، شاسیی ماشێنەکان بەرز دەکەنەوە. هەتاکو لە پێچ و گەوەیەك دەربازت دەبێ ڕۆح دێتە سەر کونی لووتت. کەسێك بە ناوی سەی جەلال ئەو کارەی لەگەڵ پیکابەکەی کردبوو. پیاوێکی خەپلەی دیان تەلا. دوێنێ کە ئێمە ماشێنەکەمان خراپ بوو ئەویش بە

پیکابێکی پڕ لە خەڵکەوە بەرە و قەڵای خواجە دەڕۆیشت، ئێمەی دیت و ڕایگرت. ئەحواڵپرسی کرد و ڕۆیشیت. دواتر هەواڵیان هێنا سەی جەلال بە ماشێنە مووسافیرەوە هەڵدێرداوە بۆ قووڵایی دۆڵەکە. خۆی مردووە دوو کەس لە مامۆستایانی «سپای نیش» لە پێشەوە دانیشتوون، مردوون، بیست و چەند کەس لە پشتەوە بوون هەر هەموویان مردوون و لەو دۆڵەدا لە تەرە دراون، سبەی دەیانهێنن بۆ مەسجد سلێمان. ئەو کارەساتە تەواوی ئێل و عەشیرەتی خەمبار کرد.

بە نابەدڵی و بۆ بەرگریکردن لە برسێتی لەگەڵ مەلا فەیزوڵا شێومان خوارد و دەرگەی قسە و باسمان کردەوە، چەند بەختیارییەك هاتنە نێو باسەکەمانەوە و بازاڕی قسەمان خۆش کرد و ئەوەی ژنەوتم یادداشتم کرد. دورکی و بابادی خینەچوو بوون و بێهداروەند و چوار لەنگ. لەو سەردەمەدا بەرپرس و خانی ئێل لە ئەستۆی «ئیسترکییان بوو« وا دەر دەکەوت بەشێکن لە بابادی و خینەچووی ئەوان (دورکییان). دوورکیگەل بەربڵاو و کەم بوون و بە هۆکاری دیکەوە نەیانتوانی پشتیوان بن. ئیسترکی بە چۆکدا هات و چوار لەنگ سەرکەوتوو بوون. سەرۆکییان لە ئیسترکیگەل سەند و چوار لەنگ هاتە پێشێ و عەلیمەردان خانی چوار لەنگ بوو بە سەرۆك ئێل و بە ناوی خۆیەوە سکەی لێدا.

شەڕی مونار، شەڕی نێوان دورکی و بێهداروەند بوو. خینەچووی دورکی، تایەفەی بابادی بوون. تایەفەی گەلە و ڕاکی خینەچووەکانی بێهداروەند، لەو شەڕەدا جەعفەرقوولی خانی دورکی لە تایەفەی زەرئەسوەند کوژرا.

شەڕی کلینچین لە (کێوەزەرد)، بە هۆی ئەوەی بێهداروەندنەکان نۆ هەزار سوار بوون بەو شەڕە دەڵێن، شەڕی نۆ هەزار سوارە. ئەمەش شەڕی نێوان دورکی و بێهداروەند ڕووی دا. تەواوی بابادی خینەچووی دورکی بوون و چوار لەنەگ خینەچووی بێهداروەند، بەڵام چوار لەنگ ڕاستەوخۆ یارمەتی نەدەکرد. لەو شەڕەدا بێهداروەند، تێك شکا و خۆی گەیاندە دژی ئەسەدخان (لە حەوت و چوار لەنگ، دۆڵی بابا ئەحمەد خۆی داڵدە دا.

شەڕی گلە تازە، شەڕی نێوان دورکی و چوارلەنگ بوو. خینەچووی دورکییان، بابادی بوون و خینەچووی چوارلەنگ بێهداروەندەکان. بێهداروەند ڕاستەوخۆ یارمەتی نەدەکرد. لەو شەڕەدا چوارلەنگان تێك شکان. لەو دوو شەڕەی دوایەدا چوار لەنگەکان و

بێهداروەندەکان، لەگەڵ ئەوەی بە ئاشکرا یارمەتیان نەدەدا، بەڵام لەژێرەوە یاریدەی خینەچووی خۆیان دەکرد.

بۆ ڕوونکردنەوە، ئەگەر لە شەڕێکدا دوو تایفەی a و b بەشەڕ بێن، تایەفەی c خینەچووی تایەفەی a و تایەفەی d خینەچووی تایەفەی b بێت. ئەگەر خینەچووی تایەفەیەك یارمەتی نەدا، خینەچووی دیکە نابێ یارمەتی بدا و تەنیا دوو تایەفەکە بە یەکەوە بەشەڕ دێن.

شەڕی بەردەشە، لە شوێنی هاوینەهەواری چوارلەنگ، لە نێوان دورکی و چوارلەنگەکان دەستی پێکرد. بابادی خینەچووی دورکی بوو، بێهداروەند خینەچووی چوارلەنگ، بەڵام نەیتوانی کارێك بکات. هەرچەندە عەلی داد، سوارێکی دورکی لە تایەفەی زەڕئەسوەند، جوامێرێکی سەرکەوتووی ئەم شەڕانە بوو، تۆرا و خۆی گەیاندە بێهداروەندەکان. چوارلەنگەکان دیسان بە چۆکدا هاتن. بۆ نموونە زانیمان لە تایەفەی بابادی ، ٧ منداڵ لە تیرەی ئارپەنایی و ٤ منداڵ لە تیرەی میرکائد بە یەکەوە خینەچوون. منداڵێك لە تیرەی تەقی عەبدولاّیی لەگەڵ یەك منداڵ لە تیرەی لەك و تەواوی حاجیوەرەکان و ئەحمەد سمالییەکان و جەلیلەکان و ٢ منداڵ لە تیرەی منداڵەکاتن بە یەکەوە خینەچوون. لە تایەفەی مۆری: تیرەی حەسەنوەند لەگەڵ تیرەی کەریموەند، لەگەڵ تیرەی عەبدەوەند، لەگەڵ تیرەی ئۆروەند، لەگەڵ تیرەی قەریوەند و تیرەی قاسمعەلیوەند تەواویان بە یەکەوە خینەچوون. جگە لەمانەش تیرەکانی عەلیجانوەند و مۆری و گورداگونی و کەمەر تەلاّیی تەواویان خینەچووی یەکدین. لە کاتی پێویست و بۆ دابەشکردن و هاوسەنگیی بەشەکان، لە قەریوەندان چەند سوار یارمەتیی تیرەکانی کەریموەند، عەبدەوەند و عەبدیوەند دەدەن. لە ڕاستیدا عەبدیوەند لەگەڵ حەسەنوەند لەگەڵ ئۆروەند، باقریوەند خینەچوون.کەریموەند لەگەڵ عەبدەوەند و قاسمعەلیوەند خینەچوون و بە یارمەتیی قەریوەندان لە کاتی ئەستەمدا سێ قۆڵی چوار تیرەی بەهێزی هاوبەش لە تایەفەی مۆریدا یەك دەگرن. نیزامی خزمایەتی لەگەڵ مەسەلەی خینەچوویی تەواو جیاوازی هەیە. هێزی ئەم نەریتە خینەچووییە وا هاوسەنگی تەواوی لەنێو ئێلدا پاراستووە، نەك هێزی نیزامی خزمایەتی. زۆرینەی مۆریگەل و بابادییەکان خزمایەتی نێزیکیان هەیە، بەڵام لە وەختی مەترسیدا هیچ وەختێك پشت ناکەنە تایەفەی گەندەلی. بۆ ئەوەی تایەفەی بابادی بگرن. واتە دەستووری خینەچوویی دەسەڵاتی بەسەر ئێلدا هەیە نەك باری خزمایەتی. هێزی پاڵپشتی خینەچوویی مۆریگەل و گەندەلییەکان هێندە پتەوە تایەفەکانی

دیکەش ئێرەییان پێ دەبەن. تەنانەت هەوڵ دەدەن ئەوان بە گاڵتە بگرن. هەر کەس بیهەوێ بڵێ من خراپم دەڵێ، مەگەر من مۆرگەندەلیم. هەڵبەت وەك سنگ بە سنگ هاتووە، دەڵێن خینەچوویی لە خزمایەتییەوە سەری هەڵداوە. بۆ نموونە ئەگەر مۆری و گەندەلی خینەچوویی یەکدین. هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە باوەگەورەی مەزنەکان لەگەڵ یەکدیی برا بوون.

هەڵبەت لەوانەیە ئەو مەسەلەیە لە نێوان تایەفەی بچووکدا هەر وا بێت، بەڵام لە نێوان ئێلی گەورەدا وا نییە و وەك دەڵێن، بە پێی پەیمانێکی پتەو ساز بووە. ئەوان دەیانگوت، وشەی کەلانتەر و کەلانتەری لە دەورەی ڕەزا شاوە داکەوتووە و پێشتر هەر نەبووە. بەلان یەکەم کەسێك وشەی کەلانتەری پێ درا، ئەمانولاخان لە تایەفەی بابادی بوو. (باوەگەورەی فەرامەرز و جەهانگیرخان). سەبارەت بە خاوەنداریێتی مۆرییەکان دەیانگوت، لە زەوی بەختیاریدا بە هیچ شێوەیەك موڵکی بەشنەکراو نییە و تەواوی زەوی و زاری بەختیاریی لە باپیریانەوە بەسەر کوڕەکانیاندا بەشکراوە و هەر کەسەی زەوی لە کێڵگە و لەوەڕگەوە بەدەست خۆیەتی ئەگەر بیفرۆشێت، بەڵام لە پێشدا دەبێ بە دراوسێی خۆی کە شەریکە ماڵییەتی بفرۆشێت. ئەگەر ئەوان نەیانتوانی لێی بکڕن، دەبێ ئیزن لە ئەوانی دیکە وەربگرێت، تاکو بۆ نموونە مۆرییەك بتوانێ زەوی خۆی بە بابادییەك بفرۆشێت. هەڵبەت تا ئێستە شتێکی وا ڕووی نەداوە و دەوروبەریش ئەم ئیزنە بە کەس نادەن. کڕین و فرۆشتن بە پێی بنجاقەکان بەڕێوە دەچێت و زامنی بەرێوەبەری ئەو، واژۆ و مۆری مەلاکانە لەنێو ئێلدا کە دەدرێ لەژێر نووسراوی بنجاقەکە.

دەربازگەکانی تایەفە لەگەڵ مۆرییەکان کەوتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. ئەگەر هەلێەك لە ئارادا بێت، دواتر ساخی بکەینەوە. مۆرییەکان بە گشتی لە دۆڵی بازفتن. هیچ وەختێ بە کێوە زەرددا تێناپەڕن، بەڵام لەبەرئەوەی تەواوی تایەفەکان بۆ هاتوچۆی گەرمێن و کوێستان لە کێوە زەردەوە ڕادەبرن، لە موڵکی مۆرییەوە دەچنە دەرێ. مۆرییەکان دەیانگوت: زەرئەسوەند، ڕاکی، مل مولیل، مەڕداری تورکی شاریکوردن، تەواوی تایەفەی دیناران بە پردی شالوودا دەچنە ئەوبەر. گەندەلی، شەهنی، گمار، نەسیر، گەندایی لە کێوە سپییەوە ڕەت دەبن و دەگەنە بازفت و لە دەربازگەی چەری دەچنە دەرێ. حەمۆلە، گەندەلی، بابا ئەحمەدی، مەنجزی، تەواوی بێهداروەند لە زەردە و چەرییەوە تێ دەپەڕن. بابادی، گلە، ئەحمەد مەحموودی، ئێسیوەند، پەبدیدی، بابا

ئەحمەدی، زلّقی، بە چخری و زەردە و پەنبەکاردا دەڕۆن. چاربووری، ئیسترکیف مەنزایی، چوارلەنگەکان تەواویان دەچنە لەپەد و لە ڕێگەی ئاغا سەعید و دەربازگەی «کی نو» لە کێوە زەردەوە ڕادەبرن. مۆری ڕێگەی ناکەوێتە کێوە زەرد. ڕێگەی ئێلی ئەو لە گەرمێنەوە بۆ هاوینەهەوار بەم شێوەی خوارەوەیە:

ئەندیکا، لە ڕێگەی مونار و دللا بۆ پێش شیمبار. لەبەرئەوە لە پێش شیمباردا ئاو و مولّکیان هەیە. دە ڕۆژ لەوێ باروبنە دەخەن. لە ڕێگەی هەزار چەمەنەوە تا ڕازی، لرکی خان دەگەنە بازفت و لەوێ بڵاو دەبنەوە. واتە ١٤ ڕۆژ دوای جەژن لە ئەندیکاوە دەکەونە دێ، هەر بەو ڕێگەیەدا کە گوتم، درێژە بە سەفەری خۆیان دەدەن. یەکەم وچانیان لە «دینە ڕاك» دەست پێ دەکات. دووەم ڕاوەستان لە « شێلال»، سێیەمیان لە شیمبار و چوارەم وێستگەیان لە چلو (لە شیمبار و چلو ٤ تا ٥ ڕۆژ دەوێستن)، وێستگەی پێنجەم لە « مۆری»، شەشەم لە «هەزار چەم» و دواتر دەگەنە بازفت و لەوێ بڵاو دەبنەوە. لە هەر یەك لەو وێستگانەدا تەنیا شەوێك دەمێننەوە. هەڵبەت باسی چلو وشیمبارمان کرد. لە بازفت لە گلە سێ گا (نێزیك ئاغا سەعید)، یان مەوەرز (نێزیك کەلی چەری) بڵاو دەبنەوە.

تورکانی ورد و غوەلاّمخواستیی ئەسفەهان لە ڕێگەی شاریکوردەوە دێنە شۆراو و دەشتی زەڕی و دەگەنە کوهڕەنگ و شێخ عەلیخان و لەوێوە دەگەڕێنەوە بۆ دەرئاو. ئەردەل، چۆخەخۆر و دواتر دەچن بۆ لاب شیراز. ٢ ساڵ پەیتا پەیتا، ٣ بنەماڵەی ئەو تورکانە لە شێخ عەلیخانەوە تێ پەڕین و لە ڕێگەی زەردە و ڕێگەی چەرییەوە چوونە بازفت و لە ڕێگەی لرکی خان و ڕێگەی مونارەوە چوونە گەرمێن و لالی. ئاژەڵدارانی شاریکورد، لە شاریکوردەوە دەچنە دەشتەك و دواتر بەوێدا دەچنە چەری، دیناران، کێوە سپی، سوسەن، ئیەوە، لەمیر، نەوتە سپی و تەمیهە. ئاژەڵی خۆیان دەلەوەڕێنن و هەر لەو ڕێگەیەوە دەگەڕێنەوە (هەڵبەت ئەوانەی لە کێوە زەردەوە ڕادەبرن).

شەو زۆر درەنگ و ئێمەش خەومان دەهات. مەلا فەیزوڵا تەماشایەکی ئاسمانی کرد و گوتی، سبەی دەبێتە تەپ و تۆز. هەوا زۆر ساماڵ و جووڵەی هەور و با نەبوو. پرسیم بۆچی؟ گوتی: ئەو ئەستێرەیەی لەگەڵ مانگ هەڵدێ، ئەگەر بکەوێتە پشت کەوانەی مانگەوە ئەوا هەوا باش دەبێ، ئەگەر بکەوێتە پێشی ئەوە بزانە دەبێتە تەپوتۆز و

گێژەڵووکە. سەیرکە ئەو شەو کەوتووەتە پێش مانگەوە، مانگیش تووڕەیە و دەمی لێ داپچڕیوە. دیگار گوتی، ئەم مۆریگەلە ئەزموونیان هەیە و سبەی قسەکەی وەدی دێت. ماڵئاواییمان لێ کرد و خەومان دەهات.

## ٨ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

ئەمڕۆ لە مەسجد سلێمانین، پێشبینی مەلا فەیزوڵا تەواو وا بوو. شەو سامال و ئێستەش ئاسمان هەور و هەڵا و نێوچاوی تێك ناوە و چەخماخە و هەور و بارانە. لەگەڵ بەڕێز پەرچەمی، کەلانتەری دیناریگەل ئاشنا بووین و قەول و قەرارمان دانا لە کاتی خۆیدا بیبینین. ئەمڕۆکە هەر کەسێك لە مەسجد سلێمان دەبینی باسی کەوتنە خوارەوەی پیکابی سەی جەلال دەکات. ٢٦ کەس کوژراون یەکیان خزمی نێزیکی مەلافیزولا بوو. ٤ کەسی مۆریان لەگەڵدا بووە. مەلا فەیزولا ئەمرۆکە ئەوانی ناشت. عەسر چووینە مردووشۆرخانە، نەناسێك لەوێ بوو، تاکو مەلا بیناسێت، بەڵام نەیناسی. مەسجد سلێمان تازیەبارە. چووم ئەگەر تەلەفۆن بکەم بۆ تاران، کەچی تەلەفۆنخانە لەبەر هەواڵنێر جمەی دەهات. بەردەوام هەواڵەکان دەدەن بە تاران. لەگەڵ مووسای جەهانگیری نانی نیوەڕۆمان خوارد. دەمژمێر ٧/٥ی شەو ئاسمان سیپاڵی هەوری لادا و ئەستێران دەرکەوتن. هەسارەکەش کەوتووەتە پشت کەوانەی مانگەوە.

## ٩ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

بەیانی سەرقاڵی چاککردنەوەی ترمزی دەستی بووین. دواتر چووین لە تەلەفۆنخانە هەواڵی سەلامەتی خۆمان بدەین بە تاران. ئەوسا باس لەسەر کاروباران. مووسا خانی جەهانگیریمان دیت، چاوەڕێی جەعفەرقوولی ڕۆستەمی و محەمەد پەرویزی بوو. تاکو لەگەڵ فەرماندەی گورهان، سەروان درەخشەندە، لە مێژ نییە هاتووەتە ئەم ناوچەیە، دەبێ بچن چارەسەری شەڕ و هەرای ئەو خەڵکە بکەن، لەنێو ئێلدا حەیوان دزرابوو. بگرە بە شێوەی کەیخودایی کێشەکە یەکلا بکەنەوە. وەك مەعلووم بوو دەستەیەك لە

بابادیگەل ماڵی مۆرییەکانیان دزیوە. مۆرییەکان چوونەتە سەریان و ئەوەی بردوویانە لێیان سەندوونەتەوە. بابادیگەل چون شکایەتیان کردووە و دەڵێن، مۆرییەکان ماڵی ئێمەیان بردووە. بووەتە شەڕ و پێکدادان و لە مۆرییەکان کەسێك کوژراوە. چوار کەسیش لە بابادیگەل زیندانی کراون. هەر دوو تایەفە بەسەر یەکدا شێواوە و لەنێو ئێلدا باس باسی ئەم ڕووداوەیە.

پێشتر بیستبوومان ـ منیش لە جێیەکدا نووسیبووم ـــ بامدییەکان قەرزی خوێنێکیان لەسەر بابادییەکانە، واتە خدرییەکانی تیرەی میرکائد لە تایەفەی بابادی، لە ساڵی ١٣٤٠ سەیفولاَی بامدی کەلاَنتەری تایەفەی بامدی لە چاڵمونار لە کاتی کۆچ و کۆچباردا دەکوژن، نەیانتوانی ئاشتەوایی بکەن و خوێنبەست نەکرا، ئێستەش ئەوان شیر لە یەکدی دەسوون و یەك بابادیش ناوێرێ بە مولْکی بامدیدا بڕوات. تازە بیستوومە ئەو کەسەی کوژراوە لە تیرەی میرکائد تایەفەی بابادی و قاتلْ لە تیرەی حاجیوەر تایەفەی بابادییە. نازانم ئەمە بۆچی ئاوایە. هەڵبەت دواتر بۆم ڕوون بووەوە. لەنێو تایەفەدا خینەچوویی هەیە و کاریش دەکەن، هەروەك میر کائد لەگەڵ ئاریەنایی کە هەردوویان لە تیرەکانی بابادین و لەگەڵ یەکدی خینەچوون. بە یەکەوە دانیشتبووین و قسەمان دەکرد و ئەوەی دەمانبیست، دەمانووسی. ئەو خەڵکە لەگەڵ ئەو نووسین و یادداشتەی ئێمە ڕاهاتوون و گەلەیی و بۆڵەیان نییە. بیستبووم لەنێو ئێلدا بۆ مردوو سەرەخۆشی و پرسە دادەنێن. لەنێو حاجیوەندەکان و مەمیوەندەکانی چوارلەنگ داب وایە ئەو کەسەی دەچێتە پرسە، خەرجی خواردنی خۆی دەبات و خاوەن مردوو ناخاتە زەحمەتەوە. وەکو لەنێو چوار لەنگدا باوە، لە کاتی سەرەخۆشیدا ئەو کۆمەڵە چادرەی بە یەکەون، وەختێك چەند میوان بۆ سەرەخۆشی دێن، لە یەکێ لە ڕەشماڵەکاندا دادەنیشن و لە چادرەکانی دیکەوە نانی نیوەڕۆ یان شێویان بۆ دێت، لێرەدا خەرجی ناکەوێتە سەر شانی خاوەن مردوو. ئەمەش لەکن خۆیان پێی دەڵێن «لامێردون»، لەنێو حەوت لەنگان خەڵك هەتا ساڵێکیش هەر دێن بۆ سەرەخۆشی. لەوێ دەخۆن و سەرەخۆشی دەکەن و دەڕۆنەوە. هەڵبەت بڕە پارەیەك دادەنێن و ناوی سەرباریان لێ ناوە، خزمی نێزیك پارەی نەغد یان مەڕ دەهێنن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا هاوکاریکردن و هەرەوەزێکە. هەر وەك

لە کاتی مەڕبڕینەوەدا ئەو کارە دەکەن، لە هاویندا وەختێ شیر کەم دەبێ هەر ڕۆژی ڕەشماڵێك شیرەکە کۆ دەکاتەوە و دەیکاتە ماست و پەنیر. لە زەماوەندەکاتنیش تووشماڵ پارە بۆ خۆیان کۆ دەکەنەوە و پێی دەڵێن «کڵاو گەردوون»، (کڵاوگێڕان). ئەگەر پووڵەکە لەو ڕێژەیەی کە دیاری کراوە زۆرتر بێت، ئەوە دەبێ لەگەڵ ماڵی زاوا بەشی بکەن. لە کاتی ئاشتبوونەوەدا هەردەم خزم و کەس یارمەتی دەکەن و خوێنەکە دادەکوژێنن. سەرەتا خوێنێك بە ٣٠٠ تمەن داکوژاوە، دواتر بووەتە ١٠٠٠ تمەن و ئێستەش گەیشتووەتە بیست هەزار تمەن. ئەگەر کوژراوەکە لە خان و کەلانتەران بێت ئەوە بایی خوێنەکەشی زۆرترە. چەند ساڵ لەوە پێش بۆ خوێنی سەیفوڵا بامدی جەڵەبێکی سێسەد سەرییان کاوڕ بۆ ناردن. کەسەکانی ڕازی نەبوون. ئەو کچەی لە بری خوێن دەیدەن بە ماڵی کوژراوەکە، لەوانەیە ٥ مانگە یان دوو ساڵە یان گەورەتر بێت. ئەو کچە دەبێ دانیشێ تاکو گەورە دەبێ، دواتر یەکێ لە کەسە نێزیکەکانی کوژراوەکە مارەی دەکەن. بۆ دامەزراندنی ئەو کارەش سەنەد و قەباڵە دەنووسرێت. ناوی کچەکە و ناوی بابی لەو قەباڵەیەدا دەنووسن. ئەگەر هات و ئەو کچە مرد کچی دیکەیان لێ ناستێنن. ئەو کچەی بە بەرخوێن دەچێ هەمێشە وەك کۆیلەیەك لەو ماڵەدا خۆی دەبینێ. سەرەتا زۆری دەبوغزێنن، بەڵام وەختێ مندالی لێ کەوتەوە بۆی باش دەبن. لەنێو بەختیاریدا بیستوومە، وەختێ مێرد لەگەڵ خێزانی خراپ وەجووڵێ، ژنە پێی دەڵێ «بۆ مەگەر لە تۆڵەی خوێن دراوم؟»

بۆم دەرکەوت، زۆرینەی تایەفەی بەختیاری لەگەڵ مۆرییەکان لە ژن و ژنخوازییەوە تێکەڵ بوون. سەبارەت بەم نێزیکایەتیە پرسیارم لە مووسا جەهانگیری کرد. گوتی: یەکەم، کچانی مۆری تا بڵێی جوانن. دووەم، زۆریش ناستێنن، سێیەم، ناوچەی مۆری دەربازگەی عەشیرەتانە و هەموو تایەفەکان بەم شوێنەدا تێ دەپەڕن، هەر کەس چاوی بە کچێکی جوان کەوت، بەبێ ماتڵ بوون دوو جوانەگا دەدا و خوازبێنی لە کچە دەکات و مارەی دەبڕێت.

پێویست بوو هەواڵێك لە بازفت بزانین، تا ئەو کاتەی وڵاخی سواریمان دەست دەکەوێ و دەکەوینە ڕێ. بازفت لە سێ بەش پێك هاتوو، بازفتی سەرێ (لە باکوری خۆرئاوا) ناوچەکانی برێتین لە: گلە سێ گا، غەل فنجان، بەردێ گەپ، ئستر، لم لمی، مامرخڕە، جیلان. بازفتی نێوەڕاست: دێناش، سەرگلان، کۆشکا. بازفتی خوارێ: چەم قەڵا،

مەورەز، دۆڵی دورك، شێخ ڕوبات. بازفتی خواریٚ لە زەردە و چەرییەوە نێزیکە و بازفتی سەریٚ نێزیکی ناوچەی گەرمێنە.

ئەمڕۆ وا دیارە هەوا لێك لە هاوڕێیان نییە. ئێمەش لەگەڵ ئەم بەختیارییانە بێکار دانیشتووین و خەریکی قسەکردنی خۆمانین. قەول وایە تاکو ئێوارە بە یەکەوە دانیشین. ئەگەر هەر نەهاتن بەیانی بچین بۆ شوشتەر و گەتوەند. لەویٚ درێژە بدەین بە باسەکەمان. نەخشەکانیش لەبەر دەستماندایە. لە شانی باشورەوە یەکەم دەربازگەی عەشیرەتان، ڕێگەی «دەسپارت»، ڕێگەی ئەویٚ لە گەرمێنەوە بۆ کوێستان بەو چەشنەیە: مەسجد سلێمان، ئیزە، دینەراك، سەر پردی شالو، دێدژ، بەرید پرد، هەلیسا، دووپولون، ئەردەل، چۆخەخۆر، پێی دەڵێن، ڕێگەی دەسپارت، تایەفەی دیناران، ڕاسوەند، ڕاکی، بەوێدا تیٚ دەپەڕیٚ. ڕێگەی باکوری دەبێتە بابا سەعید، چوار لەنگ پێیدا ڕادەبرن. مەسەلەی ئاژڵ و لەوەڕگە لەنێو ئێلی بەختیاریدا هەمیشە گرینگی پیٚ دراوە. کارناسێکی بەشی لەوەڕگەی وەزارەتی کشتوکاڵی هاتووەتە مەسجد سلێمان، ئەمڕۆ دەیگوت: هەر ئێستە نێزیکەی ۸۰ ملیۆن سەر بزن و مەڕ لە ئێراندا هەیە و لەوەڕگەی ئێمەش بەشی ۳۰ ملیۆن بزن و مەڕ دەکات. نێزیکەی ٥٠ ملیۆن سەر ئاژەڵی زیادی هەیە و ئاژەڵداران نایفرۆشن. بە هۆی ئەوەی نەخۆشی و مندارەمانگ زۆر کەمە، ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم ڕێژەیە ڕوو لە زیادبوونە. هەر وەك ئاژەڵدارێك گوتی، مەڕدار کوندە و مەشکە دەکرێت و ئامادە نییە بزنێکی خۆی سەربڕێت. ئەمڕۆ ئەو کەسانەی لە دوورەوەی ئێمە دانیشتوون، هەر هەموویان کەیخودا و ڕیشسپی و مەڕدارن، ئەم ئێلاتییانە زۆریش باوەڕیان بە ئێمە هەیە، دەزانن نە تفاقیان دەدەینیٚ و نە سزاشیان دەدەین. بێکارن و لە مەسجد سلێمانن، ئەگەر بتوانین سیایی ئاژەڵەکە بە تەواو بگرین کارێکی باشمان کردووە، هەرچەند دوور بە دووریش بێت هەر باشە. دەیانگوت، ئاژەڵدارێکی تیرەی حاجیوەر، لە تایەفەی بابادی هەر ئێستە لەگەڵ براکەی نێزیکەی ٤٠٠٠ سەر ئاژەڵیان هەیە، بەڵام ئیجازەی ۲۰۰ سەریان داوەتیٚ. لە تایەفەی بابادیدا نێزیکەی ۱۲ ماڵ زیاتر لە ۱۰۰۰ سەر مەڕیان هەیە. بە کەم و زۆرەوە کەلانتەر و ڕیشسپیانی بابادی دەیانگوت:

تیرەی سیراجەدینی، ڕەزایی و بابادی نێزیکەی ١٠/٠٠٠ سەر، تیرەی خۆشنامی ٦٠٠٠ سەر، تیرەی ڕکان ٦٠٠٠ سەر، تیرەی شێخ ٥٠٠٠ سەر، تیرەی خدری ٢٠٠٠٠ سەر، تیرەی نەجەفی ٤٠٠٠ سەر، تیرەی یوسفی ٣٠٠٠ سەر، لە تایەفەی بابادی تیرەکانی حەمە حوسێنی ٢٥٠٠٠ سەر، تیرەی غەیبی ٢٠٠٠٠ سەر، تیرەی بەدری ٤٠٠٠ سەر، تیرەی جەلیل ١٠٠٠٠ سەر، تیرەی تەقی عەبدولایی ٦٠٠٠ سەر، تیرەی ئەحمەد سمالی ٣٠٠٠٠ سەر، تیرەی بیر١٠٠٠٠ سەر، تیرەی خوادادوەند ٩٠٠٠ سەر، تیرەی کیسیدی ٧٠٠٠ سەر، تیرەی شێختازەیی ٥٠٠٠ سەر، تیرەی ڕێکیدی ٧٠٠٠ سەر، تیرەی مندالّی خەسرەو خان٨٠٠٠ سەر، تیرەی مندالّی میرزا عەوس ١٢٠٠٠ سەر، تیرەی جەهانگیری ٧٠٠٠ سەر، جەعفەرقوولی ڕۆستەمی لەگەلّ براکانی ٣٠٠٠ سەر، مندالّی ئەلاوەش خان ١٠٠٠ سەر، تیرەی لەك ٦٠٠٠ سەر ئاژەلّیان هەیە و سەرجەم ٢٢٤٠٠٠ سەر، بە بۆچونی ئاژەلّدارێك چەند ڕۆژ لەوە پێش دەیگوت، من باوەڕم وایە بابادیگەل نێزیکەی چوار هەزار بنەمالّەی عەشیرەتین، نێزیکەی ٣٠٠٠٠٠ سەر مەڕ و مالاتیان هەیە و هەروەها نێزیکەی دە هەزار تا پازدە هەزار سەر ئەسپ و هێستر و ماینیان هەیە. سی سالّ لەوە پێش وەختێ زیندەمالّ و مردەمالّی ئێلی بەختیارییان بۆ مالّیات سەندن ساخکردەوە سەرجەمی بنەمالّەی ئێل نێزیکەی ٣٠٠٠٠٠ خێزان بووە، بەلام ئێستە ڕوون نییە چەندە. ئەوەی ئێمە پرسیومانە تەقریبییە و تەواو نییە و دەتوانین بلّێین نێزیکی دەکاتەوە و لە هیچ باشترە. هەر ئێستە بابادی باب نێزیکەی ١٥٠٠٠ خێزانە، بێهداروەند ٦٠٠٠ خێزان، مۆری و گەندەلی ١٢٠٠٠ خێزان، حەمۆلە ٨٠٠ خێزان، بابر ساد ٦٠٠ خێزان، کاکەش ١٠٠٠ خێزان، زەڕئەسوەند ١٠٠٠٠ خێزان، دیناران ١٥٠٠٠ خێزان، بابادی عەکاشە سێ میرەدێ ١٠٠٠٠ خێزان، چوار بوری و ئسترکی ٣٠٠٠ خێزان، چوارلەنگی کیان ئێرسی ٣٠٠٠ خێزان، چوار لەنگی مەحموود سالح ٤٠٠٠ خێزان، چوارلەنگی مەمیوەند و حاجیوەند ١٢٠٠٠ خێزانن، کۆی ئەوانە نێزیکەی ٩٢٤٠٠ بنەمالّەن.

لە مووسای جەهانگیریم پرسی، بۆ بە تایەفەی ئێوە دەلّێن بابادی؟ گوتی: «یەکەم کەسێك کە لە دەورەی پێغەمبەردا دینی ئیسلامی قبوولّ کرد ناوی بابا بوو، ئیتر لەوە بە دواوە پێیان گوت، باوەدین، دواتر کورت کراوەتەوە و بووە بە بابادی و ئێمەش

هەموو تۆرەمەی بابادین». منیش نووسیم. پێشتر ئەو باسەم بیستبوو. پرسیم بۆچی ئێوە بابادی عالی ئەنوەر و بابادی عەکاشەن؟ گوتی: « ئەنوەر ناوێك، دوو کوڕی هەبووە بە ناوی عالی و عەکاشە. حەزرەتی ئیمام ڕەزا ئالآیەك دەدا بە عالی و کەشکۆلێك بە عەکاشە. بابادی عالی ئەنوەر پێشتر بۆ هەر لایەك دەچوو ئەو ئالآیەی لەگەڵ خۆی دەبرد، بەڵام بە هۆی ئەوەی پەڕپووت بوو، ئێستە لە ئیمامزادە شا پارێزراوە. ئەم ئیمامزادەیەش هەر ئەو قسنەیە لە نێزیك شیوی بابا ئەحمەد بینیمان. گومبەزی هەر لە گومبەزی دانیالی نەبی دەچێ و ناوی سەید محەمەد پارێزکارە (دەڵێن کوڕە گەورەی ئیمان ڕەزایە) و دەڵێن، شەجەرەنامەیان لە ئیزەیە و بە قەڵەمی باوە زاهید نووسراوە و تایەفەی بە ناوی کوردان ناو بردووە. هەر وەها بابادی عالی ئەنوەر و بابادی عەکاشە لەوێوە هاتوون (بیستم عەکاشە تێکەڵی سێ وشەی ئاو، گا و ڕەشە).

ئاغا مووسای جەهانگیری گوتی: «ئێستە کە باسی ئێمامزادە کرا، خراپ نییە بزانی لە داوێنی کێو مونار ئیمامزادە عەبدوڵا نێژراوە. دوو بەردی ڕەشی کەللە قەندیی لێیە، هەر وەختێ باران نەبارێ یەکێك نەزر دەکات و لەوێ جوانەگایەك دەکووژێتەوە. سەیدەکاتنی ئەوێش ئەم بەردانە دەردەهێنن، لە کێڵگەکاندا بەسەر پێوە دەێچەقێنن، بەو نیازەی باران ببارێ، بە دڵنیاییەوە باران دەبارێ. لە نێوان کێوەکەدا ئیمامزادەیەك هەیە بە ناوی «بابا ڕوزە» لەو شوێنەشدا لە کونێکەوە هەمیشە با دێت. بەردێکیش هەر لەو نێزیکانەیە پێی دەڵێن «بەردە کەژدەم» دووپشك. دەڵێن، ڕۆژێك ئیمامزادە دۆعا دەکات بە ملیۆن دووپشك لەژێر ئەم بەردە دێتە دەرێ و هەموویان دەکووژن».

گوتم، ئێستە کە باسی ئیمامزادەمان کرد، ناوی ئەو ئیمامزادانەم پێ بڵێ لە موڵکی بەختیاریدان. بە نەریتی خۆیان تێکڕا بە دەنکی تەسبێح بۆیان هەژماردین:

١-ئەحمەد فەداله یان فەداله عومران، لە چیای چوار لەنگان (لەسەر ڕێگەی چوار لەنگان) دەڵێن، زۆر توورەیە و هەر کەس سوێندی درۆ بەو قسنە بخوات یان هەر شتێ بەو درابێ و هەڵیبگرێت خێرا دەمرێت. ڕەوەندان لە کاتی چوونە هەوارێدا ئەگەر شتی زیادییان پێ بێ لەوێ دایدەنێن و کاتی گەڕانەوە دەیبەنەوە، کەس ناوێرێ دەستی بۆ بەرێت.

٢-باوە ڕوزبە، بێشکەچی یان هۆگری ئیمام ڕەزا بووە، لە چیای بابادی لە بەردە کەژدم کوژراوە، باسمان کرد.

٣-باوە زاهید، قسنەکەی لە چەلویە و مونشی ئیمام ڕەزا بووە.

٤-سولێنان برایم، لە بەشی ئەندیکا لە بەرزایی سەدی ڕەزا شا نێژراوە، دەڵێن کوڕی ئیمام مووسا کازمە.

٥- شازادە عەبدولا، گۆڕخانەکەی لە داوێنی کێوی مونارە و دەڵێن ئەویش کوڕی ئیمام مووسایە.

٦- ئاغا سلێمان، لە هەزار چەمەنە.

٧- پیر بوێر، ئەویش لە داوێنی کێوی مونارە، پێشی دەڵێن، ئەبا حەریر.

٨- بەرەکیێ، لە چەمی لالییە و ناونیشانی ئەو « ئەباقرە».

٩- ساڵە کورتەڵ، لە ناوچەی شیرین بەهار (شیمبار).

١٠- بابا ئەحمەد، لە شیوی بابا ئەحمەد تەپڵ کوتی ئیمام ڕەزا بووە.

١١- شا، (سەی محەمەد پارێزکار) لە شائاوا لە بەرزایی لالی لە نێزیك شیوی بابا ئەحمەد، دەڵێن، کوڕە گەورەی ئیمام ڕەزا بووە.

١٢- حەوت شەهیدان، لە نێوان مەسجد سلێمان و لالیدایە.

١٣- حەوت تەنان، لە نێوان حەوت لەنگ و چوار لەنگ، دەڵێن، ئەشکەوتی ئەسحابی کەهف لە وێیە و کلکی گەماڵی ئەسحابی کەهف، لە درزی کێوەکەوە دیارە و لەوێوە ئاو دەچۆڕێت.

١٤- ئاغا سەعید، لە زۆزان لە داوێنی کێوەزەرد.

١٥- ئیمام زادە گوێزە، لە زۆزانی نێزیك چلگرد لە ٦ فرسەخی زەوی تایەفەی گلە.

١٦- باوەحەیدەر، لە زۆزان نێوان چلگرد و فارسان، لە ٨ فرسەخی چلگرد بە ناوبانگە بە مالیکی ئەشتەر، ئەوان دەڵێن، مالك ئەژدەر.

١٧خاتون حەلەب، لە نێزیك چۆخەخۆر لە هاوینەهەوار.

ئەم ١٧ چاکە، ١٣یان لە گەرمێن و ٤یان لە کوێستانە. ڕەنگە هۆکارەکە ئەوە بێت بەختیاریگەل پێشتر لە گەرمێن نیشتەجێ بووبێتن و دواتر بە بۆنەی هەوارە و هەوارەوە چووبێتنە ناوچەی ئەسفەهان و کوهڕەنگ. لەوێ هاوینەهەواریان ساز کردبێ. هەر وەك

لە زمانی فارسیدا بە ناوچەی خوزستان دەڵێن، «گەرمسیر» بە ئەسفەهان بە تورکی دەڵێن «ییلاق»، ئەمەش هۆکارێکی دیکەی هەیە.

با واز لەم باسە بێنین و بزانین بەختیاریگەل دەڵێن چی. ئەوان دەڵێن، عەلاوەدینوەندەکاتن پشتی بێهداروەندەکان زۆرتر خانەکانی بێهداروەند، دەچنەوە سەر ئەوان. لە سووریە و شام و حەڵەب هاتوون و ئێستەش تیرەیەك بە ناوی عەلاوەدینوەند لە تایەفەی بێهداروەند هەیە. سا دەڵێن ئەوانەی پاشگری «وەند» دەگرن، هەموویان لە لووڕستانەوە هاتوون و لەنێو بەختیاریدا پاشگری «وەند» نییە. قەڵای قایم و بەناوبانگ ئەوەی شێوازی بیناسازی باشی هەیە هەر هەمووی لە گەرمێنە. (بنوار حەوت و چوار) لە بەرزایی باوە ئەحمەد کە باسمان کرد. (بنوار سەلواتی) لە بەرزایی لامەردانی لالی، ئەوێش قەڵا و میرنشینی لێ بووە. (قەڵای هەراتی) لە چوار فرسەخیی لالی میرنشین بووە. (قەڵاتەل) لە ئیزە تایبەت بووە، بە چوارلەنگی کیان ئێرسی. (قەڵای لووت) لە ئەندیکا قەڵای چوار لەنگی کیان ئێرسی بووە. (قەڵای ڕۆستەم یان بەردە هەژدیها) لە نێزیك گەتوەند، ئەمانەش بوونی ژیاری کۆنی بەختیاری لە گەرمێن دەردەخات. هەروەها تونێڵێك لە گەرمێن هەیە بە ناوی «ئەشکەوتی کۆن بۆ چلبار» لە تەنگەی عەمبارە سپییەوە دەست پێ دەکات و خەڵك پێیان وایە سەر لە چلبار دەردێنێ. دەڵێن، نێزیکەی ٥ فرسەخە و بە دەستی مرۆڤ سازکراوە.

پیرە مێردێك گوتی: بنجاقێکم هەیە و دەبێ ئێوە ببینن و وێنەی بگرن. تایبەتە بە خوێی سوێراو لە کوێستان. ئەو خوێیە فەتح عەلیشا فرۆشتوویە بە کاکە جەوهەر (دەڵێن کاکە جەوهەر وەزیری فەتح عەلیشا بووە). کاکە جەوهەر فرۆشتوویەتی بە خەلیل خان، دەسەڵاتداری بەختیاری. لە بنواری چوار و حەوت یان بنواری هارکلە لە نێزیکی شیوی باوە ئەحمەد. خەلیل خان ئەوێی فرۆشتووە بە فەرامەرز خان و جەهانگیرخانی بابادی و لە وانیشەوە بە وەرەسەکان گەیشتووە. وەك دەڵێن، لە دەورەی ئەمیر کەبیردا جەنجاڵێك لەسەر ئەو خوێیە ساز بوو. سەدری ئەعزەم، میرزا تەقی خان پەسندی کرد و مۆری لێدا. خۆزی دەمتوانی وێنەی لێ بگرم.

## ١٠ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

بەیانی لەگەڵ مووسا خانی جەهانگیری چووین بۆ شوشتەر دواتریش بەرەو «گەتوەند». گەتوەند شارەدێیەکە ماڵەکانی کۆنینەیە. قوتابخانە و فێرگەی هەیە و دکتۆر و دەرمانخانە و بەخشداری و کارەبای ماتۆڕی هەیە و جاریٚ لە کارەبای دژ کەڵك وەرناگرێت. بازاڕێکی هەیە بە ١٠٠ دووکانەوە. گەتوەندەکان بە لووڕی قسە دەکەن، لە کۆنەوە گوندنشین بوون. خەریکی کشتوکاڵن. گوندێکی تەواو مەزهەبییە، ١٤ مزگەوت و ٩ گەرماوی هەیە. ئێستە گەرماوی تازەی هەیە و کۆنەکان داخراون. کری دەستکردیان نییە. زۆرتر گەنم و جۆ دەچێنن، بەڵام ئەو دێیە زۆرتر لەگەڵ خەڵکی بەختیاری خەریکی ئاڵوێرن. زۆرینەی دووکانی لالی هی گەتووەندن. لەگەڵ بەختیارییەکان قەرز دەکەن و وەختی خەرمان لە کوهرەنگ حیسابیان لەگەڵ دەکەن. لە پاڵ ئەمانەشدا سەر قاڵی بەخێوکردنی مەڕ و ماڵاتن. ڕووباری کاروون بە تەنیشت ئەواندا تێدەپەڕێت. گوندی تەلایە مەسکەنی حەوت لەنگ و چوار لەنگانە. کێڵگەی ئەوان هەمووی دێمەکارە. وەك دەڵێن، لە تەك خوداد مامەڵە دەکەن. ئاوی کاروون کێڵگەکانی ئەوان ناگرێتەوە. گەتووەندەکاتن، بەختیاری نین. ئەم گوندە نێزیکەی ٨٠٠٠ نفووسی هەیە. دەیانگوت، نێزیکەی ١٠٠٠ بنەماڵەن. تەنیا ٤٥٠ ماڵ ئاو و کارەبایان هەیە. ژوورەکان تەواوی گەورە و کەوانین و دەرگە و دەروازەی گەورە و دووتاییان هەیە. دیوارەکان پان و پتەون. زۆرینەی تاق و سەربانەکانیان گومبەزییە. تەواوی بە قوڕەسواغە. لە دوو لای ژوورەکە بێشکە پان دەکەنەوە و دەیشێلن، دواتر قوڕەسواغی دەکەن. حەوشە و حەساری گەورەیە و لەژێر حەساری هەر ماڵێك بە پانتایی دە مەتر بەتاڵە و ئەو ژێرزەمینانە بە «شەوەدوون» ناودێرن، بە پێپلیکان بۆی دەچن و هاوینان فێنك و لە زستاندا گەرمە. بۆ ئەم ژێرزەمینە ڕۆچنەیەك هەیە و پێی دەڵێن، «سی سەرا»، زەوی گەتووەند لمییە. حەسارەکانیش چاڵاوێکی تێدایە و لە شازدە مەتری دەگا بە ئاو. چەند ماڵێکی دوو قاتی تێدایە.

گەتووەند زۆر کەس پێی دەڵێن، «گوردوەند»، ڕەنگە لەگەڵ قەڵای ڕۆستەم نێزیکایەتییان هەبێ.

گەتوونەد حاجی زۆرە و بۆ ئەوە دەبێ پێی بڵێی حاجیاوا. هەر ئەوەندەی خەرجی ماڵ و منداڵ و خەرجی سەفەر دابین بکرێت، دەچن بۆ حەج. نوێژ و ڕۆژوو و خومس و زەکات گرینگیی پێ دەدرێ و خۆیان لە قەرز پاك دەکەنەوە. هەر وەکو زۆرینەی لادێکان لە گەڕەکەکاندا کێشە و دڵمەندی هەیە. کێڵگەی گەتووەند شێوەردە و دووگاسنەیە، ٩٠ هەزار مەنە و هەر جارەی ٤٥ هەزار مەنە و هەر مەنێکی گەتووەندی ٧/٥ کیلۆیە. مەنی تۆوی لە نێزیکی ئاوایی ٣٠٠ مەتری چوار گۆشە و لە دوورتر ٦٠٠ مەتری چوار گۆشە هەژمار دەکرێت. (بەو مەرجەی ئامانج کڕین و فرۆشتن بێت) زەوییەکانی نێزیك ئاوایی مەنی ١٥٠٠ تا ٢٠٠٠ تمەن دەکڕن و دەفرۆشن، بەڵام زەوی دوورە دێ، مەنی ١٠٠ تا ٥٠ تمەن. زۆرتر گەنم دادەچێنن نەك جۆ. واتە ئەو کەسەی ١٠٠٠ مەن زەوی هەیە، ٩٠٠ مەن گەنم دادەچێنێت، سەد مەنی دەکاتە جۆ. ساڵەکەی تەڕەساڵ بێت یەك بە بیست دەیگرێ. لە ساڵی ڕابردوودا تۆوێك ٨ تۆوی داوە. زانیمان مەنێك لە کوێستان ٦ کیلۆیە. لە گەرمێن ٧ کیلۆ، لە گەتووەند ٧/٥، لە دزفول ٨ کیلۆ، لە خەلفاوا ٩٨ کیلۆ، لە هووەیزە (لەنێو عارەبی خوزستان) ٤٩ کیلۆ، هەندێك لە گەتوەندنکان مەڕدارن، نێزیکەی ٢٠٠ ماڵ هەر نییانە. نێزیکەی ٨٠٠٠ سەر مەڕ، ٢٠٠٠ ڕەشەوڵاخ لە گەتوەند هەیە. شەشە ماڵێك ١٢ تا ١٥ سەر مانگایان هەیە و زۆر ماڵێش کەمتر لە دە سەر. لە تەواوی گەتوەنددا ڕەنگە ٣٠٠ سەر یان کەمتر بزنیان هەبێت. تەواوی زەوییەکانی گەتوەند، هەر وەك دەیانگوت، لە باب و باپیرانەوە خوردە مالیکی بووە و مالیك یان دەسەڵاتداری مەزنیان نەبووە. خانەکانی بەختیاری لە گەتوەندەکان هەقە جووتیان وەرگرتووە. ئیتر لە باتی ماڵیات وەرگرتنی ئاژەڵ، جووتانەیان وەرگرتووە. هەر کەسێك ژنی دەهێنا، ساڵانە مەبلەغێکیان بە ناوی «مێردە» لێ دەسەند. هەڵبەت هەقە جووتیان زۆرتر لە ماڵمیر و ئەندیکا وەردەگرت، کاروباری کشتوکاڵ لەوێ باشتر بوو. خانەکانیش خاوەنی موڵك بوون و موڵکانەیان لە وەرزێڕ وەردەگەرت. ئەو کەسە دەسەڵاتی بە دەستەوە دەگرت «منال موڵك»ی زەوییەکانی چوخەخۆر، ئورگون چۆخەخۆر، ماڵ ئەمیر، ئیزە، ئەندیکای بۆ خەرجی

سەفەر وەردەگرت، بەڵام ئەو زەویانەی لە ئیختیاری خانەکاندا بوون، سەنەد و قەباڵە بە ناوی خۆیان بوو، حاسڵەکەیان دەکردە ٤ «کۆ»، کۆیەك بەشی مالیك و سێ کۆ دەمایەوە بۆ وەرزێڕ. زەوی نەبێ هەمموو شت لە عۆدەی وەرزێڕ بوو. هەڵبەت لە زەوی بەراو حاسڵ دەبوو بە سێ کۆ، کۆیەك مالیك دەیبرد و دوو کۆ وەرزێڕ. ئێلخانی و حاجی ئێلخانی بە دست خەتی خۆیان زیندە ماڵی عەشایرییان لە ماڵیات معاف کردبوو. واتە مێگەلی جووتبەندەکاتن لە ئێلدا دەهاتن و دەچوون و تێکەڵ بە مێگەلی خەڵکی دەبوون. پارەی ئەوانەیان وەرنەدەگرت و وەك خۆیان دەیانگوت، شاخیان نەدەکردن. لە وەختی شاخکردندا، ئاژەڵداری بەختیاری دەیگوت، بۆ نموونە لەو سەد سەرە، ٥٠ سەر تایبەت بە فلاّن گەتوەندی بێ، ئەو ٥٠ سەرە حیسێب ناکەن.

باسێکی دیکەم لە گەتوەند بیست، بەڵام ئەو عەلاوەی بەسەر گەتوەندانەوە نییە، بە دەستووری خانەکان دەبوو پردی پەڕینەوەی سەر چۆمەکان مۆریگەل سازی بکەن. دەبوو بە کاریتەی دارستانەکەی بازفت مۆڕییەکان پرد دروست بکەن. وەختێ پردەکە تەواو دەبوو، خانەکان ئەو پردەیان بە مۆڕییەکان بە کرێ دەدا. ئەوانیش پارەیان لەو تایەفانە دەسەند کە بەسەر ئەو پردەدا ڕادەبردن. لە سەرەتادا بۆ چوار مەڕ قڕانێکیان وەردەگرت. دواتر نرخەکەیان گران کرد و بۆ پەڕینەوەی دوو مەڕ قڕانێکیان دەسەند. ئەمجار کردیانە مەڕی قڕانێك و ماینێك یەك قڕان، هەڵبەت ئەم نرخە بۆ سەرۆکی تایەفەکان جیاوازی هەبوو. بەشی مالیکیان دەدا. زۆر جاریش سەرۆك هۆزان دەستخەتیان لە خانەکانەوە دەهێنا و خان خەرجی پەڕینەوەی قبووڵ دەکرد. سەبارەت بە پلەبەندیی ماڵیات دەیانگوت: لە ئیزە و شیمبار برنجکاری هەبوو، خانەکان ماڵیاتیان بە شێوەی «بور» سەندووە، ئەمەش هەر وەك «کۆ»یەکە وایە. لە ئەندیکا و ئیزە هەقە جووتیان وەرگرتووە. لە بەشی کوێستانێ کۆیان وەرگرتووە. لە للر و کتك « ترشیان» وەرگرتووە. لە گەتوەند و شووشتەر و دزفول «مێردەیان» سەندووە. لە ئاژەڵداری ئێل «شاخ» یان وەرگرتووە.

نەمزانی چۆن بوو گەتوەندەکان پێیان وابوو، ئێمە لەسەر کەونارناسی شارەزاییمان هەیە. باسی خشتێکیان کرد ساڵێك لەوەپێش لە گەتوەند دۆزراوەتەوە. لە بەشێکی خشتەکە بە خەتی بزماری لەسەر دەمی پاشاکانی ئیلامیدا نووسراوە و دەگەڕێتەوە بۆ ٣٢٢٨ ساڵ لەوپێش و تا ئێستە هەر ماوە و نووسراوەکەش کەونارناسان ئاوایان

لێکداوەتەوە: «من ئەنشکال کوڕی هوم بانونی پادشانیشانی شووش و چیای بەختیاری، من کلێسەیەکم سازکرد بۆ هاتوچوونی کوبك بۆ ئەوەی ئەم ئیلاهەیە پارێزگاری لە من بکات. ئەم ئیلاهەیە لەو ژینگەیەدا یارمەتیدەری منە»، ئەمەش وەرگێڕانی ئەو خشتەیە. منیش نووسیم.

شەوێ لە گەتوەند خەوتین، بەیانی بچین بۆ مەسجد سلێمان

## ١١ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

گەتوەندەکان نەیانهێشت بڕۆین و مووساخان زۆری پێخۆش بوو، نانی نیوەڕۆمان لە گەتوەند خوارد. هیچی باشمان بۆ نووسین دەست نەکەوت و ئەو ڕۆژە زۆر بێ تاقەت بووین. دێیەکە بۆ گەڕان نەدەبوو، ئێمەش حەزمان دەکرد دووبەدوو بین. بەڵان بێکار زۆر و لێمان ببوون بە قیلی کەوای سپی. هەر چۆنێك بوو، دوانیوەڕۆ وەڕێ کەوتین و گەیشتینە مەسجد سلێمان و ئەو ڕۆژەمان بەفیڕۆ چوو.

## ١٢ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

ئەمڕۆ لە مەسجد سلێمان نین ، کەسێك دەیگوت، عارەبەکانی تایەفەی بابادی دوو دەستەن. عارەبی کەنگرپەز، عارەبی عەلیبەگ. تەواوی ئەوانە عەربی کەمەرین. واتە عارەبی کێوی. زۆرتریان عارەبی کەنگرپەزن. وەك دەڵێن، ناویان لە مێژوودا بە کەنعانی هاتووە و مەسجد سلێمان زۆر قەرەباڵغە. لە دوای ئەو کارەساتەوە پیکابەکان مووسافیر هەڵناگرن. ئەوانەی هاتوونەتە مەسجد سلێمان تەنیا بۆ کارو باری خۆیان هاتوون. ناتوانن بگەڕێنەوە و شار پڕە لە بەختیاریی تووڕە. ئەمڕۆ لە کەسێك پرسیارمان کرد، بابادی عەکاشە ڕەوەندن یان لە شوێنێك نیشتەجێن؟ گوتی: لە جێیەك دادەنیشن، لە شارەدێ، واتە لە «خان ئمیرزا»ی سێ شارەدێ، سێ شارە دێ برێتین: «جانکی ، فەلارد، خان میرزا» هەر هەموویان حەوت لەنگن. ئەمڕۆکە ئەوەی دەیبینی تووڕەیە. ئێمەش زۆر بێ تاقەتین. لەنێو عەشیرەتیشدا باس باسی ماشێن و شەڕ و هەڵای دزیکردنە. هەڵبەت بەردەوام ئێمە خەریکی ڕێکخستنی فیش و تەکنیکی کارەکانمانین، تەواوی ئەو هونەرانەی عەشیرەتی بەختیاریی دەگرێتەوە ئێمە لە دەفتەری تایبەتدا دەینووسینەوە.

نووسین لەسەر ڕووداوی ئەو ڕۆژە کەمەکێك دژوارە. بەختیارییەك دەیگوت: سەردانێکی دیناران بکەن. ئەوان تایەفەیەکی سەربەخۆی بەرەی حەوت لەنگن. گوتمان بە چاوان!

## ١٣ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

جارێ هەر لە مەسجد سلێمانین. ئەمڕۆکە پیرەمێردێك چەند شتی بۆ باس کردین، پێم حەیف بوو نەینووسمەوە. لەنێو هۆزی بەختیاریدا وا باو بووە، ئەگەر ژنی مێرددار پیاوی وەسەر ببپەرێت و خەڵك پێ زانیبێت، لەنێو دەستەکانی ئێلدا شەڕ و ناخۆشی ڕووی داوە. کار دەگەیشتە جێیەك دەبوو ئەو پیاوە ژنەی لێ مارە بکرێت، کچی خۆی یان خوشکی خۆی بە بێ شیربایی لە مێردی ژنە مارە بکات و لە پشت قەباڵەکەی بنوسرێت و مەبلەغێك پووڵێشی بداتێ لە باتی ئەوەی ئابڕووی ئەو ماڵەی بردووە. ئەگەر ژنی داوێنپیسیان دەگرت، سەریان دەتاشی و شیاکەیان تێ هەڵدەسوو، بەنێو عەشیرەتەکەدا دەیانگێڕا. خانەکان بۆ ئەتککردنی دزان، قامك و لووت و گوێیان دەقرتاندن. ئەگەر دزە هەر تەمبێ نەبایە هەردوو دەستیان لە ڕۆنی قرچدا دەسووتاند. وەختێ خۆشەویستێك دەمرد، ژنان پرچی خۆیان دەبڕی و کلکی ئەسپیان کورت دەکردەوە و زۆر شتی دیکەی باس کرد.

سا، ئەمڕۆکە محەمەدی پەرویزی، جەعفەرقوولی و مووسا جەهانگیری، سێ سەرۆك هۆزی بە ناوبانگی تایەفەی بابادی لە جێیەك یەکانگیر بوون و چوون بۆ لای فەرماندەی گوروهان، تاکو نێوان ناخۆشی لەسەر ئەو شوانە کوژراوە بە لایەکدا بخەن. قەول و قەرارمان دانا بەیانی بچین بۆ پرسە و کەمێکیش دڵخۆشییان بدەینەوە. هەر دوو بنەماڵەی بکوژ و کوژراو لە یەك جێ کۆ بکەینەوە و خوێنەکە داکوژێنین. مووسا جەهانگیری بە هۆی ئەوەی خزمی بنەماڵەی پیاوکوژەکەیە، دەترسێ توخنیان بکەوێت. هەر بۆیە لە مەسجد سلێمان بەجێ ما. لەگەڵ دیگار و جەعفەرقوولی ڕۆستەمی و محەمەد پەرویزی، چووین بۆ لالی. محەمەد پەرویزی زۆر سەیر لاسایی خانەکان دەکاتەوە. ئێمە حەزمان بەم کارەی نەدەکرد. هەر کەسێك وەژوور دەکەوت خێرا دەستی بۆ درێژ دەکرد، تاکو ماچی بکەن. تەنانەت لەگەڵ ئێمەش لاسای ئاغا و دەرەبەگانی دەکردەوە، هەردەم وەپێش دەکەوت و گوێی لەوە نەبوو ئێمە میوانین. دەمژمێر ٥ تاریکی کرد و ٦/٥ گەیشتینە لالی و تەواوی قسەکانمان لەسەر خوێنبەستەکە بڕایەوە.

## ١٤ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

ئەمرۆ قەول وایە بکەوینە ڕێ، هەروەك جاران خواردنی بەیانی کەشکەك بوو بە ڕۆنی گامێشەوە. دەیانگوت، ڕۆنی مانگا لە هەموو ڕۆنێك ئەهوەنترە. ڕۆنی گامێش زۆر بەهێزە و ڕۆنی مەڕ مامناوەندییە. دوای ماوەیەك مەحتەلبوون، لە بەردەرگەی ژاندارمەری چووین بۆ ئەو شوێنەی پرسەی لێ داندرابوو. واتە شوێنی میرکائیدەکان. ئەو ڕێگەیەی دەچێتەوە سەر چالاوەکان، بە بەردەرگەی ڕەشماڵەکاندا تێ دەپەڕێت. سێ ڕەشماڵی گەورەیان لە تەنیشت یەکدی هەڵدابوو. بەر و ماڵێکی تا بڵێی پاك و خاوێن، خێوەتەکان پڕ لە فەرش، چادرێکی بچووك تایبەت بە چایی بوو. دەوری هۆدەیەکیان بە بەرد هەڵچنیبوو، بە ڕەشماڵ دایانپۆشیبوو، ئەم هۆدەیە لە بەردی نەتاشراو بە ڕووبەری ٢ مەتر لە ٢ مەتر. پێی دەڵێن، «مافییە یان تازەگە». دوای ئەوەی پرسە و سەرەخۆشی تەواو بوو، هۆدەی پڕلە بەرد بۆ هەمیشە وەك خۆی دەمێنێتەوە و پێی دەڵێن، مافییەی فلان کەس. دوو کەس لە تووشماڵەکان دەچنە سەر مافییەکە و یەکێ کەڕەنا و ئەوی دی دەهۆڵی دەکوتێ، دەنگدانەوەیەکی پڕ لە ماتەم و تەم و مژاوی. پێی دەڵێن، « چەمەرچۆپی» دوو ئافرەت بە جلوبەرگی ڕەشەوە لە نێوان تووشماڵەکاندا ڕادەوەستن. وەختێ دەنگی تووشمالان نزم دەبووەوە، ئەو دوو ڕەشپۆشە شیوەنیان دەگێڕا. بە شووڵ کۆتەڵیان سازکردبوو، جلوبەرگی مردووەکەیان کردبوو بە بەریدا. تەنانەت ڕیزێك فیشەکیان لە پشتێنەی بەستبوو. کەسێك بە گوێیدا چپاندم، ئەگەر مردووەکە خەنجەر و شیر و تفەنگ و دووربینی هەبێ، ئەوانەشی لە پاڵ دادەنێن. بەم کۆتەڵەیان دەگوت، تەلەسم. سەر و چاوی بە پارچەی ڕەش داپۆشرابوو. تەلەسمەکە بە بەر مافییەوە هەڵدەسپێرن. هەڵبەت ئەو مافییە و تەلەسمە بۆ هەموو کەس دروست ناکەن. ئەمە تایبەتە بە کوڕەجەحێلان کە بە هۆکارێکەوە دەکوژرێن یان ئەو کەسانەی ناودارن. بەختیارییەك هەوساری ماینێك بە دەستەوە دەسماڵێکی ڕەشی لە ملی بەستبوو، بە دەوری مافییەدا دەسووڕا. مووی کلکی ماینەکە قوڵە کرابووەوە. تەنیا ٤٠ سانتی مەتری لی مابووەوە. بەختیارییەکی دیکەش وە دوای ماینەکە کەوتبوو، سنگی دەکوتا.

هەر ئەوەندەی ئێمە دابەزین تێکڕا هەستانە سەر پێ، بەتایبەت کە دوو کەلانتەرمان لەگەڵدا بوو. خێرا خێرا بەخێرهاتنیان دەکردین. لێرە و لەوێ چەند کەسێك مۆڕەیان دەکرد و قسەیان بە جەعفەرقوولی دەگوت، دەوروبەرییەکان بێدەنگیان دەکردن. کوڕە

جەحێڵەیەك لەسەر مافییەکە خەریکی شیعرخوێندنەوە بوو، هەرچی بە دەمیدا هات بە شیعر ئاراستەی جەعفەرقوولی کرد، بەڵام جەعفەرقوولی خۆی کەڕ کرد و هەمیەتی وێ نەدا. ئەو کوڕە جەحێڵە پێشتر شوانی جەعفەرقوولی بوو. ساڵێك بوو بەجێی هێشتبوو.

هۆی ئەم هەرا و ناخۆشییە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، جەعفەرقوولی لەگەڵ مووسای جەهانگیری خزمن، (وەك ئاشکرایە خوشکی جەعفەرقوولی هاوژینی مووسا جەهانگیرییە، ڕۆژێك مووسا جەهانگیری وتی، کوڕەکەم چووەتە ماڵی خاڵی بۆ کۆکردنەوەی «ئوزی») کچی مووسا جەهانگیری پێشتر مێردی بە تایەفەی پیاوکوژەکە کردبوو. هەر بۆیە مووسا جەهانگیری لەگەڵ ئەو بنەماڵەیە بوونەتە خزم و جەعفەرقوولی خزمی نێزیکی مووسا جەهانگیرییە. ئەم هەرایەش نیزام و شەڕی تایەفەیی لێ دەکەوێتەوە. سا بە بۆنەی ئەم قەتڵەوە ئەم دوو تایەفەیە تا بۆیان بکرێت دزی لە یەکدی دەکەن و زەرەد بە یەکتری دەگەیەنن. وا دەردەکەوێ چەند سەرێك مەڕی مووسا جەهانگیری لە کەن زاواکەی دەدزن. مووسا جەهانگیری (هەروەك جەعفەرقوولی و محەمەد پەرویزی باوەڕیان وا بوو) بە جێی ئەوەی سەبرێك بگرێ و دەنگ نەکا تاکو ئاوری تووڕەیی دەنیشێتەوە، ئەوسا داوای ماڵەکەی بکاتەوە، هەر ئێستە چووە شکایەتی کردووە و تایەفەی کوژراوەکەی بە دزیکردن تاوانبار کردووە. ئەوەندەی دیکە میرکائیدانی تووڕە کردووە. ئەوانیش حەز ناکەن ببینن. سوێندیان خواردووە لەنێو عەشیرەتدا ببینن دەیکوژن و حەیاتی لێ دەبڕن. جگە لەو دانبەخۆداگرتنە بە ڕەییس پاسگەیان گوتووە، ئەگەر مووسا لەو دەوروبەرە ببینن بە سەرییەوە ناچن و دەیکوژن. جا بۆیە مووسا جەهانگیری لە جەعفەرقوولی کرد، بەڵام جەعفەرقوولی خۆی کەڕ کرد و هەمیەتی وێ نەدا. ئەو کوڕە جەحێڵە پێشتر شوانی جەعفەرقوولی بوو. ساڵێك بوو بەجێی هێشتبوو. مەسجد سلێمان بەجێ ما و نەیوێرا توخنی دەوروبەری لالی بکەوێ.

لێرە داب وایە هەرکەسێك هاتە ژووری بۆ سەرەخۆشیکردن، ئەو کەسەی بە تەمەنترە فاتیحا دەخوێنێ و خەڵکەکەش بە دوای ئەودا. وەختێ ئێمەش وەژوور کەوتین، بەڕێز پەرویزی بە هۆی ئەوەی تەمەنی زۆرتر بوو، بە دەنگی بەرز گوتی، «فاتیحا» و ئێمەش بە دوای ئەودا. دواتر خێرا چاییان هێنا. بۆ نانی نیوەڕۆ هەرچەندە ٧٠ کەس دانیشتبوون، خواردنێکی باشیان دانا، دوای نانخواردن بە دەوری خوانەکەوە دیسان سوورەتی فاتیحا خوێندرایەوە. هەر بۆیە لە شایی و شین

خەڵکەکە بە پەلە نان دەخۆن. لەبەرئەوەی وەختێ لە شاییدا دوای نانخواردن چەپڵە لێدرا، لە پرسەدا فاتیحا خوێندرا، کەس بۆی نییە دەست بکێشێت و خەریکی خواردن بێت. ماتەمباران جارێ لە هزری ناندانان و خزمەتکردندا بوون. قسە لەوە دەکرا بە هۆی ئەوەی کوژراوەکە جەحێڵ بووە و بە دەستی چەند کەس کوژراوە، تایەفەی حاجیوەرە کە تایەفەی بکوژەکەن، دەبێ بە تایەفەی میرکائد و کە کوژراوەکە لە ئەوانە بیست هەزار تمەن و کچێك بدەن، بەڵام ئەگەر کوشتنەکە بە ئەنقەست نەبووبێ بە کچێك و بیست هەزار تمەن خوێنەکە تەواو دەبێ. دەیانگوت، حاجیوەرەکان تا ئێستە شەش حەوت کەسیان کوشتووە و خوێنەکەیان هەر وا چووە، بەڵام ڕێگە نادەن خوێنی ئەم کوڕە بە فیڕۆ بچێت. حاجیوەر و میرکائد دوو تیرەن لە تایەفەی بابادی. ئەگەر شەڕ دەست پێ بکات، تیرەکانی ئەحمەد سمالی، جەلیل، تەقی عەبدولاّیی و ئەوانە خینەچووی حاجیوەرن، پشتی ئەو دەگرن. ئارپەنایی خینەچووی میرکائدن لایەنی ئەو دەگرن.

کوڕەکە گەرم بوو، دەکرا شتێکی بۆ نووسین تێدا بێت. کەسێك وتی، خینەچوویی لە کۆنەوە دەگەڕێتەوە بۆ خزمایەتی و پشتی یەکبوون. بۆ نموونە لە بابادیدا، سەرەتا دوو تیرە هەبوون، بە ناوەکانی عالی وەرباب، کە وەچەکانی دەبنە حاجیوەر، ئەحمەد سمالی، تەقی عەبدولاّیی، جەلیل و مندالّ بوون و پەلێکی دیکەی ئەوان ئارپەنایی و میرکائد بوون. ئێستەش ئەوانە خینەچووی یەکدین. لە کۆتایی پرسەکەدا خزمێکی کوژراوەکە داوای لە محەمەد پەرویزی و جەعفەرقوولی ڕۆستەمی کرد، دەستوور بدەن کۆتایی بەم ڕێوڕەسمە بێنن، ئەوا ١٤ ڕۆژە ئەم پرسەیە تەواو نەبووە و خاوەن مردوو نانبڕاو بووە. جەعفەرقوولی دەستووری دا تووشماڵ فوو بکات بە زۆڕنا دا و لە دەهۆڵی بسرەوێنێ و ئەم بەرنامەیە کۆتایی پێ بێنن. لە هەموو لایەك دەنگی جەعفەرقوولی دەهاتە گوێ. «خێوەتەکان کۆ بکەنەوە» بە پڕتاو تووشماڵ خۆیان هەڵدایە سەر «مافییە» و زرمەی دەهۆڵ بەرز بووەوە و ئەوەی لە چادرەکاندا بوون هاتنە دەرێ و چوون بۆ لای تەلەسمەکە. هەر وەك تەلەسم مردووەکە بێت شیوەن و گریان دەستی پێ کرد و بوو بە وایلۆکچڕین. چەند کەسێك لە هۆش خۆیان چوون و دەستەیەك کۆتەڵیان لەگەڵ خۆیان برد، بەڵام دەستبەردار نەدەبوون. کوتەڵ گەییشتە بەردەمی ژنان و بوو بە شەپۆڕی گریان و خۆڕنین. لەولاوە مافییە ڕووت و قووت کرایەوە. قەول وابوو محەمەد پەرویزی لەوێ بەجێ بمێنێت. پێشتر پێشبینی کردبوو، شمەکی خۆی هێنابوو. بڕیار بوو لەوێ بمێنێتەوە و

دڵداری ئەو بنەماڵەیە بداتەوە، سەبارەت بە خوێنبەستەکە بدوێ. محەمەد پەرویزی دەبوو بمێنێتەوە و ئێمەش بڕۆین. لەبەرئەوەی کەیخودای ئێمە جەعفەرقوولی بوو، فاتیحای دادا و ئێمەش بە دوای ئەودا.

هەستاین و وەڕێ کەوتین بۆ لای بنەی جەعفەرقوولی. لە ماشێنەکەدا باسی قسە کرا و داوام لە جەعفەرقوولی کرد سەبارەت بە باب و باپیری فەرامەرزخان و جەهانگیرخان ڕوونکردنەوەیەکمان بداتێ، گوتی: سەرەتا تەواوی گەتوەندی هی گەتوەند نەبوو، بگرە ناوی گەتوەند بوو. دواتر بە پێی عالی ئور (کە دەکاتە حاجیوەرەکان) و ئەمجار عەبدولاّ (تیرەکانی تەقی عەبدولاّیی لەوانن) تەقی محەمەد خان و، دواتر هەردوو کوڕەکەی فەرامەرزخان و جەهانگیرخان. لەنێو قسەکاندا باسی چۆنییەتی هەڵدانی چادرەکانمان کرد، ئاخۆ هەمیشە بە یەك شێوە ڕەشماڵ هەڵدەدەن؟ یان باری هەڵدانەکە دەگۆڕن. گوتی، «نەریتی عەشیرەیی ئاوا بووە لە کۆنەوە لە ئەهواز بۆ یەکەم جار وەختێ ڕەشماڵ هەڵدەدەن، ڕووی لە هەر لایەك بووە لە ساڵەکانی دواتریشدا بۆی نەبووە ڕوویی چادرەکەی لەوان وەرگێڕێت، بەلاّم لە کوێستان و گەرمێنی خۆیان هەر وختێ بار دەخەن، دەتوانن جێی ڕەشماڵەکان بگۆڕن، تەنانەت دەرگەکەی ڕووی لە لایەکی دیکە بێت». پرسیارێك لە مێشکمدا بوو، هەرچۆنیك بوو درکاندم، ئایا محەمەد پەرویزی بۆ ڕەزای خودا و بێ وەیی هۆزەکەی ئەم کارە دەکات یان لە بەرانبەردا شتێکی دەست دەکەوێ؟ پێکەنی و گوتی: قشقەڕە بە خۆڕایی پشتی گامێش ناخورێنێ. ئەو کەلاّنتەرانە دایمە حەز بەو شەڕ و هەرایە دەکەن بۆ ئەوەی کارێك بکەن و شتێك وەربگرن.

## ١٥ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

هەواری ڕاستەقینەی بابادییەکان لە گەرمێن بوو، شوێنێکە بە ناوی «سیکوەند». ئێمە بۆ ئەوەی ژیانی عەشیرەیی لە گەرمێن ببینین، وامان دەزانی لە کەپری زستانیدان، دەبێ بچین بۆ سیکوەند. ئەمڕۆمان لە لالی بردەسەر. تەواو بێکار بووین. دیگار دەیگوت: لەنێو عەشیرەکەدا وا هەیە کەسێك منداڵێك بە منداڵی خۆی قبووڵ بکات، ئەگەر شتی وا هەبێ باری خزمایەتی چۆنە؟ جەعفەرقوولی گوتی: «ئەگەر دوو برا یەکیان منداڵی زۆر بێ و ئەوی دیکە لە داوێنی خۆی بێبەش بێت، یەکێ لە کوڕەکانی براکەی بە کوڕی خۆی قبووڵ دەکات،

ئەو منداڵە لە بەشەماڵی بابی خۆی بێ بەش دەکرێت و لە مامی کە لە جێی بابییەتی بەشەماڵی پێ دەبڕێت. تەنیا بەم شێوەیە هەڵگرتنەوەی منداڵمان دیوە». جەعفەرقوولی دەیگوت: «بیستوومانە ئەو سەیدانەی لە هۆزەکەدان وەك سەرکەوتووی عارەب بەجێ ماون، ماوەیەك لە ئێران دەسەڵاتیان بە دەستەوە بووە و مەوقووفاتیان وەخڕ کردووە. تۆمارێکی وا هەیە لە ئیزە. سەرلەبەری ئەو مەوقووفات و خەرجانە مەعلوومە. تۆرەمەی ئەوان کەوا خزمەتیان بە ئیمام ڕەزا کردووە بە شێخ ناسراون. ئەم ئەسحاب و یارانەی ئیمام پێیان دەڵێن سادات». لەسەر عارەبی کەمەری پێشتر باسم کردووە.

بۆم ڕوون بووەوە ١٥٠ساڵ لەوە پێش لە دەورەی جەعفەرقوولی دورکی و جەعفەرقوولی خانی بێهداروەندا ئەوان بەسەر سێ بەشدا جیا کرانەوە و هەر بەم ناوەشەوە ناسران. واتە عارەبی بێهداروەند، عارەبی بابادی و عارەبی دورکی. دەڵێن، ئەوانە بەختیارین، بەڵام ئەگەر وا بووایە دابەش نەدەکران. ئەو عارەبە تەنیا لە نێوان لالی و مەسجد سلێمان، گدارلەندەر و دۆڵاو و چەند ماڵێکیش لە دەوروبەری ئیزە و «قەڵای تول» دەژین. ئەمڕۆ بیستمان مێگەلی بابادی وەختێ دەچنە شەعبییە، بە خانەکانی بەختیاری، ئەوان لەوێ کاروباری کشتوکاڵیان گەشە پێداوە، بۆ هەر ڕانێك بە پێی هەژمار ٥٠٠ تا ١٤٠٠ تمەن پارە وەردەگرن.

ئەمڕۆکەمان باش نەبوو.

## ١٦ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

بە فێنکی بەیانی لەگەڵ خودادادگەلالی «جەلال» بەرەو سیکوەند کەوتینە ڕێ. مەودای ڕێگە تا سیکوەند زۆریش دوور نەبوو. ڕێگەکە سەرلەبەر گەچە و سوێراوێکیش بە تەنیشت سیکوەندا تێ دەپەڕێت، زۆر سوێرە و خوێیەکەی بەسەر زەوییەکەوە ڕەق هەڵاتووە. سەرچاوەی لە نێزیك سیکوەندە و دەڕژێتە سوێراوەکەوە. بەرلە هەر شتێك چاومان کەوت بە چادرێکی سپی گومبەزی، ئەوە شوێنی فێرگەی منداڵانی عەشیرەتەکە بوو. کەپرەکانیش سەرنجیان ڕاکێشاین و وێنەمان لێ هەڵگرتن. ئەم کەپر و کەوێڵانە بۆ زستانە و سەربانەکەی بە شۆرابەیە و ئاوی باران دانادات. دیواریان بە نێودا کێشاون. بەشی لای ژووروی کەپرەکە کولێنە و کەلوپەلی تێدا دادەنێن. کەچی لە خێوەتەکاندا

ئەم شتانە لەسەر بەرد هەڵدەچنن، لێرە لەسەر هەرزاڵ. بەرزی دیوارەکانیش قوڕ بێت یان بەرد تەنیا مەترێکە. سەربانی ئەم کەپرانە تەواوی بە قامیش ساز بووە و لە بنەوە ئەستوون و کۆڵەکەیان وەبەر داوە. چواردەوری دیوارەکەش بە قامیش داپۆشراوە و خۆیان پێی دەڵێن «ئاغایی».

سەردانی چەند جێیەکمان کرد و مەشەدی ئەمیرقوولیمان دیت. ئێستە دووکاندارە و لە نێزیك ئاشەکەیە. ئێستە ئاشێکی ئاور لە سیکوەند هەیە و چوار دانگی هی جەعفەرقوولییە و دانگێك هی عەلی برای جەعفەرقوولی و دانگەکەی دیکەی بەشی کەسێکی دیکەیە. ئەم نێزیکانە تەنیا هەر ئەو ئاشەی لێیە و زۆریش باراشی بۆ دێت و دوای هاڕینی گەنم جەواڵەئارد لە یەکسمان هەڵدەبەستن و دەیبەنەوە.

بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ میوانی خودادادا بووین و فرووجاوێکی بۆ سازکردین و هەر لەو کەپرەدا خواردمان. خەریکی ژەندنی مەشکە بوو، ڕۆنەکەرە کیلۆی ١٧ تمەنە، ڕۆنی مانگای دەفرۆشت. خوداداد خاوەنی دوو کەپر بوو، یەکیان تەپاڵە و بەرانەکانی تێ کردبوو، ئەویکەشیان ماڵی خۆی بوو. دەوری کەپرەکانیشی بە قامیش حەسار کردبوو. ئەم کەپرانە خۆیان پێی دەڵێن «لەوکێ»، ژینگەی هاوین و زستانی ئەوانە. لە بەشی بامدیگەل قامیش نییە ئەوانیش کەپر ساز ناکەن. ماوەیەك دوای نانی نێوەڕۆ دانیشتین و باسی بەرخوێن و خوێنبەستمان کرد و، دواتر چووین بۆ لای چادرەکان. شەوێ بووین بە میوانی بی بی شەوکەت، خێزانەکەی دیکەی جەعفەرقوولی، لە ڕەشماڵی خۆی میوانداری لێ کردین. هەروەك هەمیشە سەرقاڵی ڕستن و چنین بوو، ئەمساڵ کەرکیت و گوریسهۆنینەوەی لەگەڵ ساڵی ڕابردوو جیاوازی هەبوو. قنچکەیەکی بە دەسکەکەوە بوو، ڕەنگە ئاوا خۆشدەست بێت، گوریسێکی نەخشینی دەهۆنییەوە، تەختەکەی ڕەش بوو. گوڵی سێ سووچی تێدا دادەنا. بە ڕەنگی شەنجەرفی. «وەرگاوە» شوێنی ڕەشماڵەکەیە و زۆر خۆش و دڵگیر بوو، بە جەعفەرقوولیم گوت، بەڕاستی ڕەشماڵێکی جوان و جێیەکی با سەفات هەڵبژاردووە. گوتی: «هەروایە، ئەم هەوارگەیە، هی خۆمان بووە و سی ساڵ تەواو ئێرە هەوارگەی ئێمە بوو.» پێکەنیم و گوتم: « ئێستە بی بی قەرەباڵغی کردووە؟» گوتی: «نا! ئێرە هەواری خۆیەتی، کۆنەهەوار هەمیشە بە ژنی یەکەم دەبرڕێت. دووەم ژن دەبێ هەوارگەی دیکە بۆ خۆی دروست بکات.» کزەی زریان ئازاری دەدایین، بۆ لای چادرەکە داگەڕیان و خۆمان خزاندە ماشێنەکەوە سەر خەوێك بشکێنین.

## ١٧ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

شەوێکی سارد و بێ خەومان بەڕێ کرد. بەیانی زوو هەستاین، نانمان خوارد و چووین بۆ لالی. لە نێوڕێدا جەعفەرقوولی چەند کەسێکی دیت باریان خستبوو، لێیان تووڕە بوو، ملی نا لە گوڕە و هەرا. دیار بوو ئەوە جێی ئەوان نییە و هاتوونەتە لەوەڕگەی جەعفەرقوولییەوە. ئەو ساڵ هیچ لەوەڕ خۆش نەبوو، لە نێوڕێدا تووشی پیرەمێردێك هاتین و سوارمان کرد. جەعفەرقوولی گوتی، تەمەنی سەد ساڵ زیاترە. لەش ساخ و توندوتۆڵە. لەنێو ماشێنەکەدا چەند گۆرانی لووڕی بۆ گوتین. گەیشتینە لالی. بی بی ئێران لە ماڵ نەبوو، کچۆڵەکەی نەخۆش بوو. بردبوویان بۆ مەسجد سلێمان. جەعفەرقوولی گوتی، بچینە مەسجد سلێمان، وەڕێ کەوتین، لە عەنبەل نانی نیوەڕۆمان خوارد. لەکن عارەبەکانەوە، کەڵ و گامێش و، ڕانەمەڕ لە شیمبارەوە دەگەڕانەوە بۆ لالی. گەیشتینە مەسجد سلێمان و خۆمان گەیاندە میوانخانە و گەرماو و کۆتکرین، هەوا زۆر ساردە. شێومان کرد و دەستمان کرد بە نووسینەوەی یادداشتەکان. ئەورۆ لە کەسێکم بیست، لە زۆر جێ مافییە، «مافیەگە» ی پێ دە لێن، ئەو خەڵکە و ئەو ڕەشماڵانەی لە کوێستانێ، لە بی بێکەس و لە ماڵی جەعفەرقوولی دیتبوومان، لێرە کەمتر وە بەرچاو دەکەوێ. جەعفەرقوولی گوتی: لە زۆزان چونکە لەوەڕ زۆرە، تەواوی لە دەوری یەکدی کۆ دەبینەوە و لە گەرمێن بە هۆی ئەوەی لەوەڕ کەمترە، هەموو پرژوبلاون. هەواڵیان پێ داین، تەلگرافمان لە تارانەوە بۆ هاتووە. دوانیوەڕۆ فەرمانداری داخرا بوو، نەمانتوانی تەلگراف وەربگرین.

## ١٨ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

جارێ هەر لە مەسجد سلێمان نین، لەگەڵ بەختیارییەك باسی پرسە و سەرەخۆشی ئەو کوڕە جوانەمەرگە دەکەین. دەیگوت، جگە لە دورکییەکان خەڵکی دیکەش مافییە دادەنێن. تەلەسم، زیاتر لەنێو چیانشیندا باوە. (لە نێوان کێوەزەرد و کێوە سپیدا) لە ناوچەی لەلەر وەختێ مافییە دادەنێن، هەوڵ دەدەن چەند گیاندارێکی کێوی بکوژن، کا دە پێستیان دەئاخنن، لە دەوری مافییە بەسەر پێوە ڕایاندەگرن، وەختێك یەکێك دێت بۆ سەرەخۆشی دەوراندەوری مافییە دەبینێ، پڕە لە گیانداری کێوی، پڵنگ، ڕێوی، بزنە کێوی و گورگ. لە مەسجد سلێمان دەرکەوتین بۆ لالی و شەو گەیشتین.

## ۱۹ی خەزەڵوەری ۱۳۵۲

ئەمڕۆ ماڵەکە لە لالی جمەی دەهات، کەسوکاری حاجیوەر چاوەڕێ بوون، بزانن بەڕێز **محەمەد** پەرویزی لەگەڵ میرکائیدەکان چی کردووە. نێزیکەی ٢٤ کەس کۆ ببوونەوە، مووسای جەهانگیری هاتبوو. زۆر قسە کرا، بەڵام هەواڵێك لە **محەمەد** پەرویزی نەبوو. لە بازاڕی لالی بوو چەند کەسێکیان بە شوێندا ناردبوو. حاجیوەرەکان پەرێشانن. تاڵان و دزی لەنێو ئێلدا ڕووی لە زیادبوونە. میرکائیدەکان بە کەیفی خۆیان سامان و سامانی بەرەی حاجیوەر دەڕفێنن، حاجیوەر ناچارن تا دەرەنگ نەبووە ئەو خوێنە داکوژێنن. وا دیارە ئەوەی بردوویانە ئەوەندە زۆرە، ئەگەر ئاشتەوایی سەر بگرێت، میرکائیدەکان قەرزدار دەبن. دەستەی حاجیوەر ئامادەن پوولێکیش بدەن بە ناوبژیوانان جگە لەوەی پارەی خوێنبەستنەکە وەربگرن، کەیخوداکان، حاجیوەری ئاگەدار بکەنەوە داوای سامانە دزراوەکەیان نەکەنەوە. ئەوەندەی ئاگەداری شەڕەکە بوون باوەڕیان وایە کوژراوەکە بێ تاوان بووە. **محەمەد** پەرویزی هات و هەموو شت ڕوون بووەوە: «مێگەل وەڕێ دەکەوێ، چادر و ڕەشماڵ کۆڵەکە و ئەستووندەکان لە هێستر هەڵدەبەستن، ڕان لەسەر ڕێی خۆی دەجووڵێ، کەوابێ ڕێبوار هەقی خۆیەتی لەم ڕێیەوە بچێت و کەس بۆی نییە ڕێی لێ بگرێت». حاجیوەرەکان دەڵێن: « قولکەیەك لەوێیە خۆڵەمێشی ئەو چەند ڕۆژەی تێدایە، شوێنی پێنج ڕەشماڵ لەوێ دیارە و بە هۆی ئەوەی شوانە بە ڕانەوە لای داوەتە زەوی حاجیوەرەکان و باری خستووە و مێگەلەکەشی کردووەتە لەوەڕگەی حاجیوەرانەوە. شوانەکانی حاجیوەر بۆ ئەوەی دەری بکەن، چوون لێیان داوە و ئەم کارەساتە هاتووەتە پێشێ». قسەی گەواهیدەرەکانیش جێی متمانەی دادگەیە. **محەمەد** پەرویزی دەمڕاستی میرکائیدانە و مووسا جەهانگیری دەمڕاستی حاجیوەرانە. جەعفەرقوولی لاگری کەس نییە. **محەمەد** پەرویزی دەڵێ، «ئەگەر خوێنەکە دانەکوژێت، کێشەکە گەورە دەبێتەوە، ئەوسا منداڵ و تیرە و تایەفە و خینەچووەکانیش تێوە دەگلێن. کارەکە دەگاتە کوشتار و تاڵان و بڕۆ، هۆزەکەش دەشێوێ». ئەوانە ئاگرەکە خۆشتر دەکەن. **محەمەد** پەرویزی و مووسا جەهانگیری لە هەوڵی ئەوەدان ئەو کێشەیە بە لایەکدا بخەن و ئەو خوێنە داکووژێنن، بەڵام وادیارە بە قازانجی خۆیان هەر ئەمڕۆ و سبەی دەکەن.

ئاخری کەسوکاری حاجیوەر بە بێ ئەوەی کاریان جێبەجێ ببێ، ماڵئاواییان کرد و ڕۆیشتن. ئەوە زۆر باش بوو، محەمەد پەرویزی بۆ ترساندنی حاجیوەرەکان دەیگوت، من دەزانم دوو کەس لە میرکائدەکان هەر یەکە و لۆرییەك مەڕیان فرۆشتووە». ئەو قسەیە لە زمان محەمەد پەرویزییەوە شتێکی گەورەیە لەنێو عەشیرەتەکەدا. هەمووی بۆ میرکائدەکان جێی مەترسی بوون، دەیانتوانی شاهیدی بدەن میرکائدەکان حاجیوەریان تالآن کردووە. لە لایەکی دیکەشەوە ترسێك بوو، بۆ سەر حاجیوەرەکان، ئەگەر بە خێرایی خوێنەکە دانەکوژێت زۆرتر زەرەرمەند دەبن و دوو ماشێن دەبێتە چەند ماشێن. ئەگەر بێت و هەر دوو لایەنەکە زۆرتر بترسن، ناوبژیوانان باشتر کارەکە جێبەجێ دەکەن.

خەریك بوو دەوروبەر چۆڵ دەبوو، محەمەد پەرویزی هەوڵی ئەوەی بوو پشوویەك بدات و ئێمەش سەرخەوێك بشکێنین. ئەمڕۆ چەند وشەیەکم بیست، زۆرم بۆ گرینگ بوو، یەکیان وشەی تارای سەری بووك بوو، پێی دەڵێن، «دوواق» وشەیەکی تورکییە و تورکانیش نەریتێکیان هەیە بە ناوی «دووقاپپا» کە دەبێتە تارا ڕفاندن. دوو وشەی دیکە هەبوون بۆ بووك و زاوا «بێ بیك» بووکە، «دووا» زاوایە. ئەوان بە سەریەکەوە دەڵێن «دووا بێ بیك». بە ژووری بووك و زاوا دەڵێن «دورگون». کەسێك بە منداڵی قبووڵ بکەن، پێی دەڵێن «نەکروری».

## ٢٠ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

ئەمڕۆ قەول وایە لە سیکوەندەوە هێسترمان بۆ بێنن، کەلوپەلەکەمان بار بکەین و بچین بۆ هەوار. ئێمەش لەوەبەدواوە لە باتی ژوور لە ڕەشماڵ و ژێر کەپراندا گوزەران دەکەین لە سیکوەند. خواردنی ئەم بەیانەشمان کەشکەك بوو بە ڕۆنی گامێش. دوێنێ لالی بێ ئاو بوو، قەرار وایە ئەمڕۆ بێ ئاو نەبێ. ئەگەر بێت و کۆمپانیای نەوت ئاوی لالی ببڕێ دەبێ ئەم خەڵکە، ئێرە چۆڵ بکەن. چونکە ناوچەی لالی چۆڕێك ئاو شك نابات. لە بەیانییەوە کە لە خەو هەستاوین ئەم خەڵکە چاویان لەم شێرە ئاوانە بڕیوە. هاش و هووش نەبێ هیچ نییە، لەم لوولە ئاوانەدا. بەکورتی دەمژمێر ٣٠/ ٧ی لوولە تەڕایی تێ هات و ئاو فیشقەی کرد، بوو بە بەزم و خۆشی. خەڵکەکە بە پەلەپڕوزێ هەرچی دەفر و گۆزەیان هەبوو، پڕیان کردن لە ئاو. لەبەرئەوەی بەیانی دوو دەمژمێر و دوای نیوەڕۆ دوو دەمژمێر ئاو هەیە. ئەم بەزمە تا دەمژمێر دە کاتی ئێمەی

گرت و کەسیش هێستری نەهێناوە. ئەوەی دەیبینی لە خەمی باڕاستیی کاری خۆیدایە. سەردانێکی بازاڕی لالیمان کرد و چاومان گێڕا و گوێمان هەڵخست. زۆرمان کار بە لالی دەبێ با بمێنێ بۆ وەختی خۆی. جاری بەم خەڵکەدا دەڕوانین، وەڵامی سڵاویان دەستێنینەوە، سەر بە دووکانەکاندا دەکەین و چاییان لەکن دەخۆینەوە و نێوانیان لەگەڵ خۆش دەکەین. هەواڵمان پێدان نانی نیوەڕۆ لە بازاڕ دەخۆین، کەبابێکی باشمان خوارد و زۆریش سەرنجمان دایە ئەو خەڵکە. دووکاندارەکانی ئێرە زۆرتر شووشتەری و گەتوەندین، ئەو ڕۆژەمان بە سەیر و سەیاحەت بەڕێ کرد. دستمان بۆ خامە نەبرد و خاڵمان لە توێڵی تێنووسان نەکوتا. دەمەو زەردەپەڕ لە ماڵی خۆی چاومان بە جەعفەرقوولی کەوت. کەلوپەلی بۆ لە ولاخەبەرزەیەك بارکردبووین، خۆیشمان بە سواری ترۆمبێل بەرەو سیکوەند وەڕێ کەوتین. ڕێگەی ماشێنی نەبوو، جەعفەرقوولی ببوو بە چاوساخمان، ئێمەش بە شوێن ئەودا هەرچۆنێك بوو بەسەر بەرز و نەویاندا خۆمان گەیاندە ڕەشماڵەکان و لە تەختانییەك ماشێنمان ڕاگرت. خۆمان کرد بە چادرێکدا و ماندوو و هیلاك پاڵ کەوتین. کردمانە بەزمی خۆمان و هەتا شێو ئامادە بوو بە گاڵتە و جەفەنگ ڕامان بوارد. ئەوان لە خێوەتدا خەوتن و ئێمەش لە ترۆمبێلەکەدا. گوتمان لەندەروێر، شاسی بەرزە و پاشکۆی ئەو جێخەوی دوو کەسی دەبێت. وەك دەڵێن ئەم ناوچەیە پڕە لە مار و دووپشك، ئێمەش کە زۆر ترسەنۆکین بە باشمان زانی لە ماشێنەکەدا بخەوین. هەرچەندە شەو و ڕۆژ لە شاخ و کێوین، ئێمەی بە نازپەروەردە چما منداڵی شار نین؟ بە پخێك چووزانم...، بەڵێ ئەوان کوڕی شاخ و کێون، ئێمەش لاسایی ئەوان دەکەینەوە.

## ٢١ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

بەیانی وەختێ لە خەو هەستاین و لە کیسەخەو هاتینە دەرێ، بە بێ ترس و خەم لەسەر ماشێنەکەوە لاقم بردە خوارێ، کلاشەکەم بکەمە پێم، گەلالی گورجێك خۆی گەیاندە بەردەمان و پێلاوەکانی من و پۆستاڵەکانی دیگاری تەکاندن، ئەی نەکا دەمارەکۆڵی تێدابێ! گوتی هەر وەختێ لە ترۆمبێلدا نوستن کلاشەکانتان بخەنە ماشێنەکەوە، لەسەر عەردی ئەم دووپشك و دەمارەکۆلانە شەوێ خۆی تێ دەخزێنن. هەمیشە لە گەرمێن دەمدیت پێش ئەوەی پێلاو بکەنە پێیان سەرەتا دەیانتەکاند، ئەوجار دە پێیان دەکرد. نەمدەزانی ئەمە بۆ ئاوا دەکەن؟ ئێستە دەزام بۆچی کاری

ئاوایان دەکرد. بۆمان دیار بوو، هۆی چییە بەختیارییەکان لە گەرمێن هیچ وەختێ پاڵ نادەن بە دیواری بەر و گڵەوە. پێش ئەوەی دانیشن بە چۆخەکەی بەریان بەردەمی خۆیان دەماڵن. ئەم ناوچەیە دووپشکی ورد و زەردی زۆرە و خێرا ناتوانی بیبینی. هەر بۆیە ئەوان زۆر ورد دەبنەوە، نانی بەیانیمان خوارد و بەنێو هەوارەکەدا سووڕێکمان لێدا. دەنگی ئاشی ئاور لە سیکوەندەوە دەهاتە گوێ. جەعفەرقوولی بێکار بوو، سەبارەت بە ئەم ئاشی ئاورە پرسیارمان لێ دەکرد. بۆ ئەو مەکینەیە بیست هەزار تمەنی داوە. میکانیك هەزار تمەنی بۆ دابەستنەکەی وەرگرتووە. لە ساڵی ١٣٤٦ ئەو ئاشی ئاورە دابەسراوە. دوو سەد کەس ئەم مەکینەیان لەسەر دار هەڵبستوە و بە شان لە لالییەوە هێناویانەتە سیکوەند. ئەو پیاوانە کرێیان وەرنەگرتووە، تەنیا خواردنیان پێ دراوە. ئەم ئاشی ئاورە لە مانگدا ئەم خەرجییانەی هەیە: میکانیك هەزار تمەن وەردەگرێت ئاگای لێی بێت و گازۆڵی تێ بکات، لە مانگدا هەزار تمەن خەرجی گازۆڵی هەیە، گازۆڵەکە بە هێستر لە لالییەوە دەهێننە سیکوەند زۆر گران دەکەوێت. لیتری ٥ قران، سێ کەس لە ئاشەکەدا کار دەکەن، یەکێك کاروباری گازۆڵ تێکردنی لە ئەستۆیە، یەکێك میکانیکە، کەسێکیش ئاشێڕە. ئەو ئاشە لە ساڵدا ٥ تا ٦ مانگ کاری هەیە. بۆ مەنێکی ٧ کیلۆیی گەنم، ٢ قڕان مزە وەردەگرن. دەیگوت، ئەم ئاشە لە مانگدا ٧٠٠٠ تمەن داهاتی هەیە. ٣٠٠٠ تمەن وەستا و کرێکار دەیبا و ٤٠٠٠ تمەن بە خاوەنی دەگات. هەڵبەت لە ساڵدا ٢٠٠٠ تمەن خەرجی نۆژنکردنەوەیەتی. کاتی خواردن هات و جەعفەرقوولی گوڕاندی، بۆ نانی نیوەڕۆ ناهێنن؟ جووجەکەبابی بەختیاریمان خوارد. سەرخەوێکمان شکاند و چووینەوە سەر باسی ئاشی ئاورەکە.

خەبەرمان هەبوو مەکینەیەك لە فانیاوایە. گوتی، ئاشەکەی فانیاوا لە ساڵدا تەنیا چل ڕۆژ کار دەکات. ماوەی دروێنە و خەرمانهەڵگرتن مەودای زۆر نییە. ئەم ئاشی ئاورە ساڵی ١٣٤٦ دامەزراوە. چل و پێنجی هاوین گەنم دەدروونەوە و ئەوەڵی پایزێ ڕەوەندان بار دەکەن. واتە ٣٥ ڕۆژ زیاتر مەکینەکە کار ناکات. دەیگوت، لە ساڵدا کەم و زۆر ٣ هەزار داهاتی هەیە. یەك دوو ئاشی ئاوم دیتبوو، وێنەی ئەوانم لەسەر کاغەز کێشایەوە و مکانیزمەکەیم یاداشت کرد. سەبارەت بەم ئاشە لەگەڵ جەعفەرقوولی قسەم کرد. گوتی، سازکردنەکەی نێزیکەی ٦ هەزار تمەن پارەی بردووە. ژوورێك، پەڕە، تەندوور و دوو بەردە ئاش. مزەی ئاشی

ئاوی کەمترە و لە ١٦ مەن مەنێك وەبەر ئاشەوان دەکەوێت. بە نووسینی ئەم باس و خواسانە و یادداشتکردن لە دەفتەرۆکی تایبەتدا تەواو ماندووی کردین. من هەستامە سەر پێ، کەمەکێك ئەژنۆکانم دامالّی و لەو دەرفەتەدا جەعفەرقوولی خۆی شاردەوە. لەگەڵ دیگار، ئێمەش وەدەر کەوتین تاکو پیاسە بکەین. خۆر پەڕیبوو، سەگەلیش پێمان نەدەوەڕین. ئەمڕۆ زۆر سووڕاینەوە، زۆر دانیشتین و زۆریشمان نووسی، وێنەشمان هەڵگرت. بە ئەنقەست واز لە کارکردن دەهێنین، نامانەوێ زۆری بیر لێ بکەینەوە، چەند فیش و فاکتەرمان پڕکردووەتەوە. خەریکی پیاسەکردنین و هەر کەسە و لە خەیاڵی خۆماندایین. دەگەڕێینەوە و دوای شێوخواردن بۆ نوستن دەچینەوە نێو ترۆمبێلەکە. ئەم شەو بە وریایی کەلوپەلەکانمان پشکنی بردماننە ماشێنەکەوە.

## ٢٢ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

وا دیارە هەر لە ئەمڕۆوە بەختیاریگەل نێر و ئاموور و هێستریان ئامادە کردووە بۆ جووتکردن. ئامووری دوو قۆڵی گەرمێنی، لە کەوناراوە هەیە و لە سۆمێرەکانەوە ماوەتەوە و تا ئێستەش هیچ گۆڕانکارییەکی بە سەردا نەهاتووە. هەر ئەو ئاموورە بوو بۆ یەك جار وەدووی گایان خست و توانییان لەو بەستەزمانە کار بکێشن. با خۆمان لە فەلسەفە نەدەین و بەختیارییەکان هەر لە ئەمڕۆکەوە مانگێك چل ڕۆژیان ماوە دەست بکەن بە جووتکردن، بەو مەرجەی باران نەبارێت، ئەگەر باران دایڕێژێت، ئەوان تەواو زەردمەند دەبن. لەم گەرمەسێرەدا ئەگەر باران بە غوڕڕەم ببارێت کێڵگەکان دەبن بە قوڕ، لەولاشەوە ئەو پووش و پارەی لە عەرزیدایە باران دەیشۆرێ و دەیبات و لەوەڕێك بۆ ئاژەڵەکە نامێنێ. هەڵبەت نەرمە باران خێر و بەرەکەتە، بۆ ئەوەی خێڵاتی لە زستاندا لەوەڕی دەست کەوێ بۆ مەڕ و ماڵاتی، لە سەرەتای پایزدا دووسێ بارانی پێویستە. وەختێك جووتکردن کۆتایی هات، پووش و پار دەکەوێتە ژێر خاکەوە و زەوی ئامادە دەبێ بۆ سەر هەڵدانەوەی سەوزەگیای تازە. ئەوا ئەمڕۆ لە نێزیکەوە چاوم کەوت بە جووتکردنی ئێلاتی لە گەرمەسێرەکەدا. ئەو ماڵانەی خاوەن پیاون زۆرتر کوڕوکاڵ خەریکی جووتکردن دەبن و پیر و بەساڵاچووان پاڵی لێ دەدەنەوە. ئێمەش دەیاندوێنین. سەبارەت بە ڕێگەی ئاژەڵدارانی ڕیز و غوەڵامخواستی و چالشتەری دەپرسین. دەڵێن ئەوان

لە ڕیزەوە دێنە شاریکورد، دواتر دەچنە باوە حەیدەر و ناڵەشکێنە، دەگەنە دەشتی زەڕی، دواتر دەچنە کوهرەنگ و لەوێدا دابەش دەبن. پەلێکیان دەچنە شێخ عەلیخان، دەستەیەکیش دەگەنە مارمەلەکی، بەشێکیش لە گەلی گزی و لقێکیش لە خوروە لا دەدەن. بۆ تەواوی ئەم ناوچانەش ڕێگەپێدانی لەوەڕگەیان وەرگرتووە. وشتریان هەیە و بێ بەشن لە هێستر و ماین. زووتر لە ڕێگەی گەنمانەوە دەچوونە شیراز. تەنیا لە ساڵەکانی ١٣٥٠ و ١٣٤٩دا کە دەڤەری شیراز بێ لەوەڕ بوو لە بازفت و شیمبار و مونارەوە، چوونە گەرمێنی بەختیاری و ئەمەش ئەو ساڵانە بوو، وڵات وشك و کاتۆر بوون. چەند کەرتە مەڕی قەشقایی قڕانیان کرد. ئێلی تورك زمانی لرکی لە تەنیشت قەشقاییەوە هەتا گەنمان دەهاتن.

ئەو پیرەمێردانە حەز دەکەن بەردەوام باسی هەموو لایەك بکەن و زۆرتر چیرۆك و مێژووی ئێل و عەشیرەت بگێڕنەوە. ئێمەش گوێگری باشین و تاکو زمانیان بگەرێ فەرمایشتیان دەژنەوین. دەڵێن کۆمەڵناسان گوێی بیستن و چاوی بینایان هەیە و هیچیش ناخەون. کەوابوو ئەوە ئێمەین. هەرچی ببیستین دەینووسین و ڕێك و لەباری دەکەین و دەیکەینە پەڕتووك و پەڕاو. سەرلەبەر قانوون و یاسای عەشیرەتەکە بە گشتی. کۆمەڵناسێك دەڵێ: «دەروونناسی، پشکنینی ناخی تاکی کۆمەڵگەیە و کۆمەڵناس، دەروونناسی تەواوی کۆمەڵە» ئەمەش نەگونجاوە مەگەر بە گوێگرتن و بیستنی هەموو وتە و ڕاوێژەکانی کۆمەڵگە. ئیختیارەکان دەیانگوت، وەختێ چوار لەنگەکان لە مولکی حەوت لەنگان چوونە دەرێ، تایەفەی سوهونی «یان سێ هوونە یان سێ ماڵ، ئەم سێ ماڵەش برێتی بوون لە: بابرساد پیر بوێری لەسەرە، کاکێش و حەمۆلە» جووڵەیان نەکرد و لەسەر مولکی حەوت لەنگان مانەوە. هۆی ئەم کارەش ئەوە بوو خانەکان لە دورکی بوون و سوهۆنیش حەزیان بە مانەوەی خانان دەکرد. ئەمەش بووە هۆی کۆکبوونی دورکیان. هەر وەك چوار یوری و ئیسترکی لەسەر تایەفەی دورکی هاتنە ئەژمار، تەواوی تووشماڵەکانی عەشیرەت جگە لەوەی دەڵێن، باپیرە گەورەیان زوڕناچی باوە ئەحمەد بووە و خۆیان بە تایەفەی باوە ئەحمەدی یان بامدی دەزانن، بەڵام لە کۆی تایەفەی حەمۆلەن. تەواوی تەختکەشان لە تایەفەی بابادین. واتە سەرکۆی تایەفەی بابادی، بەڵام پرژوبڵاون. تووشماڵەکان، میرشکاڵێشیان پێ دەڵێن. بە

تفەنگچی باشیش دەڵێن، میر شکاڵ. پێشتر بە کەیخودا و ڕیشچەرمگیان گوتووە تووشماڵ. ئێستەش لە چیاکان پێیان دەڵێن، تووشماڵ. ئەمڕۆکەش لەنێو عەشیرەتدا بە شایەرەکان دەڵێن تووشماڵ. خەریك بوو برسیمان دەبوو ئێمەش وازمان لە کارکردن هێنا.

نانی نیوەڕۆمان خوارد و بە ئاسوودەیی پاڵمان دایەوە. دوای ماوەیەك ملمان نا لە ڕاستە و پاستەکردنی یاداشت و نووسراوەی ئەم سێ ڕۆژە، هەمووومانی باراشی و نیسکەشۆر کرد، بۆ ئەوەی لە کاتی نووسینەوەی کۆتاییدا تووشی گرفت نەبین. دوای نیوەڕۆ وەڕێ کەوتین بۆ شوێنی مەبەست. چەند شتێکمان لە تەکنۆلۆژیا ئامادە کرد، خۆمان گەیاندە پیرەمێرد و دنیادیدەکان. پرسیمان چوار لەنگەکان لە زەوی حەوت لەنگان چوونە دەرێ، چوونە کوێ؟ گوتیان: دابەشبوون، بەشێك چوونە مەنتەقەی مەحموود ساڵح و بەشێك لە زیری ئیزە، لە دەوروبەری قەڵاتول، بە چوارلەنگی قەڵاتول بە ناوبانگە. چوارلەنگی کیارسی دابەش کران. هەروەك گوتم، چوارلەنگیان تەنیا تایەفەی سوهونی لەسەر حەوت لەنگان مانەوە و ئەوانی دیکە ڕۆیشتن. زۆریشمان کار بە وشەی کەلانتەر بوو. دەستەیەکی باش لە ڕیشسپی و پیرەمێردان دەوریان دابووین. کوێخای فانیاوا تەشریفی هەبوو. دەمانویست سەبارەت بەم وشەیە زانیاریی زۆرترمان دەست بکەوێ و ڕوونتر لەسەری بنووسین. لە دەورەی ئێلخانییەوە بۆ سەرپەرستان دەستووری کوێخایی داکەوت. لە زەمانی تیمسار ئەمین ئازاد، وەختێ بوو بە فەرمانداری چوارمەحاڵ و بەختیاری. واتە ١٨ ساڵ لەوە پێش هەندێك لە کوێخاکان کران بە کەلانتەر. بۆ نموونە لە تایەفەی بابادی، جەعفەرقوولی ڕۆستەمی، محەمەد پەرویزی، خوا لێخۆشبوو ئاغا ڕەزی، دەسەڵاتی کەلانتەریان پێ درا. بە دەروێش خانی جەهانگیری (لە یەکەم سەفەردا بۆ دەڤەری بەختیاری چاومان پێی کەوت، پیرەمێردێکی ئیختیار و نەخۆش هەر لەو کاتەدا مرد و خۆمان خۆش)، دەسەڵاتی کوێخایی درا بە فەرامەرز جەهانگیری، ئەمەش لە ساڵی ١٣٣٥دا بەڕێوە چوو. حوکمی کەلانتەری جەعفەرقوولیمان چاو پێکەوت لاپەڕێکی چاپ کراوە و ١١ کەس لە کوێخاکانی بەردەستی جەعفەرقوولی لەخوارەوە پەنجەمۆریان پێدا ناوە. واتە ئەم پیاوە سەرۆك هۆزی بەشێك لە تایەفەی بابادییە و قبووڵیان کردووە بە پێی نەریتی سەمسامەلسەڵتەنە هەق و مافی کەلانتەریی پێ بدەن. حەزمان کرد وێنەی لێ بگرین، بەڵام ئەو ئیزنەی پێ نەداین. تەنانەت ڕێگەی نەدا ڕوونووسێکی لێ هەڵبگرینەوە و تەنیا یەك تێبینی هەبوو. لە تایەفەی بامدی یەك کەس حوکمی کەلانتەری پێ درا، ئەویش ئەسکەندەر کەریمییە و ئەوانی دیکە دەسەڵاتی

کوێخایی. دەستەیەك دەیانگوت، پێشتر وشەی کەلانتەر لەنێو عەشیرەتدا نەبووە، بگرە هەر لە دەورەی ئەو تیمسار ئەمین ئازادەدا ئەم ناوە جێ کەوت. کەچی دەستەیەکی دیکە باوەڕیان وابوو پێشتریش بووە. ئێمەش باوەڕمان وابوو ئەم ناوە لە کۆنەوە داکەوتووە. زۆر کەس لە ناودارانی عەشیرەت دەناسین نازناوی کەلانتەریان هەیە. هەر وەك ڕۆستەمی کەلانتەری، کە ئێستە سەرۆك هۆزی بەشێك لە عارەبەکانی کەمەرییە. لە دەورەی دەسەلاتی ڕەزا خاندا پێناسە درا بە خەڵك و ناسناو داندرا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئەمین ئازاد، یان دوورتریش. جگە لەوە لە دەستورەکاندا دیتوومانە چەند کوێخایەك کۆ بوونەتەوە و کەسێکیان وەك کەلانتەر هەڵبژاردووە و بە وەزارەتی کیشوەر ناسێندراوە. ئەمانەش هەر ئەو ڕیشسپیانەی عەشیرەتن و لەو هۆزە بوون، لەگەڵ ئەم وشەیە تەواو ئاشنا بوون. هەر وەك دەستەیەك، دەروێش خان وەك کوێخا هەڵدەبژێن و دەیناسێنن. لە دەستوورەکاندا بۆ بەڕێوەبەری تایەفەی بابادی هاتووە، فلان کوێخا بە نیشانەی تەواوەوە گەورەی ١٢ بنەماڵەی حاجیوەرە، نەك هەمووی حاجیوەرەکان، بگرە تەنیا بەشێك لە وان و بەشەکەی دیکەی حاجیوەر لەژێر چاوەدێری ئاغارەزی و بەشێکیش لەژێر دەسەلاتی محەمەد پەرویزیدا بوون. سا لەنێو عەشیرەتەکەدا دوو چەشن کوێخا دەبینین. یەکیان کوێخای عەشیرەتی و ئەوی دیکە کوێخای لادێ. هەر وەك ئەم کوێخای گوندی فانیاوایە، یان کوێخای گوندی ئەحمەداوا و هی دیکەش. ئەوانە تەنیا کوێخای ئەو بەشە و ئەم لادێیانەن. وەختێ ئێلاتی لە گەرمێنن، ئەوان کارێکی گرینگیان لە دەست نایات، تەنیا وەختێك ڕەوەندان دەگەنە گەرمێن، لەوێ کەیخودایی دەکەن. سەرباز دەگرن و دەستووراتی دەوڵەتی بەڕێوە دەبەن. هەر لەو حوکمەی جەعفەرقوولیدا دەردەکەوێ لە دەورەی سەمسامەڵسەتەنەدا وشەی کەلانتەر و ڕادەی هەقی کەلانتەری بە تەواوی ڕوون بووەتەوە، کوێخاکانیش بەڵێنیان داوە هەقی کەلانتەری بە پێی نەریتی مۆرتەزا قوولی خانی سەمسام وەربگرن. جگە لەوەش هەموو کەلانتەرەکان وەك یەك بە وەج نەبوون و کوێخایی و کەلانتەری جیاوازی زۆری هەبووە. چونکە دەروێش خان و فەرامەرز خان هەردووکیان کوێخا و تا ڕادەیەك دەسەلاتی کەلانتەرێکی عەشیرەتیان هەبووە. ئەو کاسانەی لەژێر دەسلاتی ئەواندا بوون، چی وای لە ژێردەستانی جەعفەرقوولی کەمتر نەبووە. هەوڵمان دا بە پرسیارکردن تا ڕادەیەکی باش ئەم نووسینانەمان تیفتیفە بدەین. گوتیان، ئەولقاسم خانی بەختیاری بۆ یەکەم جار وشەی کەلانتەری لەنێو عەشیرەتدا درکاند. پێشتر هەر کوێخا هەبوو، ئەو ناوی کەلانتەری بۆ دانان. پێش کەلانتەر پلەی عەشیرەت، خان، کوێخا و ڕیشچەرموو باو

بوو. بە دوای خاندا، کەڵانتەر، کوێخا و ڕیشسپی قسەی بڕی دەکرد. مورتەزا قوولی خانی سەمسام، دواین خانی ناوداری بەختیاری بوو، بڕە پارەیەکی بۆ کەڵانتەران لە بەرچاو گرتبوو. وەختێ دەستووری دەوڵەتی دەرچوو هەر بەم پێیە مووچەیان بۆ دیاری کرا. ڕیزبەندی خانەکان بەم شێوەی خوارەوە بووە:

ئەولقاسم خان لە ١٣٢٠ تا ١٣٢٣

مۆرتەزا قوولی خان لە ١٣٢٣ تا ١٣٢٥

ئەولقاسم خان لە ١٣٢٥ تا ١٣٢٦

دواین دەسەڵاتداری بەختیاری مەنوچێرخان ئەسعەد کوڕی هاجەرقوولی خان بوو، کە لە ١٣٢٦ تا ١٣٢٧ بوو، تەواو بووە. چل ساڵ دواتر ئەفسەری نەزمییە حوکمی کردووە و دوای ئەویش ئەمین ئازاد بوو بە سەرپەلی نیزامی ئێلی بەختیاری. دەستەیەك دەیانگوت، وشەی کەڵانتەر لە ئێلی قەشقای وەرگیراوە. گەورەکانی تایەفەی بەختیاری لە کۆنەوە هەر کەیخودا و کوێخایان پێی گوتوون. ئەو کەڵانتەرانەی بۆ کاروباری خوێنبەست دەهاتن، وەك ئاشتکەرەوەی دوو لایەن، بەشی خۆیان دەبرد و ئێستەش هەر وایە. کەڵانتەری تایەفەی کوژراو یەك لە دەی خوێنبەستنەکەی وەردەگرت و کەڵانتەری تایەفەی بکوژ «کەوای خوێنبەست» یان دەمشیرینیی خوێنبەستی وەبەر دەکەوت کە هەر وەك یەك وا بوون.

نانی ئەمڕۆکەمان لەگەڵ ئەواندا خوارد و تاکو ڕۆژئاوا چیان گوت، نووسیمان و دواتر وەدەر کەوتین بۆ حەسانەوە و پیاسەکردن. تیری قەشقاییمان دیبوو، قووڵترە و تیری بەختیاری ئەوندە درێژ نین. هۆی ئەمەشمان لە پیاوێکی بەختیاری پرسی. وەڵامەکەی تەواو بوو گوتی: ئێمەی بەختیاری کەڵك لە کورتان وەرناگرین و گوێرێژ و هێسترەکان جل دەکەین. ئەم جلانەش کورتن، ئەگەر تیرەکانمان زۆر شۆڕ بن ئەوا لەم شاخ و کێوەدا لە بەرد دەگیرێ و دەدڕێ، بەڵام قەشقایی وشتریان هەیە و کورتان دەدەن بەسەر پشتیاندا، ئەم بەرزبوونەش دەبێتە هۆی ئەوەی بنی تیر لە زەوی نەخزێت. شێومان خوارد و نووستین.

**٢٣ی خەزەڵوەری ١٣٥٢**

ئەمڕۆکەش بەتەماین بچینەوە بۆ لای پیرەمێردەکان. نانی بەیانیمان خوارد و بە سالاچووان دەوریان داین. محەمەد پەرویزی لە لامان بوو. سەبارەت بە نێوان ناخۆشیی چوار لەنگ و حەوت لەنگ پرسیارمان کرد، چۆن بوون چوار لەنگە بەم چەشنە بێ هێز بوون؟ خانەکانی چوار لەنگ برێتی بوون لە: چراغعەلی خان و محەمەدعەلی خان لە لایەك و ئەلایارخان و فەتحولا خان لە لایەکی دیکەوە. ئەوانە بەشێك بوون لە چوارلەنگەکانی مەحموود سالح. لە حەوت لەنگەکان، حوسێنقوولی خان ئێلخانی، ئیمام قوولی خان حاجی ئێلخانی و ڕەزاقوولی خان ئێلبەگی، ئەوانە سێ برا بوون. ئەوان هەواڵ دەنێرن بۆ ئەلایارخان و فەتحولاخان، دەڵێن ئێمە ژنت پێ دەدەین و لە هەمبەر چراغعەلی خان و مەحمەد عەلی خاندا پشتیوانیت لێ دەکەین و دەتکەین بە سەرۆکی چوار لەنگان. ئەوان قبوولیان نەکرد. ئەم هەواڵەیان بە حوسێنقوولی خانی ئێلخانیدا بۆ ناردن. چراغعەلیخان و محەمەد عەلی خان بەم حەیس و بەیسەیان زانی و بە نهێنی چوونە لای حوسێنقوولی خانی ئێلخانی و هاتن و بڕیاریان دەرکرد بە شێوەیەك فەتحولاخان ڕەشبگیر بکەن و بیدەن بە دەست ئێلخانییەوە، بۆ ئەوەی ئێلخانی یارمەتیی ئەوان بکات. ئەم قەول و قەرارە پەسند کرا. چراغعەلیخان و محەمەد خان داوایان لە ئەلایارخان و فەتحولاخان کرد. ئەلایارخان ڕازی نەبوو، بەلام فەتحولاخان پێشنیازی ئەوانی قبووڵ کرد و چوون ئەویان گرت و حوسێنقوولی خانیان ئاگەدار کردەوە. حوسێنقوولی خانی ئێلخانی دەستوبرد دوو سەد سواری وە دووی خۆیدا و لەگەڵ ڕەزاقوولیخانی ئێلبەگی گەیشتە شوێنی مەبەست و فەتحولاخانیان بە پشتێنەکەی خۆی خنکاند. هەتا هەواڵی دەستبەسەرکردنی فەتحولاخان دەگاتە ئەلایارخان و، ئەوان دەگەنە ئەوێ، دەستەیەك ئێلخانی لە چوخەخۆرەوە دەگەنێ و دەبێتە شەڕ و پێکدادان و

مێهراب برای فەتحولاخان دەکوژرێ. ئەلایارخان خۆی بۆ ڕاگیرنەکرا و لەگەڵ دارودەستەکەی ڕوویان کردە خوزستان و ڕەزاقوولی خانی ئێلبەگ بە قوونەشەڕ کەوتە شوێنی و گەیشتنە لیوس لە دە فرسەخیی دزفول. لەوێ هەموویان بە چۆکدا هاتن و ئەلایارخان بە تەنیا مایەوە و ئەویشیان لە باخێکدا کوشت و ئاژاوەی چوار لەنگ کۆتایی پێ هات. چراغعەلی خان و محەمەد خان هەر یەکە و ژنێکیان پێدان و ئەوانیش بەم چەشنە بە چۆکدا هاتن و لە دەورەی ناسرەدین شادا ئەو خانانەش دەفتەری دەسەلاتیان کۆ کرایەوە.

پیرەمێردان یەکدابەدوو ورتەیان دەهات و دەپەڕینە نێو قسەی یەکدی و ئەوەی بەکار هات، ئێمەش باراشیمان کرد و نووسیمانەوە. سەبارەت بە هاوکاریکردنی بەختیارییەکان لەگەڵ شا گوتیان: «عەلی ساڵح خان لە دەورەی نادردا سەرناوی سەرداری وەرگرت و دورکی بوو. لە گرتنەوەی هێندستاندا، بەختیارییەکان بە سەرکردایەتیی عەلی ساڵح خان بوونە سووری بەر لەشکری نادر، لە پاش داگیرکردنی هیندستان برای ئەو عەلی ساڵح خانە لەگەڵ تاقمێك لە بەختیارییەکان لەوێ نیشتەجێبوون و مانەوە». پیرەمێردەکان سەبارەت بە نادر و بەختیاریگەل ئەم چیرۆکەی خوارەوەیان گێڕایەوە: «نادر بۆ کۆکردنەوەی پیتاك وماڵیات کاربەدەستانی دەنێرێتە بەختیاری، بەختیاری پێمل نابن و پیاوەکانی نادر دەردەکەن. نادر بە لەشکر و سەربازەوە دەچێتە کوهڕەنگ و کێوە زەرد و سێ شەو و سێ ڕۆژ لێك دەدەن، زۆرینەی تۆپەکانی بەجێ دەمێنێ و نێزیك ٦٠ ساڵ لەوەپێش تۆپەکانیان دیتەوە. نادر دەستووری دا لادێکانی کوهڕنگیان ئاور تێبەردا. بەختیارییەکان مەجبوور بوون چوونە خوزستان و نادر لە ڕێگەی شیرازەوە گەیشتە سیکوەند، لە بەشی سەلەواتی چادری هەڵدا. هۆز تێك شکا و بەش بەش بوون، تەنیا ١٧ کەس لە سەرۆکانی هۆز مانەوە، کە نادر دەستووری دا دەبێ ئەو حەڤدە کەسە دەست بەسەر بکەن. لە ئەشکەوتی عەلی ساڵح دەستبەسەر کران و کوژران، عەلی مراد بە تاوانباری سەرەکیی ئەم ڕووداوە ناسرا و بە سەری زیندوویی لە ئاوی کوڵاتوودا کوڵاندیان. سەرۆکانی بەختیاری هەر لە تاران ڕاگیران تا شەڕی قەندەهار دەستی پێکرد و میرزا مەهدی خان بە دەستووری نادر بانگێشتنی سەرۆك هۆزان دەکات تاکو لە شەڕی قەندەهاردا بەشداری بکەن. ئەوان بەو مەرجەی خانەکان بگرنەوە دەستەیەك لە تاران ئەم داواکارییە قبووڵ دەکەن.

ماوەی ساڵێك بوو نادر نەیدەتوانی قەندەهار بگرێت، سوارانی بەختیاری بە سەرۆکایەتیی سەرکردەکانیان، تێکەڵ بە سپای نادر بوون. عەلی ساڵح خان فەرماندەی دەستەی بەختیارییەکان بوو لە لایەن نادرەوە سەرناوی سەرداری پێ بەخشرا. کەلبعەلی خان (سەگی عەلی) کوڕی ساڵەخان بوو، حەبیبوڵاخان کوڕی کەلبعەلی خان و جەعفەرقوولیخان کوڕی حەبیبوڵاخان. ئەوانە لەگەڵ سەرۆك ئۆردووی نادر قسە دەکەن و داوای لێ دەکەن، ئەو چل دەمژمێرە سوارەکان پشوو بدەن و ئاسوودە بن. لە لایەکی دیکەشەوە ڕێگە نەدەن ئێشکچی و تفەنگچی سەر قەڵای قەندەهار بخەون. ئەوانیش نەیانهێشت تفەنگچیان تا شەو و ڕۆژێك بخەون، وەختێ تاو و بان گەرم بوو سپای نادر لە قەڵاکە دوور کەوتەوە. تینی هەتاو ئیشکچی و تفەنگچی لەسەر قەڵاکە کردە خەو، بەختیارییەکان بە نێردیوان و پەیژەی بڵند خۆیان گەیاندە سەربانی قەڵا، ئەحمەد خانیان لەگەڵدا بوو. پارێزەرەکان دەگرن و ئەوەی لە قەڵادا دەبێ بە چۆکدا دێت. زۆر زوو هەواڵی ئەم سەرکەوتنە بە دەستی بەختیارییەکان ئەدەن بە نادر. نادر تووڕە دەبێ، ئەوە چۆنە ساڵێکە سپاکەی نەیتوانیوە قەندەهار بگرێ و بەختیاریگەل لە ماوەی دوو سێ ڕۆژدا بە چۆکیاندا هێناوە؟ دەستوور دەدا قەڵاکە ڕادەستی سوارانی نادر بکەن و بەختیاری بگەڕێنەوە بۆ تاران. لە لایەکی دیکەوە نادر دەستوور دەدا بە میرزا مەهدی خان، سەری چل کەس لە گەورە سوارانی ئێلی بەختیاری و سەرکردەکانیان ببڕی. هێزی بەختیاری سەرکەوتووانە یەك ڕاست دەگەڕێتەوە بۆ لای میرزا مەهدی خان. میرزا مەهدی خان ئەو هەواڵەیان بە گوێدا دەچپێنێ و ڕێنوێنییان دەکات، کەسێکی زیرەك لەوان بچێ بۆ لای نادر و بڵێ ئەوە بەخت و ئێقباڵی شا بووە کە ئەم سەرکەوتنەمان بە نەسیب بووە. ئەحمەد خان دەچێتە کن نادر و لە پرسیار و وەڵامدا هەر ئەوە دەڵێ و نادر زۆر پێدەکەنێ». ئەوە ئەم چیرۆکە بوو، زۆرجار پیرانی هۆزەکە بۆیان باس دەکردین و لێرەدا ڕووداو بە گشتی بەر گوێ دەکەوێ. دەیانگوت، قەڵای سەلەواتی وا نادر لەوێدا دانیشت و خەیمەی هەڵدا، کەلبعەلی خانی دورکی دروستی کردبوو، ئەمەی جێگە و ڕێگەی تایبەتی دورکیان بوو. ئەوان ڕووپەڕێکی دیکەیان لەسەر مێژووی ئێلی بەختیاری هەڵدایەوە و ئێمەش نووسیمانەوە. بگرە ڕۆژێك بە کار بێت. (لە دەورەی فەرامەرزخان و جەهانگیرخانی بابادیدا کوڕەکانی ئەحمەدخان، کە دەچنە سەر زنجیرە «منداڵی» تیرەی بابادی عالی ئەنوەر، مەحموودخان، خانی تایەفەی بێهداروەند بوو، کە پێیان دەگوت مەحموود خانی فەقیرکوژ، دوای ئەویش سەرۆکی

بێهداروەندەکان جەعفەرقوولیخان و دوای جەعفەرقوولیخان، حاجی عەبدوڵاخان بوو بە سەرۆك و لە پاش ئەویش عەجەم خان سەرۆکایەتی پێ برا و، لە دەورەی ئەودا تایەفەی بێهداروەند دابەش بوون. چونکە لەو کاتەدا، واتە لە دەورەی مەحموودخان و فەرامەرز خان، سەرۆکانی بەختیاری لەگەڵ یەکدی خزمایەتیان دەکرد. کچی فەرامەرزخان واتە «بی بی هەوا» درا بە مەحموود خان. باش وایە ئەمەشمان لە بیر نەچێ کە هەمیشە بێهداروەند و چوار لەنگ خینەچوو بوون و دورکی و بابادی خینەچووی یەکدی بوون. کە وابێ باری خزمایەتی لە خینەچوویيدا کارساز نییە. بێهداروەندان هەمیشە لەگەڵ دورکیان شەڕ و قڕڕەیان بووە، بەڵام قەت نەبووە دەروەستی دورکیان بێن. لە یەکێ لەم شەڕانەدا، بێهداروەندەکان لە چوارلەنگان کە خینەچووی ئەوان بوون، داوای یارمەتی دەکەن. چوارلەنگەکان یارمەتی بێهداروەندان دەدەن. لە ئاکامدا دورکیگەل داوایان لە خینەچووی خۆیان کرد، واتە بابادییەکان پشتی ئەوان بگرن و فەرامەرز خان بە سوارێکی زۆرەوە چووە یاریدەیان. «فارسان» موڵکی بێهداروەندان بوو، بووە ناوەندی کۆبوونەوەی چوارلەنگان، بابادییەکان لە «گۆشە» کۆ بوونەوە و دورکیان لە «جونقان». چوارلەنگان دەستدرێژییان کردە سەر فارسانیان. مەحموودخان لەو کارەی خۆی پەشیمان بووەوە، نەدەبوو داوای یارمەتی لە چوارلەنگان بکات. تەتەر و قاسیدێکی نارده لای فەرامەرزخانی خەزووری خۆی، بەم پەیامە (لەوەی داوای کۆمەك و یارمەتیم لە چوارلەنگان کردووە زۆر ژیوانم، ئەوان بەو دەستدرێژیکردنە بۆ سەر فارسانیان ئابڕوو و ڕێزی ئێمەیان خستە ژێر پێ. وەرە با یەکدی ببینین و هەرچۆنێك بێت ئەو چوار لەنگانە لە ناوچەکە وەدەر بنێین. ئێوە چۆن دەڵێن من قبووڵمە). زۆراب خان فەرماندەی هێزی چوارلەنگان دەبێ و بەم کەینوبەینە دەزانێ. بێدەنگەی لێ دەکات، بەڵام داوا لە مەحموود خان دەکات شوێنی سەنگەرەکانی خۆیان بگۆڕن، واتە زۆراب خان بچێتە جێی مەحموود خان، ئەویش هەروا. مەحموود خان بە هەر هۆیەك یان ئەنقست یان هەڵە، بۆ ئەم جێگۆڕکێیە هیچ خەبەرێك نادا بە فەرامەرز خان. فەرامەرز خان هەر وەك بەڵێنی دابوو بە سێ سوارەوە شەوێ دێتە ئەو سەنگەرەی وا قەرار بوو مەحموود خان ببینێت. وەختێ دەگەنە نێزیك سەنگەرەکە سوارانی زۆراب ناوی نهێنی شەو دەپرسن، ئەویش بەم حەیس و بەیسەی نەزانیوە، وادەزانی ئەوانە مەحموود خان و سوارەکانی مەحموود خانن. دەڵێ فەرامەرزخان ئێمەی ناردووە. سوارەکان تەقەی لێ دەکەن و ڕانی فەرامەرزخان دەپێکن، بە برینداری هەڵدێ و دەگاتە «گۆشە».

بەیانی بە شوێنی دڵۆپە خوێنەکەدا دەچن، بۆیان ڕوون دەبێتەوە سوارە بریندارەکە لە چ تایەفەیەکە و مەحموود خان دەزانی فەرامەرز خان لە کاتی خۆیدا هاتووە و پێکراوە. بە بی بی هەوا دەڵێ، شتێکت پێ دەڵێین نیگەران مەبە، بابت پێکراوە. بی بی هەوا تێك دەچێ و دەڵێ لەبەرئەوەی بە گاڵتە ناوی بابی من دەبەی دەبێ تۆ لە پێش بابمدا بمری. کەسێك ڕەوانەی گۆشە دەکەن لە نێزیك فارسان. ئەو هەواڵەکە دەگەیەنێتە بابادیان و دەڵێ زۆر بە داخەوەم لە بابادیان کەسێکی وا نییە تۆڵە لە مەحموود خان بکاتەوە. پێنج کەس لە بابادییەکان، واتە سێ کەس لە میرکائدان و دوو کەس لە ئارپەنایی گیان لە سەردەستان سەر لە پێناو دەنێن. مەحموود خان عادەتی وابوو لەگەڵ پەنجا سوار شەوانە بە سەنگەرەکاندا دەگەڕا، خۆی هەمیشە لە پێشەوە و سواران لە پشت سەری. ئەو پێنج کەسە خۆیان لە پشت خەرمانەکانی نێزیك سەنگەرەکان حەشار دەدەن، وەختێ مەحموود خان دەگاتە بەردەمیان تەقەی لێ دەکەن و دەیپێکن، بەڵام ناکەوێ و ئەسپ ڕوو دەکاتە فارسان و تێی دەتەقێنێ. وەختێ ئەسپ بە پڕتاو خۆ دەکات بە ژوورێدا سەری مەحموود خان لە سەردەرانە دەکەوێ و بەر دەبێتەوە. بی بی هەوا دەگاتە سەری و لە خۆشیان دەیکاتە قریوە. تەرمەکەی مەحموود خان نیوەشەو بردیانە تونبول و هەر لەوێ ئەسپەردەیان کرد. سوارنی چوارلەنگ و بێهداروەند بلاوەی دەکەن، بۆ ئەوەی نەبێتە شەڕی نۆ هەزار سوارە، زۆراب خان، بکوژەکەی فەراوەمەرزخان، دەکوژرێت». ئەگەرچی هەتا شەوێ سەرقاڵیان کردین،ماڵیان ئاوابێ زۆر شتی باشیان بۆ ئێمە پێ بوو.

## ٢٤ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

بە هۆی ئەوەی لە بەرەبەری کۆتایی سەفەرداین، کاتێکی زۆرمان بە دەستەوە نەماوە، ئەمڕۆ تەواوی وەختی خۆمان داناوە بۆ وێنەهەڵگرتنی کەرەستەی ژیان و گوزەرانی ئێلاتیان. تاکو بتوانین پلانی کۆمەڵناسیی تایبەت بەم دەڤەرە تەواو بکەین. خەریکی بەدەستهێنانی نەخشەکانی کۆمەڵناسین، کە بەشە جوگرافییەکانی پێشهاتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، لە جلوبەرگ و پۆشاکی ئەو خەڵکەوە بگرە تا خانووبەرە و کەرەستەی بەرهەمهێنان، تەواوی ئەوانە لەسەر نەخشە و نەخشەکە نیشان بدەین و سنوور و کەوشەنی هەموویان دیار بکەین و بیانناسین. هێندە شەکەت و ماندووم، تەنانەت ناتوانم یاداشتەکانی ڕۆژانەم بنووسمەوە، دەبێ بمبوورن.

## ٢٥ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

ئەمڕۆ خەریکی پێداچونەوەی کارەکانمانین. بۆمان دەرکەوت ناوچەکانی ئیزە، ئەندیکا، سەلەواتی، سەردەشت هەتا نێزیك لووڕستان و ئەندیمێشك تا دەگاتە دۆڵێ، شێوەی ماڵسازکردنیان تەواوی هەر کەپر و کەوێڵە. لە بەیانییەوە تا بوو بە نیوەڕۆ کاری ئێمە بوو بە ڕێکوپێککردنی نەخشە و دامەزراندنی ئاگەداری لەسەر ئەوان تاکو سەبارەت بە ماڵ و مزڵ بگەینە ئامانجێکی تەواو، ئەگەر ئەو کارەمان لە شوێنی خۆی نەکردایە لە تاران بۆ ساخکردنەوەی ئەم کارانە لەگەڵ گرفت ڕووبەروو دەبووین. لێرە کەسێك هەیە سەبارەت بە هەر بابەتێکی ناوچەکە پرسیاری لێ بکەین و وەڵامی تەواومان بداتەوە. دوانیوەڕۆ زانیمان شوێنی سەیران و گەشتی خانان و نشیمەنیان لە کوێ بووە: چۆخەخۆر ٤٥ بەهار تا کۆتایی مانگی گەلاوێژ لەم ناوچەیە بوون، شاریکورد و ئیزە. زۆرینەی ساڵەکان لە ئیزەوە چوونەتە کۆهگیلۆیە و بێهبەهان، ڕامهۆرمز، ڕەقیبە، مەسجد سلێمان، شووشتەر، ئەندیکا و زۆرینەی ساڵەکان لە ئەندیکاوە دەچوونە ئەوبی، دزفول. دیسان نەخشە و پلاندانان بۆ وێنەهەڵگرتن لە کەلوپەلی ژیانی ئەوان بە ئەندازە و پێوەرێکی باشەوە.

## ٢٦ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

بەیانی سەردانێکی بازاڕمان کرد بۆ ئەوەی بەنزین بکەینە ترۆمبێلەکەوە. قەول وایە ئەم شەو بچینە سەلەواتی و شەو لەوێندەرێ وەمێنین. لە بازاڕی لالی تووشی مووسا جەهانگیری هاتین و پێمان گوت، محەمەد پەرویزی هاتووە. دواتر ڕێگەی سەلەواتیمان گرتەبەر. جەعفەرقوولی کۆت و شەرواڵ و کراس و حەبی بۆ شوانەکانی کڕی. لەنێو ڕێدا لە چادری کچی جەعفەرقوولی نانی نیوەڕۆمان خوارد کە دەبێتە ئەحمەدی محەمەدییەکان. ئەوە یەکەم جار بوو لەنێو عەشیرەتدا لەگەڵ ژن و منداڵ لەسەر یەك کەوڵ و سفرە دانیشین و نان بخۆین و ئافرەت لە کاروباری پیاواندا بەشداری بکات. بەختیارییەکان زۆر لە دەمارە کۆڵ ناترسن بەڵام لە مار دەترسن. ئەوەندەی دانیشتین

باس باسی مار بوو. کچەکەی جەعفەرقوولی دەیگوت، دوێنێ مارێکی گەورە لەژێر تێڕ و توربێنەکان ڕاخوشی و بۆی دەرچوو. زۆر بە ترسەوە ناوی ماری دەهێنا. دواتر کەوتینە ڕێ و گەیشتینە هەوارەکە. جەعفەرقوولی تا ڕادەیەك لەوە نیگەران بوو، کە ئەم لەوەڕگەیان بەجێ هێشتووە و چوونەتە شوێنێکی دیکە. ڕەشماڵەکانی دۆزییەوە، هەوا نەختێك گەرمتر بووە. ئەم شوێنەی ئێمەش لێی دابەزیوین وەك دەڵێن پڕە لە دووپشك. شوانێکی جەعفەرقوولی دوو قاپووتی داوە بە شانیدا و بۆ لای مێگەلەکە وەڕێ کەوتووە. کەپەنکێك دەدا بە شوانی بزنەگەلەکە. دیمەنێکمان بینی و زۆریش پێکەنین، سەری لاستیکێکیان لە هەرامەی نێرەکەرەکە بەستبوو ئەوسەری لە ڕانی گرێدرا بوو. هۆی ئەم کارەم پرسی گوتیان، نامانەوێ لە وەختی کارکردندا ماکەرەکان تەڵەب بگرن. ئەم بەستنەوەیە ڕێگە لە پەڕینی ئەم گۆڵەکەرانە دەگرێت. بیستبووم کەڵەباب یەختە دەکەن و پێی دەڵێن «خەشی». لە بن ڕانییەوە بەر زگی کون دەکەن و قامك دەبەنە ژووری و هێلکە گونەکانی دەترازێنن. دواتر شوێنەکە بە داوی کلکی ئەسپ دەدوورنەوە. هەڵبەت پێش ئەوەی کەڵەشێر یان کەڵەباب پێدابفسێ یەختەی دەکەن. تا دەهات دەورو بەرمان قەرەباڵغتر دەبوو نەمزانی کەڵەباب بۆچی دەخەسێنن.

شەوێ لە سەلەواتی دەمێنینەوە و لەگەڵ دیگار لە ترسی دووپشك لە ماشیندا دەخەوین.

### ٢٦ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

بەیانی دەچین بۆ لالی. هیچمان لە سەلەواتی هەڵنەکڕاند. ئەوێش هەر وەك شوێنەکانی دیکە وابوو، ڕەشماڵ، ڕانەمەڕ، لەوەڕگە. دەگەینە لای بۆ وچانێك دەچینە دووکانەکان و پشوویەك دەدەین. خەڵکی لالی هەر وەك چلگرد لە هاوین و پایزدا جیاوازیی زۆری پێوە دیارە. لە هاویندا وەختێ ئێلاتی دەچنە زۆزانێ، کۆی خەڵکی لالی نێزیکەی ٢٠٠٠ تا ٢٥٠٠ کەسە، بەڵام لە زستاندا وەختێ خێلاتی لە گەرمێنن، کۆی ئەو خەڵکە دەگاتە ٥٠٠٠ تا ٦٠٠٠ کەس. لەو شوێنە نێزیکەی ٢٥٠ تا ٣٠٠ دووکان هەیە و مشتەرییەکانیش عەشیرەتی بەختیارین. زۆرینەی ئەمانەش هەر وەك پێشتر باسم کردووە لە گەتوەندی و شووشتەری پێك هاتوون. بە قەرز و فەرز لەگەڵ ئێلاتیان

سازاون. له زستانێدا زۆرینەی دووکانەکانی لالی دەگەنە ١٠ تا ١٥ دووکان. نێزیکەی ١٠٠٠ قوتابی لە سەرەتایی و دواناوەندی سەرقاڵی وانەخوێندنن. ئەمڕۆشمان له لالی بردەسەر. ئێوارێ شەکەت و ماندوو هاتینەوە بۆ ماڵێ.

## ٢٧ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

ئەمڕۆ محەمەد پەرویزی و جەعفەرقوولی ڕۆستەمی و مەشەدی ئەمیرقوولی و چەند کەسێکی تر وەڵامی پرسیارێ ئێمە دەدەنەوە. گەرەکمانە سەبارەت بە ئێلخانی و حاجی ئێلخانی ڕوونکردنەوەمان هەبێ. وەختێ حوسێنقوولی خانی حاجی ئێلخانی و ئیمامقوولی خانی ئێلخانی، ڕەزاقوولی خانی ئێلبەگ دەکوژن، هیچ کامیان نەیانتوانی دەروەستی یەکدی بێن و ناچار بە یەکەوە سازشتیان کرد و بەڵێنیان دا عەشیرەتەکە بکەنە دوو بەش. ئەم دابەشکردنەیان خستە ئەستۆی کوێخاکان. نموونەی بەشکردنی عەشیرەتمان لە تایەفەی بابادی خستە بەر لێکۆڵینەوە. نیوەی منداڵی بیر لە لای ڕەزی خەسرەوی بوو، نیوەکەی دیکەی لای فەرامەرز جەهانگیری. منداڵی کیسیدی لە لای محەمەد پەرویزی، منداڵی خودادادی لەلای جەعفەرقوولی، نیوەی منداڵی ڕوکنەدین بۆ جەعفەرقوولی و ئەو نیوەی دیکەشی بۆ دەروێش جەهانگیری. منداڵی داود قەرەج بۆ ڕەزی خەسرەوی، نیوەی منداڵی شێخ تازەیی بۆ ڕەزی خەسرەوی و نیوەکەی دیکەش بۆ محەمەد پەرویزی. منداڵی دۆستعەلی بۆ محەمەد پەرویزی، نیوەی منداڵی سیراجەدین و نیوەی منداڵی شێخ و دەروێش جەهانگیری و نیوەی منداڵی سیراجەدین و نیوەی منداڵی خۆشنامی بۆ فەرامەرز خەسرەوی. نیوەی منداڵی ڕەك بۆ دەروێش جەهانگیری، نیوەکەی دیکە بۆ جەعفەرقوولی ڕۆستەمی، نیوەی تیرەی ئەحمەد سمالی بۆ جەعفەرقوولی ڕۆستەمی، نیوەکەی دیکە بۆ ڕەزی خەسرەوی و ٣٠ خێزان هەر لەو تیرەیە بۆ محەمەد پەرویزی. ئەوانەی ناویان هات هەموویان لە تیرەی ئارپەنایین، بۆ نموونە ناویان هاتووە. نێزیکەی ٢٥ ساڵ لەوەپێش، نیوەی تیرەیەکیان دا و نیوەی ئەوانی دیان وەرگرت. تیرەکان هەر یەکە و بەسەر کەلانتەرێکدا دابەش کران. زۆریش بۆ من ڕوون نەبووەوە، جاری با واز لەم باسە بێنین. دایدەنین بۆ سەفەرێکی دیکە. گوتم خوێنبەستەکە بە کوێ گەیشت؟ گوتیان: هەردوو لایەن چاوەڕێن بزانن کەیخودا و دەمڕاستان چی دەکەن، ئەوا هەر دێن و دەچن، وەختێ هەردوو لا مەرزەم بوون بەڵێننامەکە دەنووسرێ، پووڵ و پارە، چەند، جووت گا و زەوی

و کچێك لە نامەکەدا دەنووسرێ و سوورەتجەلەسە دەخوێندرێتەوە و دەمودەست شاهیدان واژۆی دەکەن. دوای ئەوە خێزانی بکوژەکە دەچنە سەر موڵك و ماڵی کوژراوەکە، ئەوانیش دەیکەنە شیوەن و خۆڕنین، نارەزایی خۆیان دەردەبڕن، ئاشتەوانان ئاشتیان دەکەنەوە و کۆڕی پرسە و سەرەخۆشی دادەنێن. ماوەیەك دواتر کچەکە دەنێرنە ماڵی کوژراوەکە و شەڕ و هەرا تەواو دەبێ. لەبەرئەوەی خەریکی ڕێکوپێکی نەخشە و نەخشەی کۆمەڵناسی بووین، دەمانویست ڕێگەی هاتوچۆی کەڵ و گامێشەکان دیاری بکەین. پرسیمان لە چ وەختێکدا کەڵ و گامێش دەبەنە زۆزانێ و کەی نایانبەن؟ گوتیان: «بەر لە تەختە قاپۆی زۆرەملی ڕەزا شا، کەڵ و گامێشی عارەبەکان لەگەڵ ئێلاتی کۆچیان دەکرد. دەهاتنە تەنگەی گەزی و دێمەزەوی و لەوەڕگەیان هەبوو، بەڵام لە دوای ئەوە تاکو شیرین بەهار زیاتر ناڕۆن.» وردە وردە خەریکە لە دواین ڕۆژەکانی سەفەر نێزیك دەبینەوە. ئەوەی بە دەستمانەوەیە کارکردنە لەسەر نەخشەی کۆمەڵناسی و پڕکردنەوەی پرسیارنامەی تایبەت بە ئەوان و ئەمەش تیفتیفەدانی کارەکانە بە گشتی، بووەتە کاری ڕۆژانەمان. مابەقی ئیش و کارەکان دەستگر و کاتکوژن. تەنیا هەوڵی ئەوەمانە لەو چەند ڕۆژەی داهاتوودا لە لالی و لە هەوارەکە، سەبارەت بە کێش و یەکە و سەنگ و سووکی لەنێو ئێلاتیدا پرسیار بکەین و سیایی بگرین. ئەو کردارانەی لەنێو ئێلاتیدا جێبەجێ دەبێ، هێندە یەکمیزانە ئەگەر بڕیار وابێ هەموو ڕۆژێك بیاننووسینەوە، یەك شێواز و یەك مەبەستن. هەر بۆیە وازمان هێنا لە نووسین و تۆمارکردنیان.

### ٢٨ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

ئەمڕۆ سەبارەت بە کۆکردنەوەی ماڵیات لەنێو ئێلاتیاندا بە دەستووری خانەکان، بۆمان گرینگ بوو. لە دوو ناوچەی موڵکی ئەم عەشیرەتەدا بە ناوی «للر» و «کوتەك» و ڕەدەکوتکی، ئەمەیان بەشی چوارلەنگی مەحموود ساڵەیە. لە دەورەی خانەکاندا، وەختێ ئێل لەو ناوچەیە دەڕوات، پیرێژنێك دەمێنێتەوە بۆ ئاگەداریکردن لە باخەکە و نێرەکەرێك بۆ ئاوهێنان و بارهەڵگرتن. خانەکان لەو گوێرێژە و لە نەنەپیرە بۆ هەر یەکیان لە ساڵدا مەبلەغی دە قڕانیان سەندووە، بە ناوی «سەرانە»، دەزانین کە سەرانە وەبەر ئاژەڵی نێر ناکەوێ و لێرەدا خان و دەسەڵاتداران لە نێرەکەر و پیرەژن خۆش نەبوون. ئەمڕۆکەش باس باسی وشکەساڵی و بێ بارانییە، خەڵکەکەش بەتەمان

بووکەبارانە ساز بکەن. بە دابی کوردەواری کەسێك دەکەنە کۆستە و بە دوو کڵاوی لووڕی دوو گوێچکەی بۆ چێ دەکەن و ڕیش و پەشمی بۆ ساز دەکەن، زەنگوڵەی دەمل دەکەن و شڕوشیتاڵی دەکەنە بەر. شل و شەویق بە دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا دادەبەزێ و هەڵدەبەزێ، خەڵك بە چەپڵەڕێزان بە دەوریدا دێن و پارەی دەدەنێ. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی باران بباری! بەو ڕێوڕەسمە دەڵێن «هەڵهەڵە کۆسە».

## ٢٩ی خەزەڵوەری ١٣٥٢

لەمڕۆکەوە کاری ئێمە جگە لە نەخشەکانی کۆمەڵناسیی، تۆمارکردنی یەکەی ئەندازەگرتنە. تا ئێستەش زۆرجار لەگەڵ ئەم سیاییگرتنە تێکەڵ بووین، چۆناوچۆن زەوی شەقاو دەکەن و چۆن کووتاڵ گەز دەکەن و دەیپێون، لە سەری لووتیانەوە بە باڵ دەیپێون. ئەوە بستە و ئەمە قولانجە و ئەمەیان ڕبەیە و ئەوەش کێڵەی گەنمە، هەر هەمووی لە دەفتەری جووت و گادا دەنووسین، دەچینە لالی و لەگەڵ سەوداکاران باسی کێشانە و پێوانە دەکەین. جەعفەرقوولی بێکارە و حەز دەکات لەگەڵ ئێمە بێت. بوونی ئەو پیاوە لە بەرژەوەندیی ئێمەدایە و سەر لە کاروباری ئێمە دەردێنێ و دەتوانێ یارمەتیدەرمان بێت. نانی بەیانی دەخۆین و دەچینە لالی. لە یەکەم دووکان لەنگەر دەگرین و سەبارەت بە کێش و کێشانە دەپرسین.

یەکەی کێش بەم شێوەی خوارەوە بوو. ئەمەش لە دەورەی ناسرەدین شاوە تا ئێستە وەك خۆی ماوەتەوە و نەگۆڕاوە. سەرەتا دەچینە سەر کێشی کۆن، دواتر بە سیستەمی ئەمڕۆ ژمێرەی دەکەین بە کیلۆ و گەرەم، بەڵام ئێستەش کەلوپەلەکە هەر بە ناوە کۆنەکەی ناو دێنن کە بووەتە ناوێکی خۆماڵی. مامە پیرەی دووکانداری گەتوەندی دەیگوت: هەریەك لە قڕانەکانی ناسرەدین شا یەك مسقاڵ کێشی هەیە، لە وەختی حیسابکردنی پووڵدا ناوی ئەو قڕان بوو، لە کاتی بەراوەردکردنی کەلوپەلدا ناوی ئەو مسقاڵ و کێشانەی ئێمە حیسابی دەکەین بە پێی ئەوە بەدەستی دەهێنین.

پەی نار = ٢٠ مسقاڵ
دەنار = ٤٠ مسقاڵ

بیست = ٨٠ مسقاڵ

پەنجا= ١٦٠ مسقاڵ

سەد دەرەم= ٣٢٠ مسقاڵ

نیمەن = ٦٤٠ مسقاڵ

یەمەن= ١٢٨٠ مسقاڵ

بار = ١٥ مەن لە زۆزان

بار = ١٢ مەن لە گەرمێن

نیوە بار = ٧/٥ مەن لە زۆزان

نیوەی نیوە بار= ٦ مەن لە گەرمێن

خەڵوار= ٥٠ لە زۆزان

خەڵوار= ٤٠ مەن لە گەرمێن

هەڵبەت ئەمەشمان لە بیرە، گۆڕانی کێشی کۆن بۆ سەر کێشی نوێ، مەنێکی زۆزان ٦ کیلۆیە و مەنێکی گەرمێن ٧ کیلۆ.

بۆ کێشی وەزن سووک «نۆک»یان بە کار هێناوە، مسقاڵێك بەرانبەر بووە بە ٢٤ نۆك. بەختیارییەکان بۆ گەزکردن ئەگەر پێوەرێکیان لەبەر دەستدا نەبێ، بەم شێوەی خوارەوە گەز و پێوانە بە کار دێنن:

گرێ = مەوداکانی پەنجەی دەست.

پەنجە = پێنج قامك بە پانی.

باست= بست

نیو گەز= لە ئەنیشك تا قامکە درێژەی دەست.

یە کەللە= باڵای پیاوێکی مامناوەندی

فرسەخ = دەمژمێرێك پیاسەکردنی ئاسایی

مەزڵ = سێ فرسەخ پیاسەکردنی ئاسایی

مەنزڵ = ٥ فرسەخ پیاسەکردنی ئاسایی

چارەك = یەك لە چوار بەشی گەزێك (قولانج)

یەك پێ = قامکە گەورەی لاق تا پاژنەی پێ

بۆ گەزکردنی زەوی و زاری کێڵگە لە گەرمێن بەم شێوەی خوارەوە پێوەر هەیە:
یەك پێ = بەرامەبەر بە ١٠ مەن زەوی کێڵگە
نیوگا = ٢٠ مەن زەوی کێڵگە
یەك گا = ٤٠ مەن زەوی کێڵگە
گاسنێك ٨٠ مەن زەوی کێڵگە

هەڵبەت مەن، کێڵگەیەکە یەك مەن تۆوی پێوە دەکەن. لە کوێستان بە هۆی ئەوەی کێڵگەکان زۆرتر بەراون، دانگ بە کار دەهێنن. یەکەی تەواو دەبێتە شەش دانگ، هەر دانگێك بەرانبەر بە ١٢ دەنك، دەنك بەرانبەرە بە ١٦ جۆ یان شەعیر، ئەوەش بەرانبەرە بە ٧٢ دەنك و ٩٦ شەعیر.

وەختێ دروێنە تەواو بوو، کلۆشەکە گێرە دەکەن، دوای شەن و کەو خەرمانی سوور بە کیلە دەپێون، کیلە مەنێکی تەواوە. جگە لە کیلە پێوانەیەکی ستانداریان نییە. ڕەنگە بۆ گرتنەوەی مەنێك دەفر بە کار بێنن. یەکەیەك هەیە بەناوی «موست» وەك پەیمانە کەڵکی لێوەر دەگرن. وادیارە ١٦ مەن بەرانبەرە بە یەك موست. ئەگەر پڕ بە مستێکی قوچاو گەنم هەڵبگرن دەڵێن بە ئەندازەی یەك «گێرە مست» هەڵمانگرتووە. لاوێچێك هەڵبگرن دەڵێن «تەلاپە»یەکمان هەڵگرتووە. ئەگەر شتێکیان پێ نەبێ بۆ پەیمانەکردن، بە کڵاوی سەریان کاری پەیمانەکردن جێبەجێ دەکەن. ئەم پێوانەیە لە مێشکی خۆیاندا ڕادەگرن و لە جێی خۆی بە کیلەیەك دەیپێونەوە. ئەگەر بیانەوێ مێگەلێك بژمێرن، ڕانەکە بەسەر چەند دەستەی ٥٠ سەریدا بەش دەکەن و هەر پەنجایەکیش پێی دەڵێن «یەك مەڕ» هەڵبەت هەر شتێك بژمێرن دەڵێن، ئەوندە مەڕ. وەك ١٠٠ مەڕ گوێز و... وەختێ بە دوو کەس مەڕێکیان هەیە، یەکەی تایبەتیان هەیە بۆ دابەشکردنی جەستەی ئاژەڵەکە. ئەمەش پێی دەڵێن «هەست» لەشی مەڕێك بە ١٠ هەست دابەش دەکەن. هەر پەلێکی ئاژەڵ بە دوو «هەست» حیساب دەکەن. چوارپەلی مەڕێك بە گشتیی دەبێتە هەشت «هەست». سەری ئاژەڵێك بە یەك هەست دەژمێرن، دەبێتە ٩ هەست و لەشی ئاژەڵەکەش دێتە سەری و بە گشتیی دەبێتە ١٠ هەست. لێرەدا ژمێرەکە دەبێتە «٤ هەست» بۆ کەسێك و کەسی دووەم «٢ هەست»ی وەبەر دەکەوێ و یەکی دیکەش «٤ هەست». فێنکی بەیانی لە پێخەفی خەو هاتینە دەرێ، سەروپێیەکمان خوارد و لە عەشیرەتی جەعفەرقوولی ماڵئاواییمان کرد و خۆمان گەیاندە لالی و خواحافیزیکردن لە دۆست و برادەران.

نانی نیوەڕۆ لە لالی میوانین. ڕوخسەتی ڕۆیشتنمان نادەنێ، هەرچۆنێك بوو دوای نیوەڕۆ خۆمان گەیاندە مەسجد سلێمان. لە مەسجد سلێمان شەو لە میوانخانەکە دەمێنینەوە. پیاسەیەك بەنێو شاردا دەکەین و ماڵئاوایی لە دۆستان دەخوازین.

## ١ی سەرماوەزی ١٣٥٢

بەرەو کرماشان وەڕێ دەکەوین، شەو دەگەینە شاری گەورەی کوردستان. شاناز لە ماڵی بابی چاوەڕێی دیگارە. دوو ڕۆژ لە کرماشان دەمێنینەوە، منیش ئەم هەلە دەقۆزمەوە و بە کەڵکوەرگرتن لە (فیش)ی سەفەر کە تەواوکەری کارێکی ڕێکوپێکە لەسەر خوێندنەوەی وتاری یەکەی ئەندازەگرتن لەنێو عەشیرەتی بەختیاریدا کۆکردنەوە و دابەشکردن و سیایی تەواوی فاکتەر و پسووڵەکانی دەڤەری بەختیاریی و کۆکردنەوەی گشتیی لە کتێبێکدا.

تەوەرەی باسەکانی ئەم کتێبە سەرجەمی ئێل و عەشیرەتی بەختیاریی لە خۆدەگرێ و باس لە جوگرافیا و کەوشەن و ژینگە و ژین و ژیاری و شارستانییەتی عەشیرەتی بەختیاریی دەکات بە گشتی. چۆنییەتی گوزەران و دەسەڵاتدارێتیی خان و کەلانتەر و سەرۆك هۆز و کوێخاکان.

ئەم کتێبە بە یارمەتیی ئەسغەر کەریمی نووسراوە لەسەر سەفەرەکانی- ژان پییەر دیگار- کۆمەڵناسیی فەرەنسایی. ڕێنوێنیکاران کە وەك چاوساخێك ئەرکی خزمەتکردنیان لە ئەستۆ گرتووە بۆ ئەم سەفەرنامەیە، ئەم کەسانەی خوارەوە بوون:

**جەعفەرقوولی ڕۆستەمی**

**محەمەد پەرویزی**

**فەرامەرز مەحموودی**

## فەرهەنگۆك:

ئاشێڕ: ئاشەوان
ئەسپەردەکردن: مردوو ناشتن
ئیختیار: پیر، بەساڵاچوو
ئێرەیی: بەخیلی، چاوچنۆکی
ئەرجوو: تکا و پاڕانەوە، خواهیشت
ئەستوون: ئەستووندەکی ڕەشماڵ

ب
باوێشك: دەمکردنەوە بە نیشانەی خەوهاتن
بەرهەڵبێنە: بەرکۆشی ئافرەتان لە کاتی کارکردندا
بەیتار: بەیتاڵ، دکتۆری ئاژەڵان
بی بی: نازناوی سەرەژنانی ئێلی بەختیاریی، یای، یای ناز، یای خەزاڵ
پ
پاشمەرگە: ئەو منداڵەی دوای مردنی بابی دێتە دنیا
پەموو: گوڵی لۆکە، لۆکە
پەیژە: نیردیوان
پرینگانەوە: نەکشانەوە لە شەڕدا
پخ: وشەی ترساندن
پێمل: ڕازیبوون،
پەچە: جێخەوی ڕان لە دەر و دەشت
پێنووس: قەڵەم
ت

تات: بەردەنوێژ

تەسالحە: مەسلەتکردن

تمتمان: زەوی ڕەق، تەقتەقان

تێنووس: کاغەز، دەفتەر

ج

چ

چەرمگ: سپی، چەرموو

چڕ: دارستانی چڕ، شاخی چڕ

چێو: داردەست، هەرچی لە دار ساز بکرێت

چیخ: تەیمانی شووڵ

خ

خاپینۆك: هەڵخەڵەتێن، دەستبڕ

خەنیم: دوژمن

خەساراو: ئەو ئاوەی دوای ئاژینبوون لە بەریان دەردەچێ

د

دەرکەماڵ: خزمەتچی سادات لە خانەقا و نزرگەدا

دیلمانج: وەرگێڕی زارەکیی

دارو لك: دار+ لك، جۆرێك یاری لە دەڤەری بەختیاری

دەم تەزیو: دەمسڕ، نەدوێن

دەمارەکۆڵ: دووپشك

دێمێ: هەڕەمەکی

دڕ: بۆ بەژدار بەکار دێت، سەگی دڕ

دیان تەلا: ددان ئاڵتوون

ڕ

ڕووبینی: مەرایی

ڕەوە: ڕەوکە، ڕەوکەی ئەسپ و هێستر

ڕنە: دەستکەنەی نۆك و نیسك

ڕەبەن: سەڵت، بێ ژن

ڕەتاندن: غاردانی یەك سم

ز

زات: ورە، غیرەت

زایەبوون: خەساربوون

زەوتبوون: ئارامگرتن، هەدادان

زەبتکردن: تەسجیلکردن، تۆمارکردن

زەندۆڵ: ڕەهۆڵ

زیمە: بەرعۆدە

زمهەڕ: ئەو ئاردەی بۆ زستان لە کەندووی دەکەن

ژ

س

سەلار: کەیبانووی ماڵ، سەرەژن

سەبیلە: مۆدنەی لە قوڕسازکراو بۆ تووتنکێشان

سەیوان: کەپر، سێبەر

سێپەك: ئەو دارەی لە کاتی مەشکە ژەندندا مەشکەی پێدا هەڵدەواسن

سپای دانیش: مامۆستای وانەبێژ کە بە جێی سەربازی لە شار و دێ وانە دەڵێتەوە

ش

شەربە: پەرداخ، ئاوخۆری

ع

عاملاندن: فێرکردن

عەلاحیدە: تایبەت

ف

ڤ

ق

قاپووت: کەپەنکی شوان

قاوکردن: بانگکردن

قسن: شەخس

قەشقایی: هۆزێکن لە ئێران

ك

کارەوان: شوانی کارژیلە، بەرخەوان

کەرکەمەڕ: مێگەلە مەڕ

کۆشکەڵان: قەڵاخە دەوە و تەپاڵە

کۆل: ئاوخۆری مەڕ و ماڵات

کۆز: ژووری بەرخ و کار

کولێن: قوژبنی چادر بۆ ڕسق تێداهەڵگرتن

کەپۆ: لووت، دڤن

کەشە: نۆبە، نۆرە

گ

گالۆك: گۆپاڵ، دارده‌ست

گۆرد: شه‌مچه‌، شقارته‌

گیوه‌چی: كلاشچن

ل

لاپره‌سه‌ن: خۆهه‌ڵقوتێن، فزوول

م

مامر: مریشك

مسه‌با: سه‌برگرتن

محه‌نده‌ك: ئه‌سپی ڕه‌سه‌ن

مۆرمۆركردن: بڕینه‌وه‌ی كۆته‌ره‌دار بۆ سووتاندن

مه‌رزه‌م: ڕازی

ن

نامیه‌: ناودار

نفووس: ژماره‌ی خه‌ڵك

و

وایلۆك: شیوه‌ن و گریان، لاواندنه‌وه‌ی مردوو

وێرغه‌: ڕه‌وتی ولاخی سواری

هێ

هۆڕ: جه‌واڵی زه‌ل

هۆرپه‌: خوری هه‌ڵپچراو